واریس دیریە

# گوڵێک لە بیابانی ئەفریقا




## ژیانێکی سەرئاسای کۆچەرێکی بیابانی

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: نوری کەریم

## یاداشتێکی نووسەر

'گوڵی بیابان' بەسەرهاتێکی ڕاستەقینەی ژیانی واریس دیریەیە و هەموو ڕووداوەکانی ڕاستین، بەپێی یادەوەری واریس خۆیەوە نووسراوە. هەموو ئەو کەسانەی کە لەم بەسەرهاتەدا ناویان براوە، بوونیان هەیە و بۆ هەندێکیان نازناو بەکارهێنراوە بۆ پاراستنی کەسایەتییان.




منداڵ و ئافرەت دوو خەمی گەورەی ڕێکخراوی فریاکەوتنی میللی (PAO ) بوون لە ماوەی سێ ساڵی رابردوو کە لەکۆمەلگایی کوردستانیمان وەکو هەموو کۆمەلگاکانی تری دونیا دوو بونەوەری تەواو زوڵم لێکراون دووجاری بەدەیان پێشێلکاری دەبنەوە کە پێچەوانەی تەواوی بەها مرۆیەکانە و پێچەوانەی ڕێکەوتنامە نێودەولەتیەکانن بە تایبەت جاری جیهانی مافەکانی منداڵان و ڕێکەوتنامەی (CEDAW) .

ڕێکخراوی (PAO) ڕێکخراوێکی ناحکومی ناوخۆیی سەربەخۆیە پرۆژەی جیاجیای جێبەجێ کردوە, بەتایبەت بۆ منداڵان و ئافرەتان کە بەپێی پلانی ستراتیژی دوو سودمەندی سەرکی کارو چالاکیەکانی ئەم ڕێکخراوە بوون , یەکێك لە پرۆژەکانی سەنتەری سەرچاوەکانە بۆ ڕێکخراوە ناحکومیەکان و پرۆژەکە لەلایەن ڕێکخراوی منداڵ پارێزی بریتانی (SC-UK) هاوکاری و پشتگیری لێ کراوە جەندین خزمەت پێشکەش دەکات کەبەشێکی خزمەتەکەی کتێبخانەیەکی بچکۆلانەیە چەندین سەرچاوەی تایبەت بە منداڵان و ژنانی تیادایە بۆ ئەوەی خزمەت بە لایەنێکی پرۆسەی پشتگیری لە داواکانی ئافرەت و منداڵان بکات.

لە ماوەی بەردەوامێتی کاری ئەم سەنتەرە برای ئەندازیار کاکە سامی سەلیم پێشنیاری چاپکردنی کتێبی (گولێك لە بیابانی ئەفریقا) بۆ نووسەری بەناوبانگ واریس دیریە کە لەسەر دەستی برای وەرگێر کاکە نوری کەریم کە وەکو کارێکی خۆبەخش و بەبێ بەرامبەر ئەم بەرهەمەی وەرگێراوە چاپ بکەین و کتێبخانەی کوردستانی بە بەرهەمێکی تازە دەوڵەمەند بکرێت,بەرهەمێك ئەوەندە نزیك کە رۆژانە دەیان منداڵ و ئافرەتی ئەم ولاتەی ئێمە رووبەرووی هەمان ئەم روداوانە دەبنەوە کە لەکتێبەکە داهاتووە و روداوی راستی ژیانی نوسەر خۆیەتی .

دوای خوێندنەوەی کتێبەکە بە شانازیەوە بریار درا کە ئەرکی چاپکردنی لە ئەستۆ بگرین و ئەم کتێبەش بچێتە پاڵ بلاوکراوەکانی تر کە ڕێکخراوی (PAO) چاپی کردوون ,هەروەها لەگەڵ برای وەرگێر رێك کەوتین ئەم جۆرە چالاکیانە زیاتر بکەین بەرهەمی تریش وەربگێرێت و بەچاپی بکەینین .

لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم بەرهەمە بەهیوای کاتێکی خۆش و بەسوود.

هۆگر چەتۆ

ڕێکخەری پرۆگرام

PAO

## سوپاس و پێزانین

بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە لە زمانی ئینگلیزیەوە و بە چاپ گەیاندنی، ئەم بەڕێزانە کاتێکی زۆری خۆیان تەرخانکرد بۆ بەسەرئەنجام گەیاندنی. چیمەن کەریم بۆ پیاداچوونەوەی وەرگێرانەکە لەگەڵ وەرگێراوی فنلەندی کتێبەکە. جەمال شەریف بۆ خوێندنەوەی وەرگێڕانەکە و ڕاستکردنەوەی هەڵەی نووسین و ڕێزمانی. هەوڵ و کۆششی ئەم بەڕێزانە مایەی سوپاس و پێزانینە.

وەرگێڕ

# ناوەرۆك

بەشی یەکەم: هەڵهاتن...............................

بەشی دووهەم: گەورەبوونم لەگەڵ ئاژەڵدا..............

بەشی سێهەم: ژیانێکی کۆچەری.......................

بەشی چوارهەم: بوون بە ژن........................

بەشی پێنجهەم: قەباڵەی مارەیی....................

بەشی شەشهەم: لە ڕێگادا.........................

بەشی حەوتهەم: مەقادیشۆ.......................

بەشی هەشتهەم: بەرەو لەندەن...............

بەشی نۆهەم: کارەکەرەکە......................

بەشی دەهەم: لە کۆتاییدا سەرفەرازی.......

بەشی یانزەهەم: مۆدێل.........................
بەشی دوانزەهەم: پزیشکەکان...............
بەشی سیانزەهەم: گرفتی پاسپۆرت........
بەشی چواردەهەم: هەنگاوێکی گەورە..........
بەشی پانزەهەم: گەڕانەوە بۆ سۆماڵ............
بەشی شانزەهەم: سێوێکی گەورە.................
بەشی حەڤدەهەم: باڵوێز..........................
بەشی هەژدەهەم: خولیایماڵەوە...............
پەیوەست بن بە کەمپینی دژی خەتەنەکردنی کچانەوە.....
سوپاس و پێزانین..............................
لە کتێبەکانی وەرگێڕ...........................

## بەشی یەکەم
## هەڵهاتن

دەنگێکی هێـواش خەبـەری کردمـەوە، کـە چـاوم کـردەوە، چـاوم بـە دەموچـاوی شێرێك کەوت. چ خەبەرکردنەوەیـەکی ترسـناك. چـاوم زەقکـردەوە - زۆر زەقـتر - تـا هەموو گیانلەبەرەکە لەخۆ بگرێت. هەوڵمدا هەڵسمە سـەرپێ، بـەڵام چـەند ڕۆژ بـوو نـانم نـەخواردبوو، لەبەرئـەوە قاچـە بێهێزەکـانم لـەرزی و لـە ژێرمـدا لـوول بـوون. هەرەسم هێنا. پشتم دا بەو درەختەوە کە لـە ژێریـدا وچـانم دابـوو، لـە تـاو هـەتاوی نیوەڕوانی بیابانی ئەفریقا، کە زۆر بێبەزەییە، پەنام بۆ بردبوو. بـە هێواشـی سـەرم برد بۆ دواوە و چاوم داخست، هەستم کرد توێکڵی ڕەقی دارەکە لە سەرم دەچەقێت. شێرەکە ئەوەنـدە نزیکبوو دەم توانی لەو هەوا گەرمـەدا بـۆنی بۆگـەنی دەمـی بکـەم. سەرم بەرزکردەوە: "ئەی هاوار، ئەمە کۆتایی منە. تکـات لێدەکـەم هـەر ئێـستا بمبـە بۆ خۆت."

سەفەری دوور و درێژی بیابانم بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت. نە پەنایەکم هـەبوو، نـە چەکێك. هەتا هێزی ڕاکردنم نەبوو. هەتا لە باشترین حاڵەتدا، نەم دەتوانی لـە شـێر خێراتـر سـەرکەوم بەسـەر درەختـدا، لەبەرئـەوەی شـێر وەك پـشیلە چـڕنووکێکی بەهێزی هەیـە و دارەوانێکـی لێهـاتووە. هـەر لـە ناوقـەدی دارەکـەدا - زرم - پـەلامارم دەدا و ناهێڵێت دەم بدەم بە یەکدا. بەبێ هێچ ترسـێك دووبـارە چـاوم کـردەوە و بـە شێرەکەم ووت: "لە خزمەتی تۆ دام، وەرە بمبە بۆ خۆت."

شێرێکی مێینەی جوان بوو، بە یاڵێکی ئـاڵتونی و کلکێکـی درێـژەوە کـە بایـدەدا و مێش و مەگەزی پێ دووردەخستەوە. پێنـج شەشساڵێك تەمەنی بوو، گەنـج و لـەش ساغ بوو. دەم زانی دەسـتبەجێ دەتوانێت لەناوم بەرێت، بۆ خـۆی پاشا بـوو. هـەموو

ژیانم هەر تەماشای ئەو لەپی قاچ و دەستانەیم کردووە، کە چۆن پەلاماری ئاسك و زێبرا دەدا، کە قورسایی هەر یەکەیان سەد پاوەند لە من زیاترە.

شێرەکە لە من وردەبووەوە و چاوە هەنگوینەکانی ترووکاند. منیش چاوە قاوەییەکانم تێبڕی. سەیرێکی دووری کرد. "خێراکە، وەرە بمخۆ." دیسانەوە تەماشای کردمەوە، پاشان ڕووی وەرگێڕا. دەم و لێوی خۆی لێستەوە و بە چیچکانەوە دانیشت. پاشان هەستا و هەنگاوی نا بۆ دواوە و بە خەمزە و نازەوە لێم دوورکەوتەوە. لە کۆتاییدا، ڕووی وەرگێڕا و دوورکەوتەوە، بەبێ هیچ دوودڵییەك بڕیاری دابوو، ئەوە ناهێنێ بمخوا،چونکە گۆشتێکی وەهام نەبوو بەسەر ئێسقانەوە. بە ناو بیاباندا لەسەرخۆ ڕۆیشت تا فەروە بۆرە زەردباوەکەی لە لمەکەدا نوقومبوو.

کاتێك زانیم نیازی نییە بمکوژێ، هیچ ئاهێکی ئاسودەییم نەکێشا چونکە هیچ ترسێکم لێی نەبوو. ئامادەی مردن بووم. بەڵام خوا کە هەمیشە باشترین یاوەری من بوو، پلانێکی تری بۆ کێشابووم، کە هۆیەك بوو منی بە زیندوویی هێشتەوە. ووتم، "ئەبێت ئەمە چی بێت؟ بمبە - ڕێنوێنیم بکە،" کۆششم کرد، هەستمە سەر پێی خۆم.

ئەم سەفەرە دێوەزمەیەم لەبەرخۆ نا چونکە لەدەست باوکم هەڵهاتبووم. ئەوسا تەمەنم سیانزە ساڵ بوو و لەگەڵ خێزانەکەماندا دەژیام، کە سەر بە خێڵێکی کۆچەری بوو لە بیابانی سۆماڵ، کاتێك باوکم ڕایگەیاند کە بەشووی داوم بە پیاوێکی پیر. دەم زانی دەبێت زوو بکەومە خۆ یان ڕۆژێك لەپڕ مێردی تازە دێت و دەم بات، دایکمم ئاگادارکردەوە کە دەمەوێت هەڵبێم. پلانم ئەوە بوو کە پوورم، خوشکی دایکم دەدۆزمەوە لە مەقادیشۆی پایتەختی سۆماڵ. بێگومان هەرگیز مەقادیشۆم نەبینیبوو - یان هەر شارێکی تر کە گرنگ بێت. هەتا پووریشم

لەوەوپێش نەبینیبوو. بەلام بە خۆش خەیاڵی منداڵانەوە هەستم دەکرد هەرچی چۆنێك بێت جادوناسا کار دەچێتە پێشەوە.

هێشتا باوکم و باقی خێزانەکەمان لە شیرین خەودا بوون، کاتێك دایکم منی خەبەرکردەوە و پێی وتم، "هەر ئێستا برۆ." سەیرێکی دەوروپشتی خۆمم کرد بۆ شتێك بیرفێنم و لەگەڵ خۆم بیبەم، نە بتڵێك ئاو هەبوو، نە گۆزە شیرێك، نە سەبەتەیەك خواردن. هەروا پێپەتی و تەنها پارچە قوماشێك بەدەوری لەشمدا، هەڵهاتمە ناو شەوەزەنگی بیابانەوە.

ئەم دەزانی ڕوو لە کوێ بکەم بەرەو مەقادیشۆ، تەنها ڕام دەکرد. سەرەتا بەهێواشی، چونکە ئەم دەتوانی بەرپێی خۆم ببینم، بەم لا و ئەو لادا دەکەوتم، پێم لە ڕەگی دار هەڵدەنووت. لەکۆتاییدا بڕیارم دا دانیشم چونکە مار لە هەموو شوێنێکی ئەفریقادا هەبوو و منیش زۆر لە مار دەترسام. پێم دەنا بە هەر ڕەگێکدا وام دەزانی پشتی ماری کوبرایە. دانیشتم و کەوتمە تەماشاکردنی ئاسمان کە وردە وردە ڕووناك دەبۆوە. هەتا پێش ڕۆژهەڵهاتن وەك ئاسك بۆی دەرچووم. ڕام کرد و ڕام کرد بۆ چەند کاژێرێك ڕام کرد.

لە نیوەڕۆدا چووبوومە قولایی بیابانی سوورەوە و نوقمی خەیاڵاتی خۆم بووبووم. ئەرێ بۆ کوێ دەچم؟ لەخۆم کەوتمە گومانەوە. هەتا ئەم دەزانی ڕووم لە کوێ کردووە. بیابان هەر درێژ دەبۆوە و ئەوسەری دیار نەبوو، جاروبار نەبێت ئاکاسیا یان دەوەنی دڕکاوی تیایدا دەردەکەوت، میلا و میلم لێدیار بوو. برسی، تینوو و هیلاك، لە خێرایی خۆمم کەمکردەوە و کەوتمە ڕۆیشتن. پەست و داڕماوو بە هێواشی دەڕۆیشتم، لە خۆم کەوتمە پرسیار، ژیانی داهاتووم بۆ کوێم دەبات. پاشان چیی ڕوودەدات؟

لەکاتێکدا چووبوومە تاوتوێکردنی ئەم پرسیارانەوە، وام بە خەیاڵدا هات گوێم لە دەنگێکە: "و - ا - ر - ی - س... و - ا - ر - ی - س..." باوکم بوو بانگی دەکردم!

بەدەوری خۆمدا سوڕامەوە بەدوایدا، بەڵام نەمبینی. لەوانەیە لەخەیاڵی خۆمدا بێت، وای بۆچووم. "و - ا - ر - ی - س... و - ا - ر - ی - س..." دەنگەکە لە دەوری من دەنگی دایەوە. دەنگێکی پاڕانەوە بوو، بەڵام بۆ من ترسناك بوو. ئەگەر منی بگرتایە، بێگومان دەیبردمەوە و دەیدام بە پیاوەکە، لەوانەش بوو لێشی بدامایە. من شتی ترم نەدەبیست. باوکم بوو و لێم نزیك دەبۆوە. ئێستا نزیکتر، چەند لە توانامدا بوو خێرا بۆی دەرچووم. سەرەڕای ئەوەی چەند کاژێر لە پێش باوکمەوە کەوتبوومە ڕێ، بەڵام ئەو منی گرتبۆوە. دوایی بە خۆمم زانی کە باوکم جێگای پێمی لە لمەکەدا هەڵگرتووە.

ئەوسا پێم وابوو باوکم لە توانایدا نییە من بگرێ، چونکو من گەنج و خێرام. بە ئەقڵی منداڵانەم، باوکم پیاوێکی پیر بوو. ئێستا بە پێکەنینەوە وەبیر خۆمی دەهێنمەوە کە ئەو کاتە، تەمەنی لە سییەکاندا بوو. جێی گومان نەبوو هەموومان چست و چالاك بووین، چونکە بۆ هەموو شوێنێك ڕامان دەکرد، ماشێنمان نەبوو، هیچ جۆرە ئامرازێکی گشتی هاتووچۆمان نەبوو. هەردەم ڕاکە ڕاکەمان بوو، بەدوای ئاژەڵەوە، بە دوای ئاوەوە، خەریکی پێشبڕکێ بووین لەگەڵ هاتنی تاریکی بۆئەوەی بە سەلامەتی بگەینە ماڵەوە.

پاش ماوەیەك ئیتر گوێم لە بانگکردنی باوکم نەما، لەبەرئەوە هێواشم کردەوە و کەوتمە خێرا ڕۆیشتن. ئەگەر لە جوڵاندندابم، باوکم هیلاك دەبێت و دەگەڕێتەوە ماڵەوە، وام لێکدەدایەوە. لەپڕ ئاوڕم دایەوە ڕوو بە ئاسۆ، باوکمم بینی بەسەر گردێکەوە بەرەو من دەهات. ئەویش منی بینی. تۆقیوانە کەوتمە ڕاکردن. زیاتر تینم دایە خۆ. وەك ئەوەی بەسەر شەپۆلی لمەوە بین، من بەسەر گردا سەر دەکەوتم و ئەو لەپشتمەوە بەسەر یەکێکی تر دەخزایە خوارەوە. بۆ چەند کاژێرێك ئەمە بەردەوام بوو، تا لە کۆتاییدا سەرنجم دا، ماوەیەك تێپەڕی بوو باوکم نەبینیبوو. ئیتر بانگی نەدەکردم.

دڵم تەپە تەپی بوو. لە كۆتاییدا وەستام و لە پشت دەوەنێكەوە خۆم شاردەوە و تەماشای دەوروپشتمم كرد. هیچ شتێك نەبوو. زیاتر گوێم ڕاگرت. دەنگ نەبوو. كاتێك بە بەردێكی تەخت گەیشتم، ڕاوەستام بۆ وچاندان. بەڵام كەڵكم لە هەڵەی دوێنێ شەوم وەرگرت و كە هەستامەوە بە سەر بەرد و ئەو شوێنانەی ڕەق بوو ڕام كرد و پاشان چەند جار ئاراستەی خۆم گۆڕی تا باوكم نەتوانێت شوێن پێم هەلگرێت.

وام لێكدایەوە كە باوكم بەرەو ماڵ گەڕاوەتەوە چونكە ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەڕۆیشت. هەرچەند هیچ كات پێش تاریك بوون نەدەگەیشتە ماڵەوە. دەبوو بە تاریكی ڕاكا و گوێبیستی دەنگە دەنگی شەوانەی خێزانەكەمان بێت، بە قیژە و پێكەنینی منداڵان، باعە و باڕەی مەڕ و بزن ئاراستەی خۆی بكات. لە بیاباندا، با دەنگ لەگەڵ خۆی دەبات بۆ ماوەیەكی دوور و درێژ. لەبەرئەوە دەنگ فەنەری ئێمە بوو، كاتێك ون دەبووین لە شەودا.

پاش ئەوەی بەسەر بەردەكاندا ڕۆیشتم، ئاراستەی خۆمم گۆڕی. ئیتر لەڕاستیدا بۆم گرنگ نەبوو چ ئاراستەیەكم گرتووە، چونكە هیچ زانیارییەكم نەبوو لەسەرئەوەی چ ئاراستەیەك بەرەو مەقادیشۆ دەڕوات. هەر ڕام دەكرد تا ڕۆژ ئاوا دەبوو، تاریك دەبوو و تا شەو ئەوەندە تاریك دەبوو كە نەمدەتوانی بەر پێی خۆم ببینم. لەو كاتەدا برسێتی هەراسانی كردبووم، تەنیا شتێك كە بیرم لێدەكردەوە خواردن بوو. قاچم خوێنی لێدەتكا. لەژێر دارێكدا دانیشتم و خەوم لێكەوت.

بەیانی هەتاو دەموچاوی داخكردم و خەبەری كردمەوە. چاوم كردەوە و سەرم هەڵبڕی گەڵای داری جوانی ئكالیپوتس سەری لە ئاسمان توند كردبوو. وورده وورده ڕاستی هەلومەرجی خۆمم بۆدەركەوت. *هاوار بە ماڵم، خۆ من هەر خۆمم، ئێستا چی بكەم؟*

هەستام و دەستم کردەوە بە ڕاکردن، توانیم بۆ چەندین ڕۆژ بەردەوامبم. چەند ڕۆژ بوو، دڵنیا نیم. لەبەر برسێتی، تینوێیەتی، ترس و ئازار ئاگام لە کات نەبوو. کاتی ئێواران کە ئەوەندە تاریك دەبوو نەمدەتوانی بەرپێی خۆم ببینم، ڕادەوەستام و وچانم دەدا. لە نیوەڕواندا، کاتێك گەرمایی ڕۆژ دەگەیشتە ئەو پەڕی، لەژێر درەختێکدا دادەنیشتم و چۆرتێکم دەدا.

لە یەکێك لەو چۆرتانەدا بوو خەوم لێکەوتبوو، کە شێرەکە خەبەریکردمەوە. لەو کاتەدا ئیتر گوێم بە ئازادی خۆم نەدەدا، تەنها دەمویست بگەڕێمەوە ماڵێ بۆ لای دایکم. لە نان و ئاو زیاتر دایکمم دەویست. هەرچەندە بۆ ئێمە ئاسایی بوو بۆ یەك دوو ڕۆژ بێ نان و ئاو بڕۆین، دەمزانی ئیتر لەمە زیاتر ناتوانم گیان بەدەربەرم. زۆر بێهێز بووبووم بە ئاستەم دەمتوانی بجوڵێم و قاچەکانم زۆر قلیشی بردبوو و بریندار بووبوو، کە هەر هەنگاوێکم ئەشکەنجەیەك بوو. لەو کاتەدا کە شێرەکە لە بەردەممدا دانیشتبوو، لە برسا لێوی خۆی دەلێستەوە، من خۆم دابوو بەدەستەوە. پێشوازی کوشتنێکی خێرام لێدەکرد، وەك ڕێگایەك لەو پەرێشانییە ڕزگارم کات.

بەڵام شێرەکە تەماشایەکی ئێسقانی دەرپەڕیوو، ڕوومەتی قوپاو و چاوانی بەقوڵا چوومی کرد و ڕۆیشت. نەمزانی بەزەیی بەم گیانلەبەرە پەرێشانەدا هاتەوە یان بڕیاریکی لۆژیکانە بوو، کە ئەوە ناهێنم بمخوات. یان خوا لەسەر من هەڵی دابێت. بەڵام لەو باوەڕەدا بووم خوا ئەوەندە دڵڕەق نییە، منی هەڵگرتبێت بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تر، دڕندانەتر لە برساندا بمکوژێت. پلانێکی تری لە هەگبەدا هەبوو بۆ من، لەبەرئەوە داوای ڕێنوێنیم لێکرد: "بمبە - ڕێگام نیشان بدە." دەستم بە درەختەکەوە گرت و هەستامە سەر پێ و هانام بۆ برد.

دیسانەوە دەستم کردەوە بە ڕۆیشتن، لە چەند خولەکێکدا گەیشتمە مێرگێك، کە پڕ بوو لە حوشتر. یەکێکیانم بینی، گوانی پڕبوو لە شیر و ڕامکرد بۆ لای. دەمم

پێوەنا، وەك منداڵ شیرەکەم مژی. شوانەکە منی بینی و هاواری لێهەڵسا، "دەرچۆ لەم ناوە، دەڵە سەگی بچکۆلە!" گوێم لە شەقەی قامچییەك بوو. بەڵام من بێچارە بووم و هەروا خەریکی مژین بووم، چەند لە توانای دەمم دابوو خێرا شیرم مژی.

شوانەکە هاواری لێکردم و بۆ لێدانم بەرەو ڕووم گوڕی دایە خۆی. دەیزانی ئەگەر نەمترسێنێت تا دەگاتە لام، کار لە کار دەترازێ، هەموو شیرەکە لەدەست دەچێت. بەڵام من بە ئەندازەی پێویست بەدەستم هێنا، لەبەرئەوە بۆی دەرچووم. دوام کەوت و توانی دوو قامچیم لێبدات پێشئەوەی لێی دوورکەومەوە. بەڵام من خێراتر بووم و ئەوم جێهێشت، لەسەر لمەکە ڕاوەستا و بەو ڕۆژی نیوەڕۆیە کەوتە جنێودان بە من.

وزەم وەرگرت، هێزم تێگەڕا. لەبەرئەوە بەردەوام بوومەوە لەسەر ڕاکردن و ڕامکرد تا گەیشتمە لادێیەك. هەرگیز لەوەوپێش لە شوێنێکی وەهادا نەبووبووم. خانووی ببێت و جادەکانی لە خۆڵی پەستێنراو دروستکرابێت. بە ناوەڕاستی جادەکەدا ڕۆیشتم، وا تێگەیشتبووم کە ئەمە پیادەڕێی منە. بە هێواشی بەناو لادێکەدا ڕێم دەکرد و بەسەرسامییەوە تەماشای شتە نائاشناکانم دەکرد، سەرم بە دەوری خۆمدا بە هەموو لایەکدا بادەدا. ژنێك بەلامدا ڕۆیشت، سەیرێکی قەد و باڵامی کرد، پاشان هاواری لێهەڵسا: " تۆ زۆر کەری، بۆ وا دەزانی تۆ لە کوێیت؟" سەیری چەند کەسێکی کرد کە بەلای جادەکەدا دەڕۆیشتن، هاواری کرد: "خەڵکینە. تەماشای قاچی کەن!" هێمایەکی بۆ قاچە قڵیشاو و برینە خوێن قەدماغە بەستوەکانمی کرد. "ئەی هاوار. دەبێت چ کچە لادێییەکی بچوکی کەر بێت.". هەر ئەم ژنە هاواری لێکردم: "کچە بچکۆلە، ئەگەر دەتەوێ بژی، ئەو جادەیە بەردە. لەم ڕێگایە دوورکەودرەوە!"

هەراسان بووم لەوەی هەموو کەس گوێی لێبوو. تەنها سەری خۆمم داخست، بەڵام بەردەوام بووم بە ناوەڕاستی جادەکەدا ڕۆیشتم چونکە تێنەگەیشتم مەبەستی چی

بوو. زۆری نەبرد لۆریەك هات. دیید! دیید! منیش دەبوو جادەکە بەردەم. وەرگەڕامەوە بۆ سەیری هاتووچۆی ماشێن، کە ئوتۆمبیل و لۆری بەلامدا تێدەپەڕیین دەستم ڕادەکێشا. ناتوانم بڵێم هێمای ڕاوەستاندنم دەکرد، چونکە نەمدەزانی هێمای ڕاوەستان چییە. لەبەرئەوە تەنها لە کەناری جادەکە ڕاوەستام و دەستم درێژ کرد بۆ ئەوەی یەکێکیان ڕاوەستێ. ماشێنێکی کرێن تێپەڕی و خەریك بوو دەستم بەرێت، لەبەرئەوە دەستم بردە دواوە. دیسانەوە دەستم درێژ کردەوە، بەڵام ئەم جارەیان زۆر نا، تۆزێك چوومە نزیك جادەکە و کەوتمەوە ڕۆیشتن. چاوم دەبڕییە ئەو کەسانەی کە ماشێنیان لێدەخوری، لە دڵی خۆمدا دوعام دەکرد بەڵکو یەکێکیان ڕاوەستێ و یارمەتیم بدات.

لە کۆتاییدا پیکاپێك وەستا. ئەوەی ڕوویدا مایەی شانازییم نییە - بەڵام ڕووداوێك بوو، بێجگە لەوەی ڕاستی بڵێم، چی دەتوانم بڵێم؟ تا ئیمڕۆ، هەرکات بیر لەو پیکاپ وەستانە دەکەمەوە، حەز دەکەم باوەڕم بە غەریزەی خۆم بکردایە و هەرگیز سەرنەکوتمایە.

پیکاپەکە باری وردە بەردی بە بارستایی تۆپی تێنس پێبوو، بۆ خانوو دروستکردن. لە پێشەکەیدا دوو پیاو دانیشتبوون، شۆفێرەکە دەرگاکەی کردەوە و بە سۆماڵی وتی، "سەرکەوە، گیانەکەم." هەستم بە زەبونی کرد، ترسم لێنیشت.

"بەرەو مەقادیشۆ دەڕۆم." پێم وت.

"بۆ هەر کوێیەك تۆ بتەوێت، دەتبەم." ئەمەی وت و زەردەخەنەیەك گرتی.

کاتێك زەردەخەنە گرتی، دانە سوورەکانی دەرکەوت، سووری تووتن. بەڵام دەمزانی ئەوەی دانی وا لێکردبوو ڕەنگی تووتن نەبوو، چونکە باوکمم جارێك دیبوو ئەوەی دەجوو. خات بوو، ڕووەکێکی نارکۆتیکییە، پیاوان لە ئەفریقا دەیجون کە وەك کۆکاین وایە. ژنان بۆیان نییە دەستی بۆ بەرن، کە باشتر، ئەمە پیاوان شێت دەکات، گەشکەیان پێدەگرێت، تووڕەیان دەکات و ژیانی هەندێکی لەناوبردووە.

زانیم کەوتومەتە گرفتەوە، بەڵام ڕێگایەکی ترم نەدەبینیەوە، لەبەرئەوە سەرێکم بۆ لەقاند، قایل بوونی خۆمم ڕاگەیاند. شۆفێرەکە پێی وتم سەرکەومە دواوە. ئەمە مایەی ئاسودەییم بوو، بەو خەیاڵەی کە دوورم دەخاتەوە لەو دوو پیاوە. سەرکەوتمە پشتی پیکاپەکە و لە سووچێکدا دانیشتم، هەوڵم دا لە سەر بەردەکان جێگای خۆم خۆشکەم. دنیا تاریك بوو، هەوای بیابان سارد بوو، کە ماشێنەکە کەوتەڕێ سەرمام بوو، لە شوێنێکدا کە با نەیدەگرتەوە پاڵکەوتم.

دواتر کە ئاگادار بوومەوە، ئەو پیاوەی کە لەگەڵ شۆفێرەکەدا بوو، بەرامبەرم لەسەر بەردەکە لەسەر ئەژنۆ دانیشتبوو. تەمەنی لە چلەکاندا بوو، ڕەزا قورس و ناشیرین. قژ بە سەرییەوە نەمابوو. بەڵام هەوڵی دابوو، بە تۆزێك سمێڵ خۆی جوان بکات. دانەکانی کرمۆڵ بوون و هەندێکی کەوتبوون، ئەوانەی مابوەوە بە هۆی خاتەوە ڕەنگی گۆڕابوو بە سوورێکی قێزهێنەر. بەڵام هێشتا بە من زەردەخەنە دەیگرت. لەوانەیە جێگای شانازی بووبێت پیشانی بدا. تا ئەو ڕۆژەی دەمرم هەرگیز دەموچاویم لە بیرناچێتەوە کە بە مۆڕییەوە تەماشای دەکردم.

کاتێك پانتۆڵەکەی داکەند، زانیم قەڵەوە. کێرە ڕەپەکەی هەڵبەز و دابەزی دەکرد کاتێك لاقمی گرت و هەوڵیدا بەزۆر ئاوگەڵم بکاتەوە.

"ئۆی، تکایە، تکایە، نەکەی،" لێی پاڕامەوە. لاقە لەڕەکانم بەدەوری یەکدا ئاڵاند وەك ئەوەی قفڵی بدەم. پەلاماری دام و هەوڵی دا بەزۆر لاقم لەیەکتر بکاتەوە. پاشان کە هەوڵەکەی بەسەرئەنجام نەگەیشت، دەستی کێشایە دواوە و زلەیەکی قایمی لێدام. قیژە و ناڵەیەکم لێبەرز بۆوە، با لەگەڵ خۆی بردی، لەکاتێکدا پیکاپەکە بە خێرایی تاریکی شەوی دەبڕی.

"لاقە حیزەکانت بکەرەوە!" کەوتینە زۆرانبازی لەگەڵ یەکتر، بەهەموو قورسایی خۆیەوە خۆیدا بە سەرمدا، وردە بەردەکان دەچوو بە پشتمدا. دەستی برد بۆ دواوە و زلەیەکی قایمتری لێدام. لە دووهەم زلەدا زانیم دەبێت بەدوای تاکتیکێکی تردا

بگەڕێم، زۆر بەهێز بوو دەرەقەتی نەدەهاتم. پیاوەکە ڕۆشن دەیزانی چیی دەکات، ڕابوردووی هەبوو، گومانی تیادا نەبوو لاقەی بە گەلێك ژن کردبوو. منیش خەریك بوو سوك و ئاسان ببم بە قوربانییەکی تر. لە قولایی دڵمەوە دەمویست بیکوژم، بەلام چەکم پێنەبوو.

لەبەرئەوە خۆم وا نیشان دا، کە منیش دەمەوێت. بە نازەوە وتم، "باشە، باشە. بەلام ڕێگام بدە لەپێشدا میز بکەم." بینیم زیاتر هەستی ورووژا - ئاوا، ئەو کچە بچکۆلەیە ئەو دەویست! - و ڕێگای دام هەڵسام. چوومە سوچێکی ئەوبەری پیکاپەکەوە و خۆم وانیشان دا کە بە چیچکانەوە دادەنیشم و لەو تاریکاییەدا میز دەکەم. ئەمە هەلێکی چەند خولەکی بە من دا بیربکەمەوە کە چی بکەم. کە لە شانۆگەرییە بچکۆلەکەم بوومەوە، من پلانی خومم داڕشتبوو. گەورە ترین بەرد کە توانیم بیدۆزمەوە، بەدەستمەوە گرت، چوومەوە بۆ لای و لە تەنیشتیدا پالکەوتم.

پیاوەکە هاتە سەرم و منیش بەردەکەمم قایم گرت. بە هەموو هێزمەوە دام بە لایەکی سەریدا، دروست لایەك لە ناوچەوانی گرت. بە یەکەم لێدان گێژ بوو. جارێکی تر لێم دا و بینیم کەوت. وەك جەنگاوەرێك، لەپڕ هێزێکی مەزنم تێگەڕا. نەمدەزانی توانایی وام هەیە، بەلام کاتێك یەکێك دەیەوێ هێرشت بکاتەسەر، بتکوژێ، بەهێز دەبیت. نازانی چەند بەهێز دەبی تا ئەو کاتە. هێشتا کەوتبوو جارێکی تر لێم دایەوە و بینیم خوێن لە گوێچکەی هاتە دەرەوە.

هاوڕێکەی کە پیکاپەکەی لێدەخوڕی، لە پەنجەرەی دواوەی هەرچی ڕووی دابوو بینی. دەستی کرد بە هاوار کردن، "چ گۆبەنگێك لە دواوە ڕوودەدا؟" و دەگەڕا بە دوای جێگایەکدا لەناو دەوەنەکاندا ماشێنەکەی ڕاگرێت. دەمزانی ئەگەر بێت و بمگرێت تیادەچم. کاتێك کە خێرایی کەمکردەوە، چوومە دوای بارەکەوە و بەسەر بەردەکانەوە خۆم ڕاگرت، وەك پشیلە بازم دایە خوارەوە. پاشان بۆیدەرچووم.

شۆفێری ماشێنەکە پیاوێکی پیر بوو، لە پیکاپەکەی دەرپەڕیە دەرەوە و بە دەنگێکی شپرزاوی هاواری لێکردم، "هاوڕێکەمت کوشت! وەرە! کوشتت!" بۆ ماوەیەك بەناو دەوەنە بچکۆلەکاندا ڕای کرد بە دوامدا، پاشان وازی هێنا. یان من وا تێگەیشتم.

شۆفێرەکە گەڕایەوە، هەڵیکوتایە سەر ماشێنەکە و پێی نا بە بەنزیندا، بە ماشێن بەناو بیاباندا کەوتە دووم. بەهۆی تیشکی لایتی ماشێنەکەیەوە دەوروپشتی خۆمم دەبینی، لە پشتمەوە دەنگی ماشێنەکە دەهاتە گوێم. چەند لە توانامدا بوو خێراییم دایە خۆم، بەڵام گومانی تیادا نەبوو ماشێنەکە منی دەگرتەوە. زیکزاك ڕام کرد و لە تاریکاییەکەدا دەوورم دایەوە. ئیتر نەیتوانی بمبینێت، لە کۆتاییدا کۆڵیدا و گەڕایەوە سەر جادەکە.

وەك ئەوەی ڕاوکەرم بە دواوەوە بێت بەناو بیاباندا تێم تەقاند، سەرەتا بە ناو بیاباندا، پاشان جەنگەڵ و دیسان بیابان، بەبێئەوەی بزانم لە کوێم. ڕۆژ هەڵهات و من هەر ڕام دەکرد. لەکۆتاییدا هاتمە سەر جادەیەکی تر. هەرچەند ترس هەموو گیانمی داگرتبوو لەوەی چی تر ڕوودەدا، بڕیارم دا جارێکی تر ماشێن ڕاگرم و سەرکەوم، چونکە دەمزانی چەند دووربم لە شۆفێری پیکاپەکە و هاوڕێکەی هێشتا کەمە. ئەوەی دەستدرێژکارەکەم چی بەسەرهات بە لێدانی من، هەرگیز بۆم ڕۆشن نەبووەوە، بەڵام دوا شت ئەوە بوو، بمەوێت جارێکی تر بیانبینمەوە.

ڕاوەستان لە قەراغی جادە لە ڕۆژ هەڵهاتنی بەیانیاندا دەبێت دیمەنێکی جوانی بووبێت. جلەکەی بەرم بووبوو بە پەڕۆ کۆنێکی چڵکن، چەند ڕۆژ بوو بە ناو بیاباندا ڕام کردبوو تەپوتۆز پێست و قژمی سواغ دابوو، باڵ و لاقەکانم لە چڵە دار دەچوون کە دەشێ ڕەشەبایەکی قایم بیپاندا بە یەکتریدا و قاچەکانم وەك ئەوەی تووشی نەخۆشی گەڕی بووبێت، برین دایپۆشی بوون. ماشێنێکی مارسیدس هات، دەستم لێبەرزکردەوە. پیاوێکی جلوبەرگ قەشەنگ بوو، لە کەناری جادەکە لای دا.

خۆم گەیاندێ و لەسەر کورسی چەرمی دانیشتم و واقم ورِما لەو خۆشگوزەرانییە.

"بۆ کوێ دەچیت؟" پیاوەکە پرسیاری لێکردم

"ئەو رِێگایە،" ووتم و هێمام بۆ کرد رِێك بۆ پێشەوە، ئەو ئاڕاستەیەی کە مارسیدسەکە گرتبووی. پیاوەکە دەمی داچەقان، دانە سپیە جوانەکانی دەرکەوت، و دایە قاقای پێکەنین.

## بەشی دووهەم

### گەوردبوونم لەگەڵ ئاژەڵدا

پێش ئەوەی لە ماڵەود هەڵبێم، تێکەڵاوی سروشت، خێزان و پەیوەندییەکی قووڵ بووم لەگەڵ ئاژەڵدا کە ئێمەی زیندوو ڕاگرتبوو. لە سەرەتای منداڵیمەوە بەشداری ئەو ڕەوشە گشتییەی منداڵانی سەرتاسەری جیهانم کرد: خۆشەویستیم بۆ ئاژەڵ. لە ڕاستیدا ئەوەندەی بیرم بێت، گیسکێکیماڵیم هەبوو، بە ناوی *بیلی*. بیلی گەنجینەی تایبەتی من بوو، هەموو شتێکم بوو. دەشێت خۆشم ویستبێت چونکو ئەویش منداڵ بوو. وا ڕاهاتبووم دەستم بە هەر خواردنێکدا بگەیشتایە بە نهێنی دەمدایە، تا وای لێهات قەڵەوترین و سەرحاڵترین بزنی ڕانەکەی لێدەرچوو. بەردەوام دایکم بۆی پرسیار بوو، "ئەرێ ئەم بزنە بۆ وا قەڵەوە، لەکاتێکدا ئەوانی تر لەڕن؟" جاودێرییەکی تەواوم دەکرد، دەمخوراند، نازم دەکێشا، چەنددها کاژێر بۆی دەدوام.

پەیوەندیم لەگەڵ بیلیدا ئاوێنەی ژیانمان بوو لە سۆماڵ. چارەنووسی خێزانەکەمان بەو ڕانەوە گرێدرابوو، کە ڕۆژانە دەمان لەوەڕاندن. شکۆیی ئاژەڵ لەلامان لە پشتبەستن پێیانەوە سەرچاوەی دەگرت، ئەم هەستە لە هەموو هەڵسوکەوتێکماندا خۆی نیشان دەدا. هەموو منداڵی خێزانەکەمان ئاژەڵی لەوەڕاندووە، ئەرکێك کە لە سەرەتای پێگرتنەوە دەست پێدەکات. لەگەڵ ئاژەڵ گەورە بووین، بە شادییان شاد دەبووین، بە ئازاریان ئازارمان دەکێشا، بە مردنیان دەمردین. ڕانە مەڕ و بزنمان بەخێودەکرد، لەگەڵ ئەوەی من زۆر بیلیم خۆشدەویست، بەڵام گومانی تیادا نەبوو کە حوشترەکانمان لە ناو ئاژەڵەکانماندا بەنرخترینیان بوون.

حوشتر له سۆماڵ ئەفسانەیە، سۆماڵ شانازی بە حوشتری زیاترەوە دەکات وەك لە هەر وولاتێکی تر لە جیهاندا، ژمارەی حوشتر لە دانیشتوانی زیاترە. وولاتەکەمان خاوەنی کەلتوورێکی دەوڵەمەندی شیعری زارەکییە کە زۆربەی تەرخان کراوە بۆ گواستنەوەی پەند و ئامۆژگاری لەسەر حوشتر، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر. ئەمەش ڕایدەگەیەنێت، کە بەهای سەرەکی کەلتووردکەمان لە چیدایە.
بیرم دێت، دایکم ڕاهاتبوو بە وتنی ئەم گۆرانییە کە ئەمە ناوەڕۆکەکەی بوو، 'حوشترەکەم چۆتە لای پیاوێکی خراپ، کە لەوانەیە بیکوژێت یان لێم بدزێت. دەپاڕێمەوە، دوعا دەکەم، تکای لێدەکەم بۆم بێنێتەوە.' هەر لە منداڵیمەوە هەستم بە گرنگی زۆری ئەم ئاژەڵە کردووە، چونکە لە کۆمەڵگای ئێمەدا وەك زێڕ چاوی لێدەکرێت. بێ ئەوانە ناتوانی بۆ ڕۆژێك لە بیاباندا بژیت. وەك هۆنراوەیەکی سۆماڵی دەڵێت:

*حوشتری مێینە دایکە*
*بۆ ئەو کەسەی هەیەتی*
*هەرکە نێرینە بێت خوێنبەرە*
*کە ژیانی پێوە بەستراوە*

ئەمە ڕاستە. ژیانی پیاو بە حوشتر دەخەمڵێنرێت، هەر سەد حوشتر نرخی پیاوێکی کوژراوە. سەد حوشتر دەبێت بدرێت بە خێڵی پیاوی کوژراو بۆ درێژە پێدانی بژێوی خێزانی کۆستکەوتوو، یان خێڵی پیاوی کوژراو دەست لە بکوژ دەکاتەوە بۆ تەمێکردنی. شیربایی بووك بە حوشتر دددرێت. بەڵام لە ژیانی ڕۆژانەدا، حوشتر زیندومان ڕادەگرێت. هیچ ئاژەڵێکی خۆماڵی تر ئەوەندەی ئەم گونجاو نییە بۆ ژیانی بیابان. حوشتر هەفتەی جارێك دەیەوێ ئاو بخواتەوە، بەڵام

دەتوانێ تا یەك مانگ بێ ئاو ڕێ بكات. كاتێك حوشتری مێینە شیر دەدات، هەم خۆراكمان پێدەدات و هەم تینویەتیمان دەشكێنێت، گەنجینەیەكی بەهادارە كاتێك لە ئاو دوور بیت. لە بەرزترین پلەی گەرماییدا حوشتر ئاقەكی خۆی دەپارێزێت و گیان بەدەردەبات. لەسەر دەوەنی دڕكاوی ئەلەوەڕێت كە لە بیابانی وشكی ئیمەدا هەیە و گیا جێدەهێلێت بۆ ئاژەڵی تر.

بەخێویان دەكەین تا لە ناوچە جۆراوجۆرەكانی بیابان بمان گوێزنەوە، ئەو كەلوپەلە كەمەی هەمانە لێیان باردەكەین و قەرزی پێدەدەینەوە. لە وولاتانی تر دەتێ سواری ماشێن بی و بڕۆی. بەلام تەنها ئامرازی گواستنەوەی ئێمە، بێجگە لە پیادەڕەوی، حوشترەكانمانە.

سروشتی حوشتر زۆر لە ئەسپەوە نزیكە، حوشتر دەتوانێت پەیوەندییەكی توندوتۆڵ لەگەڵ خاوەنەكەی ببەستێت، شتی وەهای بۆ بكات كە بۆ كەسی تری نەكات. پیاوان ڕامی جوانوی حوشتر دەكەن - كارێكی مەترسیدارە - و ڕایان دەهێنن بۆ سواربوون و گوێڕایەڵی. گرنگە لەگەڵیاندا توند بی، چونكو ئەگەر وا نەبێت، هەر ئەوەندە هەست كەن سواردكەیان لاوازە هەڵیدەددنە خواردوە، یان لەقەی لێدەدەن.

وەك زۆربەی سۆماڵییەكان. ژیانێكی ئاژەڵداریمان دەبردەسەر. هەرچەند بەردەوام لە هەوڵی نانی ڕۆژانەدا بووین بەلام بەهۆی خاوەنداریتی ڕەودیەكی گەورەی حوشتر و ڕانی مەڕ و بزن دەوڵەمەندیمان، بەپێی پێوانەی وولاتەكەم، بەرچاو بوو. وەك نەریتێك براكانم ئاژەڵی گەورەی وەك ڕەوە حوشتریان دەلەوەڕاند و كچەكانیش ئاژەڵی بچوك.

وەك كۆچەرییەك بەردەوام لە هاتووچۆدا بووین. هیچ كات زیاتر لە سێ چوار هەفتە لە شوێنێكدا نەدەماینەوە. ئەم جوڵانە بەردەوامە لە بەخێوكردنی ئاژەڵەكانمانەوە سەرچاوەی دەگرت. بەدوای خواردن و ئاودە بووین تا زیندو ڕایان گرین و ئەمە لە ئاوهەوای گەرمی سۆماڵدا بەدەگمەن ئاسان دەدۆزرایەوە.

ماڵەکەمان کەپرێك بوو بە گیا دادەپۆشرا، قابیلی هەلگرتن بوو، وەك چادر. چوارچێوەیەکمان لە دار دروست دەکرد پاشان حەسیرێك، کە دایکم لە گیا چنیبووی، بەسەر سەرەکەی و دارە نوشتاوەکاندا دەدا، کەپرێکی شێوە گومەزی بە شەش پێ تیرە بازنەیی لێدەردەچوو. کاتێك دەمان ویست کۆچ بکەین هەڵمان دەوەشاندەوە و دار و حەسیرەکانمان لەگەڵ ئەو هەندە کەلوپەلەی کە هەمان بوو دەبەست و بارمان دەکردن لە حوشترەکان. گومانی تیایدا نییە ئاژەڵێکی بەهێزن و منداڵە بچوکەکانمان سواردەکردن و خۆشمان شان بە شانی حوشترەکان بەرەو مێرگ و هەواری تازە دەکەوتینە ڕێ. کاتێك بە چاڵاو و مێرگێك دەگەیشتین، کەپرەکەمان دادەمزراندەوە.

کەپرەکە دەبووە پەناگایەك بۆ منداڵانی ساوا، سێبەر لە ڕۆژی نیوەڕۆدا و گەنجینەیەك بۆ هەلگرتنی شیری تازە. لە شەودا، باقییەکەمان لە دەرەوە، لەسەر حەسیر و لەژێر ئاسمانی پڕ ئەستێرە، دەست لەملان لەگەڵ منداڵەکاندا دەنوستین. پاش ڕۆژ ئاوا بوون، هەوای بیابان سارد دەبوو، پێخەف تەواومان نەبوو بۆ هەر منداڵەی یەکێکی بەرکەوێت و لەبەرئەوەی جلی کەممان لەبەردابوو، ڕاهاتبووین بە گەرمایی لەشمان خۆمان گەرم ڕاگرین. باوکم، وەك پاسەوانی پارێزەری خێزانەکە، لە لایەکەوە تۆزێك دوور لە ئێمە دەنوست.

بەیانیان لەگەڵ ڕۆژ هەڵهاتندا هەڵدەستاین. یەکەم کارمان دەچووین بۆ پەچەی ئاژەڵەکانمان و دەکەوتینە دۆشینیان. بۆ هەرکوێ بچووینایە دەکەوتینە بڕینی نەمام بۆ دروستکردنی پەچە بۆ ئاژەڵەکان تا لە شەودا ڕانەکەن. بەچکەی ئاژەڵەکانمان لە پەچەیەکی جیادا دەپاراست، بۆئەوەی هەموو شیری دایکەکانیان نەمژن. یەکێك لە ئەرکەکانم دۆشینی مانگاکان بوو، بەشێکم لێجیادەکردەوە بۆ دروستکردنی کەرە، بەڵام بەشێکی تەواوم جێدەهێشت بۆ مژینی گوێرەکەکان. پاش دۆشین ڕێگامان دەدا بە بەچکەکان دایکەکانیان بمژن.

پاشان نانی بەیانیمان دەخوارد، کە شیری حوشتر بوو. شیری حوشتر لە باقی شیری ئاژەڵەکانی تر سودمەندترە و ڤیتامین سی تێدایە. ناوچەکەمان ووشکانی بوو، ئاوی تەواومان نەبوو بۆ بەرهەمهێنانی دانەوێڵە و ڕووەك، لەبەرئەوە نە سەوزەمان هەبوو نە نان. هەندێك جار شوێن پێی گەلە بەرازی کێوی ئەفریقی دەکەوتین بەدوای ڕووەکدا. بە بۆن ڕەگی خۆراکیان دەدۆزییەوە و بە سم و لمۆزیان هەڵیان دەکەند و ژەمە خواردنی خۆیان لێبەدەست دەهێنا. خێزانەکەمان بەشداری ئەم خێراتەیان دەکرد و بەشێکی لێدەهێنایەوە بۆ خواردن.

سەربڕینی ئاژەڵمان بۆ گۆشتەکەی بە دەستبلاوی دەزانی و پەنامان بۆ نەدەبرد تەنها لەکاتی تەنگافی یان بۆنەیەکی تایبەت نەبێت، وەك زەماوەند. ئاژەڵەکانمان زۆر لەوە زیاتر بەنرختر بوون تا سەریان بڕین و بیان خۆین، ئێمە بەخێومان دەکردن لەبەرخاتری شیرەکەیان و بازرگانی کردن پێیانەوە لەبەرامبەر ئەو کاڵانەی کە پێویستمان پێیان بوو. بژێوی هەر ڕۆژەمان شیری حوشتر بوو بۆ ژەمی بەیانیان و هەمان شت بۆ ژەمی ئێواران. هەندێك جار ژەمی خواردن ئەوەندە نەبوو بەر هەموومان کەوێت، لەبەرئەوە لەپێشدا منداڵە وردەکان نانیان دەخوارد، پاشان گەورەکان و بەم شێوەیە. دایکم هەرگیز دەستی بۆ خواردنەکە نەدەبرد تا هەموومان لێدەبووینەوە، لەڕاستیدا بیرم نایەت دایکم نانی خواردبێت، هەرچەند دەمزانی دەبێت بیخوات. بەلام ئەگەر هیچ شتێکمان نەبوایە بۆ نانی ئێوارێ، گرفتێکی گەورە نەبوو، ئاسمان نەدەڕوخا. پێویست نەبوو بگریت یان گلەیی بکەیت. لەوانەبوو منداڵە ووردەکان بگریانایە، بەلام گەورەترەکان ئاگاداری یاساکان بوون، لەبەرئەوە تەنها دەچووین بۆ خەوتن. هەوڵمان دەدا سەرحاڵی خۆمان ڕاگرین، ئارام و بێدەنگ بمێنینەوە، بۆ سبەینێ، خوا بیویستایە، ڕێگایەکمان دەدۆزیەوە. ئینشا ئەلا، کە بە واتای ئەوەی ئەمە ڕوودەدا 'ئەگەر خوا بیەوێت،' ئەمە فەلسەفەی ئێمە

بوو. دەمان زانی ژیانمان بەندە بە هێزەکانی سروشتەوە، ئەو هێزانەش لەژێر دەستی خوادایە، نەك ئێمە.

خۆشی گەورەمان - وەك خەڵکانێکی تری جیهان، کە لەوانەیە بیکەن بە ڕۆژی ئاهەنگ - کاتێك بوو کە باوکم بە کیسەیەك برنجەوە دەهاتەماڵەوە. دەمان کرد بە چێشت بە کەرەیەکەوە کە دروستمان کردبوو لە ڕاوەشاندنی شیری مانگا لەناو سەبەتەیەك کە دایکم خۆی چنیبووی. جاروبار بازرگانیمان بە بزنەوە دەکرد بۆ گەنمەشامی، کە لەو ناوچە سۆماڵییانەی ئاویان هەبوو، دەڕووا و دەمان کوتی و ئاردەکەیمان دەکرد بە کەشکەك، یان دەمان خستە ناو تاوەی سەر ئاگر و دەنکە گەنمەشامیمان لێدروست دەکرد. یان، کاتێك خێزانی تر لە دەوروپشتمان دەبوون، هەردەم چیمان هەبوایە لەگەڵیاندا دابەشمان دەکرد. ئەگەر یەکێك لە خێزانەکان هەندێك خواردنی - خورما یان ڕەگیان - هەبوایە یان ئاژەڵێکی بۆ گۆشتەکەی سەربڕیایە، لێیان دەنا و ژەمە خواردنێکیان لە نێوماندا دابەشدەکرد. ئەو شتە خۆشەی خۆمان دابەش دەکرد، چونکو سەرەڕای ئەوەی زۆربەی کات تەنیا بووین، هاوسەفەری خێزانێك یان دووان بووین، هێشتا بەشێك بووین لە کۆمەڵێکی زیاتر. لەبەرئەوەی یەخچاڵمان نەبوو، وا گونجاوتر بوو، گۆشت یان هەر شتێکی تازە، پێویست بوو دەستبەجێ بخورێت.

هەموو بەیانییەك پاش نانخواردن، کاتی بردنە دەرەوەی ئاژەڵەکان بوو لە پەچە. تەمەنم شەش ساڵ بوو، بەرپرسی بردنی ڕانی شەست حەفتا سەر مەڕ و بزن بووم بۆ بیابان بۆ لەوەڕاندن. دەستم دەدایە دارە درێژەکەم و تەنها لەگەڵیاندا ڕێم دەکرد و بەو تۆزە گۆرانییەی دەمزانی ڕێنمایم دەکردن. ئەگەر یەکێکیان لە ڕان هەڵبڕایە، بە دارەکەم دەمگەڕانەوە. پەرۆشی ڕۆیشتن بوون، چونکە دەیان زانی هاتنە دەرەوە لە پەچە بە واتای کاتی خواردن دێت. زوو کەوتنە ڕێی گرنگ بوو، بۆ دۆزینەوەی باشترین چاڵاوی تازە و لەوەڕ. هەموو ڕۆژێك بە خێرایی دەکەوتمە گەڕان بەدوای

ئاودا، تا لەپێش شوانەکانی تر بگەمە سەری، ئەگەر وا نەبوایە ئاژەڵەکانمان ئەو ئاوە کەمەیان دەخواردەوە کە مابۆوە. هەرچی چۆنێك بێت، کە ڕۆژ گەرمتر دەبوو زەوی تینوتر دەبوو، هەموو ئاوەکەی هەڵدەمژی. ڕادەوەستام بۆئەوەی ئاژەڵەکان چەند دەتوانن ئاو بخۆنەوە، چونکە لەوانەیە تا ئاوێکی تر دەدۆزینەوە هەفتەیەك یان زیاتر بخایەنێت. یان دوو. یان سێ کێ دەزانێت؟ هەندێك جار لەکاتی بێبارانیدا، ناخۆشترین شت ئەوەیە بە بەرچاوی خۆتەوە هەموو ئاژەڵەکانت بمرێت. هەموو ڕۆژێك زیاتر و زیاتر ڕێگامان دەبڕی بەدوای ئاودا، ڕانەکە لەگەڵت ڕێ دەکات، بەڵام لەکۆتاییدا لەوە زیاتری نەدەتوانی. کاتێك لە جوڵە دەکەوتن، ئەو پەڕی هەستی بێدەستەڵاتی دەکەیت، چونکە دەزانی ئەمە کۆتاییە و هیچ شتێك ناتوانی بکەیت.

هیچ کەس لە سۆماڵ خاوەنی لەوەڕگای خۆی نییە، نیتر ئەوە بۆ خۆم دەگەڕایەوە زیرەکانە ناوچەیەکی پڕ لەوەڕ بۆ بزن و مەڕەکانم بدۆزمەوە.غەریزەی گیانبەدەربردن وای لێکردبووم بەدوای هێمای باراندا بگەڕێم و لە ئاسمان وردبمەوە بۆ هەور. ئەندامە هەستیارەکانی تریشم دەهاتنە مەیدانەوە، چونکو بوونی بۆنێکی تایبەت یان هەستێکی دیاریکراو لە هەوادا دەیتوانی پێشبینی باران بکات.

کاتێك ئاژەڵەکان دەلەوەڕین، ووریای دز و جەردە دەبووم، کە لەهەموو کون و قوژبنێکی ئەفریقادا هەیە. کەمتیار بەدزییەوە دێت و پڕ دەکات بە بەرخێك یان کارێکی لە ڕان دابڕاو. شێر یان سەگی کێوی جێگای نیگەرانییە، کە بە گەل دەگەڕێن، لەکاتێکدا من تەنها خۆمم.

لە ئاسمان ورددەبوومەوە و لێکمدەدایەوە، چەندم پێدەچێت تا دەگەمە ماڵەوە پێشئەوەی تاریك دابێت. بەڵام هەندێك جار هەڵەم دەکرد و ئینجا گرفت یەخەی دەگرتم. جارێکیان شەو داهات و بەدوای دۆزینەوە ڕێگای ماڵەوەدا هەر پێم هەڵدەنوت، کە گەلە کەمتیار هێرشیان بۆ کردم، چونکە دەیان زانی ناتوانم بیان بینم. یەکێکم دووردەخستەوە، یەکێکی تر لە پشتمەوە نزیك دەبوەوە. بەدوای

یەکێکدا ڕام دەکرد، یەکێکی تر دەهات کە نەمدەبینی. کەمتیار لەهەموویان مەترسیدارترن، چونکو واز ناهێنن تا شتێکیان چنگ نەکەوێت. هەموو ئێوارەیەك کە دەگەیشتمە ماڵەوە و ئاژەڵەکانم دەکردە پەچەکەوە، بۆ چەند جار دەمژماردن بۆئەوەی بزانم هەموویان هاتوونەتەوە. شەوێك کە بە ڕانەکەوە گەڕامەوە و ژماردمن، سەیرم کرد یەکێکی کەمە. بۆ چەند جار ژماردمن. لەپڕ هەستم کرد بیلیم نەبینیوە. بە شوێنیدا بەناو بزنەکاندا ڕام کرد. بە هاتوهاوار خۆم گەیاندە لای دایکم 'دایە، بیلی دیار نییە - چی بکەم؟' بەڵام گومانی تیایدا نەبوو زۆر درەنگ بوو، دایکم دەستی هێنا بەسەرمدا، دەستم کرد بە گریان کاتێك زانیم کەمتیارەکان گیسکە قەڵەوە دەستەمۆکەیان خواردوم.

هەرچییەکمان بەسەر بهاتایە، بەرپرسایەتی بەخێوکردنی ئاژەڵەکان بەردەوام دەبوو و هەردەم کارێك بوو لە پێش هەموو کارێکی ترەوە، هەتا لەکاتی بێبارانیدا، نەخۆشی، یان شەڕدا. شێواوی بەردەوامی سیاسی سۆماڵ گرفتێکی گەورەی لە شارەکاندا دروست کردبوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئێمە زۆر دووردەست بووین، هیچ لایەنێك دەستی پێمان نەدەگەیشت بێزارمان بکات. کاتێك تەمەنم نزیك نۆ ساڵ بوو، سوپایەکی گەورە هات و لە نزیکمان چادریان هەڵدا. چیرۆکی زۆرمان بیستبوو لەبارەی سەربازانێکەوە، کە ئەتکی کچانیان کردبوو کاتێك بە تەنها تووشیان بووبوون، کچێکم دەناسی ئەمەی بەسەرهاتبوو. بۆم گرنگ نەبوو ئەمانە سوپای سۆماڵن یا مارتین، ئەمانە بەشێك نەبوون لە خەڵکی ئێمە، ئەمانە کۆچەری نەبوون، بەهەر نرخێك بوایە لێیان دوور دەکەوتینەوە.

بەیانییەکیان باوکم کاری ئاودانی حوشترەکانی پێسپاردم، منیش حوشترەکانم دایە پێش خۆم و ڕۆیشتم. دیار بوو ئەو شەوە سوپا هاتبوون هەموو ئەو ناوەیان داگیرکردبوو، تا چاو بڕیکات هەر چادر و ماشێنە بارهەڵگرەکانیان بوو. لەپشت

دارێکەوە خۆم شاردەوە و کەوتمە تەماشاکردنیان، کە لەو ئاوە بە جلوبەرگی سەربازییەوە هاتووچۆیان بوو. ترسام، چیرۆکی ئەو کچانەم وەبیرهاتەوە، ڕۆشن بوو هیچ کەسێك لەو ئاوەدا نەبوو پارێزگاریم لێبکات، لەبەرئەوە سەربازەکان دەیان توانی هەرچی پێیان خۆش بێت لەگەڵمدا بیکەن. هەر لە یەکەم بینینیانەوە ڕقم لێیان بۆوە، لە جلوبەرگە ڕەسمییەکانیان، لە ماشێنە بارهەڵگر و تفەنگەکانیان. هەتا ئەم دەزانی ئەمانە چی دەکەن، ئەوەی دەمزانی ئەمانە دەبوایە پارێزەری سۆماڵ بوونایە، بەڵام حەزم لە چارەی هیچ لایەنێکیان وەك یەك نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا حوشترەکانمان پێویستی بە ئاو بوو. تەنها ڕێگایەك کە دووری دەخستەوە لە سەربازگەکە، ڕێگایەکی دوور و درێژ و دەوران دەور بوو بۆ حوشترەکانمان کە پیایدا برۆن. لەبەرئەوە بڕیارم دا حوشترەکان ئازاد کەم و خۆیان سەربازگەکە بێ من ببڕن. ڕێك بە ناو سەربازەکاندا بەرەو ئاوەکە ڕۆیشتن، وەك ئەوەی کە من ئاواتەخوازی بووم. بەدەوری سەربازگەکەدا، بەپشت دار و دەوەنەکاندا ڕام کرد تا لەوبەرەوە، لەسەر ئاوەکە بە حوشترەکانم گەیشتمەوە. پاشان کە دنیا تاریك بوو، هەمان کارم دووبارە کردەوە و بە سەلامەتی گەیشتمە ماڵەوە.

هەموو ئێوارەیەك، لە ڕۆژ ئاوا بووندا کە بە ئاژەڵەکانەوە دەگەیشتینە ماڵەوە، دەمان خستنە پەچەوە و دەستمان دەکردەوە بە دۆشینیان. زەنگۆڵەی تەختەمان دەکردە ملی حوشترەکان. لەڕاستیدا دەنگی ئەم زەنگۆڵانە ئاوازی کۆچەرییەکە کە گوێی پێدەدات و دەست دەکات بە دۆشین، کاتێك دنیا تاریك دەبێت. زەنگۆڵە هەردەم دەوری مەشخەڵ دەبینێ بۆ ڕێبوارێك، کە وێڵە بە دوای ماڵەوەدا، وەك فەنەر دەنوێنێ. لەکاتی ئاسایی ئەرکەکانی ئێواراندا، کاتێك ئەستێرەیەکی گەش لە تاریکایی کەوانەی ئاسمانی بیاباندا دەردەکەوێت، نیشانەی بردنەوەی ڕانە بۆ ناو پەچە. لە نەتەوەکانی تردا ئەم ئەستێرەیە بە ڤینۆس ناسراوە، ئەستێرەی

خۆشەویستی، بەلام لە ولاتی ئیمەدا پێی دەوترێ *ماقال هیدهید*، بە واتای 'شاردنەوەی بەرخەکان' دێت.

لەم کاتانەدا بوو، جاروبار تووشی گرفت دەبووم، چونکە لە ڕۆژ هەڵهاتنەوە دەستم بەکار دەکرد، ئیتر لەوە زیاتر نەم دەتوانی چاوم بە کراوەیی ڕاگرم. لەکاتی ڕۆیشتن لە زەردەپەڕی ئێواراندا خەو دەی بردمەوە و دەکەوتم بەسەر بزنەکاندا یان کە بە چیچکانەوە بۆ دۆشین دادەنیشتم، سەرم شۆڕدەبۆوە بۆپێشەوە. ئەگەر باوکم منی بگرتایە کە وەنەوز دەدەم، هاواری لێدەکردم! باوکمم خۆشدەوێت، بەلام گاڵتەی لەگەڵ نەدەکرا، کاتێك دەیگرتم بەسەر ئیشەوە خەوم لێکەوتووە، زرمەی لێهەڵدەساندم، بۆئەوەی دڵنیا بێت کارەکەم بە گرنگ دەگرم و بایەخی خۆی پێدەدەم. لەپاش تەواو بوونی کارەکانمان، شیری حوشتر ژەمی ئێوارەمان بوو. دارمان کۆدەکردەوە و ئاگرێکی گەورەمان دەکردەوە و بەدەوریدا دادەنیشتین قسەمان دەکرد و پێدەکەنین تا دەخەوتین.

ئەو ئێوارانە خۆشترین بیرەوەری سۆماڵمە: دانیشتنی بەکۆمەڵ لەگەڵ دایك و باوکم، خوشك و براکانم، کاتێك هەموومان تێر دەبووین، هەموومان پێدەکەنین. هەردەم هەوڵمان دەدا دڵخۆش بین، گەشبین بین. هیچ کەسێك لەنێوماندا گلەیی نەدەکرد یان بیانووی نەدەگرت یان نەی دەوت: 'دەی، با باسی مردن بکەین.' ژیانمان زۆر سەخت بوو، پێویست بوو، هەموو هێز بدەینە خۆمان بۆئەوەی گیانبەدەربەرین ئەگەر نا ڕەشبین بوون هێزی لەبەر دەبڕین.

هەرچەند هیچ لادێیەکمان لەلاوە نزیك نەبوو، بەلام هەرگیز تەنها نەبووم، چونکو لەگەڵ خوشك و براکانمدا سەرگەرمی یاریکردن بووم. من ناونجیان بووم، برایەك و دوو خوشك لە خۆم گەورەتر و چەند زرخوشك و زربرا لەخۆم بچوك تر. یەکتری ڕاونان کۆتایی نەبوو، وەك مەیمون بەسەر داردا سەردەکەوتین، یاری *تیك* -

*تاك - تۆ* مان دەكرد بە كێشانی خەت بە پەنجە لەناو لمەكەدا، كۆكردنەوەی بەردی بچوك و چاڵ هەڵكەندن لە زەوییەكەدا، كە یاریكردنێكی ئەفریقییە پێی دەوترێ *مانكالا*. هەتا ئێمە یاری *جاكس*ی خۆمانەمان هەیە، بەڵام لە جیاتی تۆپی *لاسیك* و پارچە ئاسن، بەردێك هەڵدەدین و بەردی تر دەگرینەوە لەجیاتی جاكس. ئەمەم لە هەموو یارییەك زیاتر لا پەسەندتر بوو، چونكو زۆر باش بووم تیایدا و هەوڵم دەدا *عەلی*، برا بچوكەكەم، ڕازی بكەم یاریم لەگەڵدا بكات.

سەرەڕای هەموو شتێك، گەورەترین خۆشیمان ئەوە بوو، كە لەو چۆڵەوانییەدا شاد بووین بەوەی كە منداڵ بووین، ئازاد بووین بەشێك بیین لە سروشت و لەگەڵ ئەو دیمەن، دەنگ و بۆنانەدا بژین. تەماشای گەلە شێرمان دەكرد كە تەواوی ڕۆژ كەوتبوون، لەسەرپشت خۆیان دەدایە بەر ڕۆژ، خۆیان دەگەوزان، قاچیان بە ئاسمانەوە و پرخەیان دەهات. بەچكەكانیان، هەر وەك ئێمە، بەدوای یەكتریدا ڕاو ڕاوێنیان بوو یارییان دەكرد. لەگەڵ زەڕافە، زێبرا و ڕێویدا ڕامان دەكرد. *هیراكس*، بە تایبەتی پەسەندكراوی من بوو، كە ئاژەڵێكی ئەفریقییە بە بارستایی كەروێشكێك، بەڵام لەڕاستیدا لە نەوەی فیل دەچێ. لەسەرخۆ لەبەر كونەكانیاندا چاوەڕوانیمان دەكردن بۆئەوەی دەموچاوە بچوكەكانیان ببینین كاتێك دەردەكەوتن، ئینجا بەناو لمەكەدا بەدوایاندا ڕامان دەكرد.

جارێكیان كە لەدەرەوە بووم، هێلكەی وشترملێكم دۆزییەوە، بڕیارم دا بیبەمە ماڵەوە، چونكو دەمویست تروكاندنی هێلكەكە و هاتنە دەرەوەی بەچكەكە ببینم و پاشان بۆخۆم دەستەمۆی بكەم. هێلكەكەی نزیك بە ئەندازی تۆپی بۆلینگە، كە لە كونی ناو لمەكەدا دەرمهێنا و بردم، دایكی پێی زانیم. دوام كەوت باوەڕم پێبكەن، وشترمل زۆر خێرایە، دەتوانێت چل میل لە كاژێرێكدا ڕاكا. خێرا منی گرتەوە و كەوتە دەنوك دان لەسەرم، كا - كا - كا. هەستم كرد، وەك هێلكە، كاسەی سەرم كون دەكات. لەبەرنەوە هێلكەكەم دانا و بۆی دەرچووم.

بەدەگمەن نزیکی ناوچە دارستانییەکان دەبووینەوە، بەلاَم هەر کات بووبێتین، پێمان خۆش بووە تەماشای فیل بکەین. زۆر لە دوورەوە گوێمان لە شیڕەی گوێچکە کونکەریان دەبوو و سەردەکەوتینە سەر دار بۆ تەماشاکردنیان. فیل وەك شێر، مەیمون و مرۆڤ، بە کۆمەڵ دەژین. ئەگەر لە نێویاندا بەچکەیەك هەبێت، هەموو فیلە گەورەکان، بە ئاموزا، خاڵ، پور، خوشك، دایك، دایکی دایك - هەرهەموو چاودێری دەکەن، بۆئەوەی دڵنیا بن کەس توخنی نەکەوێت. هەموو نێمەی منداڵان لەسەر دارەکان دەماینەوە و پێدەکەنین، تەماشای دنیای فیلمان دەکرد بۆ چەند کاژێرێك.

بەلاَم وردە وردە ئەو کاتە خۆشانەی نێو خێزانەکەمان نەما. خوشکەکەم هەڵهات، براکەم چوو بۆ شار بۆ قوتابخانە. لە هەندێك شتی غەمناکی ژیان و خێزانەکەمان ئاگادار بوومەوە. باران نەدەباری و بەخێوکردنی ئاژەڵەکانمان تا دەهات سەختتر دەبوەوە. ژیان سەختتر و منیش سەختتر دەبووم لەگەڵی.

بەشێك لە سەختی، مردنی برا و خوشکەکەم بوو بەبەر چاوی خۆمەوە. لە ڕاستیدا خێزانەکەمان دوانزە منداڵی هەبوو، ئێستا تەنیا شەشی ماوە. دایکم دووانەیەکی بووە، پاش لە دایك بوونیان مردن. کچێکی منداڵی جوانی هەبوو، کە تەمەنی نزیك شەش مانگ بوو. بەهێز و لەش ساغ بوو، ڕۆژێك دایکم بانگی کردم، 'واریس ! ! !' ڕام کرد بۆ لای و بینیم لەسەر ئەژنۆیە بەرامبەر منداڵەکە. کچێکی بچکۆلانە بووم بەلاَم تێگەیشتم شتێکی زۆر خراپ ڕوویداوە، منداڵەکە باش دیار نەبوو. 'واریس، ڕاکە تۆزێك شیری حوشترم بۆ بێنە!' دایکم هاواری کرد. بەلاَم نەمتوانی جوڵە بکەم. 'ڕاکە، خێراکە!' لە جێی خۆم چاوم بڕیبووە خوشکەکەم، لە هۆشخۆم چووبووم - ترسا بووم. 'ئەوە چیتە؟' دایکم قیژانی بە سەرمدا.

لەکۆتاییدا، ڕام کرد، بەڵام دەمزانی چیی چاوەڕوانم دەکات کە دەگەڕێمەوە. بە شیرەکەوە گەڕامەوە، بەڵام منداڵەکە جوڵەی لەبەر بڕابوو، دەمزانی مردووە. کە دووبارە تەماشام کردەوە، دایکم زلەیەکی قایمی لێدام. بۆ ماوەیەکی زۆر دایکم گلەیی لێدەکردم لەسەر مردنی منداڵەکە، وا هەستی دەکرد کە من جۆرێك لە هێزی جادوگەرانەم هەیە و کاتێك لەهۆش خۆم چووم و لە منداڵەکە ورد بوومەتەوە، بوومەتە هۆی مردنی.

من هێزێکی وەهام نەبوو، بەڵام برا بچوکەکەم تواناییەکی زگماکی سەرئاسای هەبوو. هەموو لەسەر ئەوە کۆك بوون کە منداڵێکی ئاسایی نەبوو. ئێمە پێمان دەوت پیرە، چونکو تەمەنی نزیك شەش ساڵ بوو، کە سەری بەتەواوی ماش و برنج بوو. تا بڵێی زیرەك بوو و پیاوانی دەوروپشتمان دەهاتن و داوای ئامۆژگاریان لێدەکرد. دەهاتن و دەیان وت: "پیرە لە کوێیە؟" بەنۆرە، ئەم کوڕە بچوکە سەر ماش و برنجەیان دەخستە سەر کۆشیان. "چۆن بیردەکەیتەوە سەبارەت بە بارانی ئیمساڵ؟ پیاوەکان پرسیاریان لێدەکرد. هەرچەند بە تەمەن منداڵ بوو، بەڵام هەرگیز وەك منداڵ هەڵسوکەوتی نەدەکرد. بیرکردنەوەی، قسەکردنی، دانیشتنی و ڕەفتاری لە پیاوێکی پیری زۆر زیرەك دەچوو. لەکاتێکدا هەموو کەس ڕێزی لێدەگرت، لێشی دەترسان، چونکو زۆر ئاشکرا بوو کە یەکێك نەبوو لە ئێمە. پیرە مرد، لەکاتێکدا هێشتا کوڕێکی گەنج بوو. وەك ئەوەی هەموو تەواوی ژیانی لەو چەند ساڵە کورتەدا چڕ کرابێتەوە. هیچ کەس نەیدەزانی هۆی چی بوو، بەڵام هەموو کەس وای بۆدەچوو، کە "بە هیچ شێوەیەك سەر بەم جیهانە نەبوو."

هەر وەك خێزانی گەورە، هەر یەك لە ئێمە دەورێکی لە خۆدا گەشە دەدا. من لە نێویاندا یاخی دەرچووم، ئەم ناوزڕانەم لە زنجیرەیەك کردەوەوە بەنسیب بوو، کە بۆ من تەواو ژیربێژی و مەزنەدار بوو، بەڵام بۆ گەورەکان بە تایبەتی باکم - جێگای

نیگەرانی بوو. ڕۆژێکیان من و برا بچوکەکەم عەلی لەژێر دارێکدا دانیشتبووین و خەریکی خواردنی شیربرنج بووین. عەلی بەهەڵپە خواردنەکەی قوتدا. بەڵام چونکو خواردنێکی دەگمەن بوو بۆ ئێمە، هەر پارویەکم بەهێواشی دەخوارد. خواردن شتێك نەبوو بیبەخشی. هەردەم بەهام داوە بە بەشە خواردنەکەی خۆم. بەخۆشییەوە چێژم لە هەر پارویەك بینیوە. تەنها تۆزێك لە شیربرنج لە قاپەکەمدا مابوو، بە شوروشەوقەوە مرخم لێخۆشکردبوو. لەپڕ عەلی بە کەوچکەکەی پڕی کرد بە دوا پارومدا، دوا دەنکە برنجی بە قاپەکەمەوە نەهێشت. بەبێ ئەوەی بیرکەمەوە، دەستم دایە چەقۆیەك کە لەبەردەممدا بوو، لە ڕانی عەلیم چەقاند. عەلی هاواری لێهەڵسا، بەڵام چەقۆکەی دەرهێنا و دروست کردی بە هەمان شوێنی ڕانمدا. هەردووکمان بە ڕانی برینداروە دانیشتین، بەڵام لەبەرئەوەی من لەپێشدا چەقۆکەم وەشاندبوو، من سەرزەنشت کرام. تا ئیمڕۆش نیشانەی جێگا چەقۆی ئەو پاروە خواردنەم پێوەیە.

ئارەزووی جوتێ پێڵاو، هۆکاری سەرەتای یەکێك لە سەرهەڵدانی هەڵسوکەوتی یاخییانەم بوو. خولیای پێڵاو لەتەواوی ژیانمدا بووە. تا ئیمڕۆ لەگەڵ ئەوەی مانیکانم، ئەوەندە جلوبەرگم نییە - دوو دەست جین، دوو تیشێرت بەڵام کەنتۆرێکی پڕ لە پێڵاوی پاژنە عانە، پیلاوی هاوینە، پێڵاوی یاری تێنس و بووتم هەیە، سەرەڕای ئەوەش هەست دەکەم، هیچم نییە لە پێی بکەم. کە منداڵ بووم دیقم کردبوو بۆ پێڵاو، بەڵام هەموو منداڵەکان لە خێزانەکەماندا جلی نەبوو و بەتایبەتی پارە نەبوو بۆ کڕینی پێڵاو. لەگەڵ ئەوەش خەوم دەبینی بە پێڵاوی چەرمی هاوینەی قایش و ئاوزەنگی جوانەوە، وەك ئەوەی دایکم لەپێی دەکرد. چەند حەزم دەکرد جوتێ پێڵاوی ئاسودە لەپێکەم و چاودێری ئاژەڵەکانم بکەم، بەبێ ئەوەی نیگەرانی بەرد و دڕك، مار و دووپشك بم. هەمیشە قاچم ڕوشاو و پەڵەی پێوە بووە، و هەتا ئێمڕۆش جێگای ڕەشی برینداری پێوەیە. جارێکیان

درکێك تەواو چووبووە قاچمەوە، هەندێك جار تیایدا دەشكا. لە بیاباندا نە دکتۆرمان هەبوو نە دەرمان بۆ تیمارکردنی برین. بەڵام دەبوو هەر بڕۆین، چونکو دەبوو چاودێری ئاژەڵەکان بکەین. کەس نەی دەوت، ' ناتوانم.' ئاسایی دەمان کرد، بۆ سبەی بەیانی بە شەلە شەل دەچوینە دەرێ و بە باشترین شێوە دەمان کرد.

یەکێك لە مامەکانم زۆر دەوڵەمند بوو.ناوی مامە ئەحمەد بوو، لە شاری *گالکایو* دەژیا، بەڵام حوشترەکانی و باقی ئاژەڵەکانی ئێمە بۆیمان بەخێودەکرد. منیان پەسەند کردبوو بۆ چاودێریکرنی بزنەکانی، چونکو هەردەم کارم دڵسۆزانە ئەنجام دەدا، لەوە دڵنیا بوون کە بەباشی ئەیان لەوەڕێنم و ئاویان دەدەمێ و ئەو پەڕی هەوڵئەدەم بەدوور بن لە دز و جەردە. ڕۆژێکیان کە تەمەنم نزیك حەوت ساڵ بوو، مامە ئەحمەد هات بۆ سەردانمان و پێم وت، 'گوێگرە، دەمەوێت پێڵاوم بۆ بکڕیت.'

سەیری کردم و پێکەنی. 'دەی، دەی، زۆر باشە. بۆت پەیدا دەکەم.' دەزانم سەرسام بوو، چونکو زۆر نائاسایی بوو بۆ کچێك داوای هەرچی شتێك بکات، بەتایبەتی شتێکی زیادەی وەك پێڵاو.

پاش ماوەیەك باوکم منی برد بۆ لای. بە پەرۆش بووم، چونکو ئەو ڕۆژە بوو کە دەبووم بە خاوەنی یەکەمین جوتە پێڵاوی خۆم. هەر لە یەکەمین هەلدا، بە شوروشەوقەوە وتم، 'باشە، بۆت هێناوم؟'

مامم وتی، 'نا، پێمە' و پاکەتێکی دامێ. پێڵاوەکانم گرت بە دەستمەوە و تاقیم کردەوە، جوتێ پێڵاوی لاستیکی هاوینە بوو بە قایش و ئاوزەنگیەوە. پێڵاوێکی چەرمی جوان نەبوو وەك ئەوەی دایکم، بەڵام هەرزان و ڕەنگی زەرد بوو. نەمدەتوانی باوەڕ بکەم.

'ئە ئەمە پێڵاوەکانمە؟ !' هاوارم کرد و هەڵم دا بۆی. کاتێك پێڵاوەکان بەر سەروچاوی مامم کەوت، باوکم ویستی خۆی تووڕە بکات، بەڵام ئەم جارە بۆی نەچووەسەر - دایە قاقای پێکەنین.

مامم بە باوکمی وت، 'باوەڕ ناکەم. چۆن ئەم منداڵەت پەروەردە کردووە؟'

دەستم کرد بە شەڕکردن لەگەڵیدا، پیامدا کێشا، چونکو زۆر تووڕە بووم، کەللەیی بووبووم. 'بۆ ئەم بلحە زەحمەتی زۆرم کێشاوە!' قیڕانم. 'ئەو هەموو کارەم بۆ تۆ کرد، بۆ ئەمە بوو؟ بۆ وەرگرتنی جووتێ پێڵاوی لاسیکی هەرزان بوو؟ ئاخ !! باشترە بە پێی پەتی بڕۆم - بە پێی پەتی دەڕۆم تا قاچم خوێنی لێبێت پێشئەوەی ئەو پاشەڕۆیە لە پێبکەم!' و هێمایەکم بۆ دیارییەکەی کرد.

مامە ئەحمەد تەنها تەماشای دەکردم، پاشان چاوی هەڵبڕی بۆ ئاسمان و لەبەرخۆیەوە وتی، 'قورم بەسەر.' سەری دانەواند، پێڵاوەکانی هەڵگرتەوە و لەگەڵ خۆی بردیەوە بۆماڵەوە.

هەرچی چۆنێك بوو، ڕازی نەبووم هەروا بە ئاسانی دەستهەڵگرم. لەو ڕۆژەوە، هەر خزمێك، هاوڕێیەك یان نائاشنایەك بچوایە بۆ گالکایۆ، من پەیامی خۆمم دەنارد بۆ مامم: 'واریس پێڵاوی دەوێت!' بەڵام دەبوو چەند ساڵ چاوەڕوان بکەم تا خەوەکەم بێتەدی. هەرچی چۆنێك بوو لەو ماوەیەدا هەروا بەردەوام بووم لە بەخێوکردنی بزنەکانی مامم و یارمەتی دانی خێزانەکەمان بە چاودێریکردنی گەلە ئاژەڵ، بە پێی پەتی هەزاران میل ڕۆیشتم.

چەند ساڵ پێش کێشەی پێڵاو لەگەڵ مامە ئەحمەد، کاتێك کچێکی بچوك بووم، تەمەنم نزیك چوار ساڵ بوو، ڕۆژێك میوانێکمان هات. پیاوێك بوو بە ناوی *گوبان*، هاوڕێیەکی باشی باوکم بوو و جاروبار سەردانی دەکردین. لە زەردەپەڕی ئێوارەدا ڕاوەستابوو قسەی لەگەڵ دایك و باوکمدا دەکرد، تا لە کۆتاییدا دایکم لە ئاسمان وورد بووەوە بەدوای هەڵهاتنی ئەستێرە گەشی ماقال هیدهید و پێی وتم، کاتی هێنانەوەی بەرخەکانە. گوبان وتی، 'ئۆی، بۆ ڕێگام پێنادەی ئەم کارەت بۆ بکەم؟ واریس دەتوانێت یارمەتیم بدا.'

هەستم بە شکۆیی کرد لەبەرامبەر کوڕەکاندا، کە من هەڵبژێردرام یارمەتی هاوڕێی باوکم بدەم لە پەیوەند بە ئاژەڵەکاندا. پیاوەکە دەستی گرتم و بەلای پەچەکەدا تێپەڕین و دەستمان کرد بە کۆکردنەوەی ڕانەکە. ئاسایی خۆم بوومایە وەك ئاژەڵی کێوی خێرا بە هەموو شوێنێکدا ڕام دەکرد، بەڵام دنیا تاریکی دەکرد و چونکە دەترسام، لە گوبان دوورنەکەوتمەوە. لەپڕ چاکەتەکەی داکەند و لەسەر لمەکە ڕایخست و لەسەری دانیشت. بە سەرسامییەوە تەماشایەکم کرد و ناڕەزایەتم دەربڕی: 'بۆچی دادەنیشیت؟ خەریکە تاریك دادێت - دەبێت ئاژەڵەکان کۆکەینەوە.'

'کاتمان هەیە، لە خولەکێکدا کۆیان دەکەینەوە.' هەستا و جێگایەکی لەتەنیشت خۆی لەسەر چاکەتەکە خۆشکرد بۆ من. 'وەرە دانیشە.'

بە نابەدڵییەوە چووم بۆ لای. چونکو وەك مندالان هەمیشە حەزم لە چیرۆك کردووە، وامزانی ئەمە هەڵیکی باشە بۆ گوێگرتن لە چیرۆکێك. 'چیرۆکم بۆ دەگێڕیتەوە؟'

گوبان دەستی هێنایەوە بە چاکەتەکەیدا. 'ئەگەر دانیشیت، چیرۆکێکت بۆ دەگێڕمەوە.' هەرکە لەتەنیشتی دانیشتم، هەوڵی دا بەپشتا پاڵم پێوە بنێت بۆ دواوە بۆسەر چاکەتەکەی. 'نامەوێ پاڵکەوم، دەمەوێ چیرۆکێکم بۆ بگێڕیتەوە،' کەللەرەقانە پێم داگرت و بە دانیشتنانەوە مامەوە.

'دەی، دەی.' دەستی خستە سەر شانم بە قایم پاڵی پێوەنام. 'پاڵکەوە، تەماشای ئەستێرەکان بکە و چیرۆکێکت بۆ دەگێڕمەوە.' پاڵکەوتم سەرم کەوتە سەر چاکەتەکە و قاچم خستە ناو ساردەکەوە و تەماشای ڕێگای کاکێشانی گەشاوەم کرد. کاتێك شینی ئاسمان بەردو ڕەشی دەچوو، بەرخەکان بەدەورماندا ڕاکە ڕاکەیان بوو، لە تاریکیدا باڕەیان دەهات و منیش بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی بیستنی چیرۆك بووم. لەپڕ دەموچاوی گوبان هاتە نێوان من و ڕێگای کاکێشان، لەسەر ئەژنۆ لەنێوان هەردوو لاقمدا دانیشت و دەستی هێنا بەو پارچە کراسە بچوکەی کە بەدەوری

ناوقەدمەوە بوو. پاشان هەستم کرد شتێکی ڕەقی تەڕ پاڵی بە زێمەوە نا. لەپێشدا لەجێگای خۆم سست بووم، نەم دەزانی چی ڕوودەدا، بەلام بۆم ڕۆشن بوو شتێکی زۆر خراپ لە ئارادایە. پالپێوەنانەکە پەرەیگرت تا بوو بە ئازارێکی تیژ.

'دایکمم دەوێت!' لەپڕ ئاوێکی شلی گەرمم پیارژا و بۆنێکی تیژی قێزهێنەر هەوای شەوی پڕکرد. 'میزت پیاکردم!' لەترساندا قیژاندم. هەستامە سەرپێ و بە کراسەکەم ئەو ئاوە بۆگەنەم سڕی بە لاقمەوە.

'نا، نا، هیچ نییە،' بۆ ئارامکردنەوەم بە گوێمدا چرپانی و قۆڵی گرتم. 'تەنها دەمویست چیرۆکت بۆ بگێڕمەوە.' خۆم ڕاپسکان و بۆ لای دایکم ڕامکرد، گوبانیش بەدوامدا ڕای کرد بەمەبەستی گرتنم. کە دایکمم بینی لەبەر ئاگرەکە دانیشتبوو، تیشکی پرتەقالی ئاگرەکە بەسەر ڕوویەوە دەدرەوشایەوە، ڕامکرد بۆلای و خۆم خستە باوەشێوە.

'چی بووە، واریس!' دایکم بە شڵەژاوییەوە وتی. گوبان بە هەناسەبڕکێ گەیشتە لام و دایکم تەماشایەکی کرد. 'ئەوە چی ڕوویداوە لێی؟'

گوبان بێمەبەست پێکەنی و دەستێکی لێڕاوەشاندم. 'ئوی، هەوڵمدا چیرۆکێکی بۆ بگێڕمەوە کەچی ترسا.' قایم باوەشم بە دایکمدا کرد. ویستم بە دایکم بڵێم هاوڕێکەی باوکم چی پێکردوم، بەلام وشە نەدەهاتە سەر زارم - نەم دەزانی ئەوەی ڕوویداوە چی بووە. لە ڕووناکایی ئاگرەکەدا تەماشای دەموچاوە زەردەخەناوییەکەیم دەکرد، دەموچاوێك کە لە ساڵانێکی تردا دەبێت بۆ چەند جاری تر بیبینمەوە، کە هەردەم بە بینینی ڕقم هەڵدەسێت.

دایکم دەستی دەهێنا بە قژمدا، کاتێك سەرم لە ڕانی توند دەکرد. 'واریس، باشە. ئەوە تەنها چیرۆکێك بووە، دڵەکەم. بە ڕاستی نەبووە.' ڕووی لە گوبان کرد و وتی، 'بەرخەکان لەکوێیە؟'

## بەشی سێهەم
## ژیانێکی کۆچەری

لەبەرئەوەی لە ئەفریقادا گەورە بووبووم، ئەو شارەزاییيەم نەبوو لە بارەی مێژووی بەشەکانی تری جیهانەوە. زمانی سۆماڵی تا ساڵی 1973 پیتی نووسینی نەبوو، بەو هۆیەوە فێری خوێندن و نووسین نەدەبووین. زانیاری - هۆنراوە یان داستانی نێو خەڵك دەماودەم دەهاتەخوارەوە، یان زیاتر لە رێگای دایکان و باوکانەوە ئەو شارەزاییيانەیان فێردەکردین کە پێویست بوو بۆ ژیان. بۆ نمونە، دایکم فێری ئەوەی کردم چۆن لە گیای ووشك سەبەتە دروست بکەم، کە ئەوەندە توند و تۆڵ بێت شیری تیایدا هەلگیرێت، باوکم فێری کردین چۆن چاودێری ئاژەڵەکانمان بکەین و دڵنیابین لەوەی لەش ساغن. کاتێکی وامان تەرخان نەدەکرد سەبارەت بە رابوردوو قسەبکەین کەس کاتی ئەوەی نەبوو. هەموو شتێك بۆ ئیمرۆ بوو، ئیمرۆ چی دەکەین؟ هەموو منداڵەکان هاتوونەتەوە؟ چۆن نان دەخۆین؟ لەکوێ دەتوانین ئاو بدۆزینەوە؟

لە سۆماڵ، بە شێوەیەك ژیانمان دەکرد، کە وەك باو و باپیرانمان بۆ هەزاران ساڵ ژیانیان کردبوو، گۆڕانکارییەکی کاریگەر نەبوو بۆ ئێمە. وەك کۆچەرییەك، لەگەڵ کارەبا، تەلەفون، یان ئۆتۆمبیل نەدەژیاین، ئیتر باسێك لە کۆمپیوتەر، تەلەفزیۆن یان سەفەر بە فڕۆکە هەر مەکە. ئەم ڕاستییانە لەگەڵ ئەوەی کە ئێمە پێمان دادەگرت لەسەر ژیانێکی هەر ئێستایی، بۆچوونێکی پێداین سەبارەت بە کات، کە تەواو جیاوازە لەوەی باوە لە جیهانی ڕۆژئاوادا.

وەك باقی ئەندامی خێزانەکەمان، هیچ بۆچونێکم نییە لەوەی تەمەنم چەندە، دەتوانم بیخەملێنم. منداڵێك لە وڵاتەکەی مندا لەدایك ببێت، گەرانتییەکی کەمی هەیە تا ساڵێکی تر زیندو بمێنێت، لەبەرئەوە بیرۆکەی ڕۆژی لەدایکبوون ئەو

بایەخەی پێنادرێت وەکو وڵاتانی تر. کاتێك منداڵ بووم، ئیشمان بە کەلێندەر، کاتژمێر و ڕۆژژمێر نەبوو. لەجیاتی ئەوە ژیانمان پەیوەندی خواردبوو بە وەرز و ڕۆژەوە، بۆ پلاندانانی گەڕان بە دوای باراندا، ڕێکخستنی کارەکانمان بەپێی درێژی رووناکی ڕۆژ. ڕۆژمان بەکاردەهێنا بۆ دیاریکردنی کات. ئەگەر سێبەر بکەوتایەتە خۆرئاواوە، ئەوە بەیانی بوو، کاتێك دەجوڵاو دروست دەچووە ژێر خۆم، ئەوە نیوەڕۆ بوو. کاتێك سێبەرەکەم دەچووە ئەو لا، ئەوا پاشنیوەڕۆ بوو. کە ڕۆژ درێژەی دەکێشا، هەروەها سێبەرەکەم درێژتر دەبووەوە - نیشانەی چوونەماڵەوە بوو پێش تاریك بوون.

کاتێك بەیانیان لەخەو هەڵدەساین، بڕیارمان دەدا ئەو ڕۆژە چی بکەین، پاشان ئەو ئەرکەمان بە باشترین شێوە ئەنجامدەدا تا تەواو دەبوو یان تا دنیا هێندە تاریك دەبوو چاومان نەیدەبینی. ئەو بیرۆکەیەمان نەبووە، کە بەیانی هەڵسای تەواوی ڕۆژەکەت بەرنامەڕێژی کرابێت. لە *نیویۆرك* وا باوە خەڵك ڕۆژمێرەکەی دەردەهێنێت و دەپرسێت، 'کاتت هەیە بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ لە چواردەی مانگدا - یان بۆ پانزەی مانگ، دەڵێی چی؟' منیش وەڵامم دەدایەوە' بۆچی ڕۆژێك پێش ئەوەی کە بەنیازی بمبینیت، تەلەفونم بۆ ناکەی؟ لەگەڵ ئەوەی چەند جار کاتی دانیشتنەکانم یاداشت دەکرد، کەچی هەر نەمدەتوانی لەگەڵ بیرۆکەکەدا ڕابێم. کاتێك هاتم بۆ لەندەن، سەرسام دەبووم لەوەی کەسێك تەماشای کاتژمێری دەستی دەکرد و پاشان هاواری لێهەڵدەستا، 'دەبێت هەر ئێستا بڕۆم!' هەستێکم لا دروست بوو، هەر کەسێك بۆ هەر شوێنێك بچێت، دەبێت زوو بکەوێتە خۆی، هەموو کارێك بە پێی کات ڕێکخراوە. لە ئەفریقادا تەنگەتاوی نییە، بێئارامی نییە. کاتی ئەفریقا زۆر زۆر لەسەرخۆیە، زۆر ئارامە. ئەگەر وتت 'سبەینێ دەوری نیوەڕۆ دەتبینم' بە واتای کاتژمێری چوار یان پێنج دێت. هەتا ئیمڕۆش نامەوێت کاتژمێر لەدەستبکەم.

لە ساڵانی منداڵیمدا لە سۆماڵ، هەرگیز بۆم پێش نەهاتبوو کە پێشبینی داهاتوو بکەم، یان ئەوەندە ئاوڕ لە ڕابوردوو بدەمەوە، پرسیار بکەم 'ئەرێ دایە، تۆ چۆن گەورە بوویت؟' سەرئەنجام ئەمە بوو بەوەی کە ڕابوردووی خێزانەکەمان نەزانم، بەتایبەتی کە من هەر لە منداڵییەوە ماڵەوەم جێهێشتوە. هەمیشە بە پەرۆشم بمتوانیایە بگەڕێمەوە و ئەم پرسیارانەم لە دایکم بکردایە - لەدایکمم بپرسیایە، ژیانی چۆن بووە کاتێك کچێکی منداڵ بووە، یان پرسیارم لێبکردایە، دایکی لە کوێوە هاتووە، یان چۆن باوکی مردووە. نیگەرانم چونکو لەوانەیە هەرگیز ئەم ڕاستیانە نەزانم.

هەرچی چۆنێك بێت، شتێك لەبارەی دایکمەوە دەزانم ئەویش ئەوەیە، کە زۆر جوان بوو. لێم ڕۆشنە منیش وەك هەر کچێکی نموونەیی، دایکمم پێجوانە، بەڵام ئەمە ڕاستە. دەموچاوی لە پەیکەری *مۆدیگلیانی* دەچوو، پێستی زۆر ڕەش و ساف، کە لە مەرمەڕی ڕەشی سافکراو دەچوو. چونکو پێستی دایکم ڕەشی خەڵوزی بوو و دانەکانیشی سپی دەکردەوە، لە شەودا کاتێك زەردەخەنە دەیگرت، تەنها شتێك کە دەتبینی دانە شەوقدارەکانی بوو، وەك ئەوەی لە شەودا لەخۆیەوە سەر هەوا بکەوێت. قژەکەی درێژ و ڕێك، زۆر نەرم، چونکو هەرگیز شانەمان نەبوو، هەر بە پەنجەکانی دای دەهێنا. دایکم باڵا بەرز و باریکەلە بوو، ئەمەی بۆ هەموو کچەکانی جێهێشتبوو.

ڕەفتاری زۆر لەسەرخۆ بوو، زۆر بێدەنگ. بەڵام کاتێك دەستی دەکرد بە قسەکردن، بێسنوور هەزەلی بوو و زۆر پێدەکەنی. نوکتەی دەگێڕایەوە، هەندێکیان پێکەنیناوی بوون، هەندێکی تریان لەڕاستیدا قسەی قۆڕ بوون، هەندێکی تریان هیچ بوون تەنها بۆ پێکەنینی ئێمە بوون. تەماشای دەکردم و دەی وت، 'واریس، بۆچی چاوەکانت لە دەموچاوتدا ونبووە؟' بەڵام خۆشترین گاڵتە لای ئەوە بوو بانگم کات

*ئافدۆهۆل*، کە بە واتەی 'دەم بچکۆلە' دێت. دایکم بێهۆ تەماشای دەکردم و دەی وت، 'ئەرێ، ئافدۆهۆل، بۆچی ئەوەندە دەمت بچوکە؟'

باوەڕم پێبکەن، باوکم زۆر قۆز بوو، خۆشی ئەوەی دەزانی. نزیك شەش پێ باڵای بوو، باریك و کەمێك لە دایکم کاڵتر بوو، قژی قاوەیی و چاوانی قاوەیی کاڵ. باوکم بەخۆیەوە دەنازی، چونکو دەیزانی جێگای سەرنجە. هەردەم تەنگی بە دایکم هەڵدەچنی، 'ئەگەر تۆ نەبوویتایە دەمتوانی ژنێکی تر بهێنم -' و پاشان هەرچی شتێك گونجاوی گاڵتەکە بوایە، ئیدامەی دەدا. یان دەی وت ' ببینە، ئیتر لێرە بێزار بووم. دەچم ژنێکی تر دەهێنم ...' دایکیشم دەکەوتە تورە کردنی ئەو، 'بڕۆ. بزانم دەتوانیت چیت لەدەست دێت.' بەڕاستی یەکتریان خۆشدەویست، بەلام بەداخەوە ڕۆژێك ئەم شەڕە دەنوکانە هاتەدی.

دایکم لە مەقادیشۆی پایتەختی سۆماڵ، گەورە بووبوو. باوکم لە شوێنێکی تر کۆچەر بووە و ژیانی هەر گەڕان بەناو بیاباندا بووە. کاتێك دایکم باوکمی بینیوە، زۆری پێجوان بووە و لەو باوەڕەدا بووە، کە ژیان لەگەڵیدا وەك کۆچەرێك لە خەیاڵێکی ڕۆمانسی دەچێت. خێرا بڕیار دەدەن زەماوەند بکەن. لەبەرئەوەی باوکی دایکم مردووە، باوکم دەچێت بۆلای نەنکم و خوازبێنی دایکم دەکات. نەنکم دەڵێت، 'نا، نا، بە هیچ شێوەیەك نا.' ڕووی لە دایکم کردبوو، وتبووی، 'ئەو تەنها گەڕۆکێکە!' لەوە نەدەچوو نەنکم ڕێگا بدات بە کچە جوانەکەی ژیانی خۆی بشێوێنێت بۆ بەخێوکردنی حوشتر لە چۆڵەوانی لەگەڵ پیاوێك، ئەویش پیاوێکی بیابانی! هەرچی چۆنێك بوو، کاتێك دایکم تەمەنی نزیك شانزە ساڵ بوو، هەڵهات و شوویکرد بە باوکم.

ڕۆیشتن و چوونە ئەوسەری وڵات، لەگەڵ خێزانی باوکمدا ژیان، کە ئەمە کۆمەڵێك گرفتی بۆ دایکم دروستکرد. خێزانەکەیان پارە و دەسەڵاتیان هەبوو، دایکم هیچ شتێکی لەبارەی ئەم جۆرە ژیانە سەختەی کۆچەرییەوە، نەدەزانی. گرفتی

گەورە ئەوە بوو، باوکم سەر بە خێڵی *دارۆد* بوو و دایکم سەر بە خێڵی ***هاویاه***. هەروەك دانیشتوانی ئەمریکا، هاووڵاتیانی سۆماڵی دابەش بوون بەسەر خێڵی جۆراوجۆردا، هەر یەکە وەفادارییەکی توندی هەیە بە یەکێکیانەوە. ئەم وفادارییە خێڵەکییە لە تەواوی مێژوومانددا سەرچاوەی شەڕ بووە.

ڕقەبەرایەتییەکی گەورە هەیە لە نێوان دارۆدییەکان وهاویاهییەکاندا، خێزانی باوکم هەردەم هەڵسوکەوتیان لەگەل دایکم خراپ بووە، وایان سەیر کردووە کە ڕەوشتی لەخوارەوەیە، لەبەرئەوەی سەر بە خێڵێکە جیاوازە لە خێڵەکەی خۆیان. دایکم تا ماوەیەکی دوورودرێژ تەنها بووە، بەڵام دەبوو خۆی بگونجێنێت. پاش ئەوەی لە ماڵەوە ڕام کرد و لە خێزانەکەمان جیابوومەوە، تێگەیشتم کە دەبێت چ ژیانێکی هەبووبێت، ئەو هەمووە لە نێو دارۆدییەکاندا تەنها بژی.

سکوزاو و منداڵبوون و بەخێوکردنیان، خۆشەویستییەکی دا بە دایکم، کە لەلایەن خەلکەکەی خۆیەوە لەدەستی دابوو. بەڵام ئێستا کە گەورە بووم و بیری لێدەکەمەوە، دایکم مەبەستی چیی بووە لە دروستکردنی دوانزە منداڵ. بیرم دێت کە دایکم سکی پڕ دەبوو، لەپڕ دیار نەدەما و بۆ چەند ڕۆژ نەمان دەبینی. پاشان دەردەکەوت - بە منداڵێکی بچوکەوە. بە تاقی تەنیا خۆی لە بیاباندا وندەکرد و منداڵەکەی دەبوو، لەگەڵ خۆیدا شتێکی تیژی هەڵدەگرت بۆ بڕینی ناوکەکەی. جارێکیان کە خۆی ونکرد، بەدوای ئاودا ناچاربووین دەوارەکەمان کۆکەینەوە و بکەڕێین. چوار ڕۆژی پێچوو تا ئێمەی دۆزییەوە، بە منداڵێکی ساواوە هەموو بیابان گەڕابوو بە دوای خێزانەکەیدا.

هەمیشە هەستم دەکرد، دایکم منی لەناو هەموو منداڵەکانیدا، لا پەسەندتر بوو. پەیوەندییەکی بەهێزی لەیەك تێگەیشتنمان هەبووە و تا ئێستاش ڕۆژ نییە لە ژیانمدا بیر لەوە نەکەمەوە، هیوادارم هیچی لێنەیەت تا بتوانم کارێکی بۆ بکەم. وەك

منداڵ هەمیشە ویستومە نزیکی دایکم بم و هەموو ئێوارێیەك پەلەم بووە بگەمە ماڵەوە و لە تەنیشتیدا دانیشم و دەست بە قژمدا بهێنێت.

دایکم سەبەتەی جوانی دەچنی، وەستاییيەکی چەند ساڵی دەویست تا فێری ببیت. چەند کاژێر خەریکم بوو تا فێری کردم، چۆن کوپی بچوك بچنم کە بتوانم شیری پێبخۆمەوە، بەڵام هەوڵم بۆ دروستکردنی شتی گەورە، هیچ کات وەك ئەوەی دایکم دەرنەچوو. سەبەتەکانی من نارێکوپێك و کونی زۆریان تیایدا بوو.

حەزی ئەوەی لەگەڵ دایکمدا بم و زانینخوازانەی سروشتی منداڵانە، وای لێکردم ڕۆژێکیان بە دزییەوە دوای دایکم بکەوم. دایکم مانگی جارێك نیمەی جێدەهێشت و پاشنیوەڕۆ خۆی بەتەنها دەڕۆیشت. جارێکیان پێم وت، 'بڕیارم داوە، بزانم تۆ چی دەکەیت؟' وەڵامی دامەوە، کە خەریکی کاری خۆمبم. لە ئەفریقادا منداڵ بۆی نییە خۆی لە کاروباری دایك و باوکیدا هەڵقورتێنێت. هەروەك ئاسایی پێی وتم، لە ماڵەوە بمێنمەوە و ئاگاداری منداڵە وردەکان بم. بەڵام کە ڕۆیشت بەپەلە لە دوورەوە دوای کەوتم، خۆم لەپشتی دەوەنەکانەوە دەشاردەوە بۆئەوەی نەمبینێت. دایکم چاوی بە پێنج ژن کەوت، کە ئەوانیش لە شوێنی دوورەوە هاتبوون. لەژێر دارێکی گەورەی جواندا دانیشتن بۆ چەند کاژێری کاتی سەرخەوی نیوەڕوان، کە ڕۆژ زۆر گەرم دەبێت ئیتر کاری تری تیادا ناکرێت. لەو کاتانەدا خێزان وچان دەدا و ئاژەڵ مۆڵ دەخوا، بەم شێوەیە ئەو تۆزە کاتە بۆ خۆیان دەهێڵنەوە. لە دوورەوە دیار بوون، هەر وەك مێروولە سەرە ڕەشەکانیان کردبوو بە یەکدا، دەمبینیين خەریکی گەنمەشامی خواردن و چا خواردنەوە بوون. لەبەرئەوەی زۆر دووربووم لێیانەوە نەم دەزانی لەبارەی چییەوە قسە دەکەن. لەکۆتاییدا بڕیارم دا، ئەو سەرکەشییە بکەم و خۆم ئاشکرا بکەم، زیاتر لەبەرئەوەی دەمویست بەشداری خواردنەکەیان بکەم. چاوبەرێژانە لێیان چوومە پێشەوە و لەبەردەمی دایکمدا ڕاوەستام.

'ئەوە لە کوێوە هاتی؟' دایکم هاواری لێهەڵسا

'دوای تۆ کەوتم.'

'خراپی، کچێکی گێلی،' دایکم تورە بوو.

بەڵام ژنەکانی تر هەموو پێکەنین و هاواریان کرد، 'ئۆیی، تەماشای ئەم کچە بچوکە قسەزانە بکەن. وەرە ئێرە، دولبەرم....' ئینجا دایکم ئارام بۆوە و رێگای دام دەست بەرم بۆ تۆزێك گەنمەشامی.

کاتێك لەو تەمەنەدا بووم، هیچ بۆچوونێکم نەبوو سەبارەت بە جیهانێکی تر لە دەردوەی ژیانی خۆمان لەگەڵ بزن و حوشترەکانماندا. بێ چوونە دەرەوە بۆ وڵاتانی جۆراوجۆر، بێ تەلەفزیۆن، کتێب یان سینەما، گەردونی من ئەوە بوو کە هەموو رۆژێك لە چواردەوری خۆم دەمبینی. بێگومان هیچ بۆچوونێکم نەبوو لەسەر دایکم، کە لە ژیانێکی جیاوازدوە هاتبوو. پێش سەربەخۆیی سۆماڵ لە 1960دا، ئیتالیا هەرێمی باشوری داگیرکردبوو. وەك سەرئەنجامێك، کەلتوری مەقادیشۆ، شێوازی خانوو دروستکردن و کۆمەڵگا، کاریگەری ئیتالیای زۆر پێوە دیارە، بەو هۆیەوە دایکم زمانی ئیتالی دەزانی. هەندێك جار کە تورە دەبوو، رێزێك جنێوی ئیتالی لەدەم دەردەچوو. 'دایە' بە سەرسامییەوە تەماشام دەکرد. 'ئەوە چی دەڵێیت؟'

'ئۆی، ئەوە ئیتالییە.'

'ئیتالی چییە؟ واتای چییە؟'

'هیچ خەریکی کاری خۆت بە' و بەدەست راوەشاندنێك دووری دەخستمەوە.

دوایی بۆم دەرکەوت هەروەك چۆن ئۆتۆمبیل و خانووبەرەم بۆ دەرکەوت - کە ئیتالیا بەشێکە لە گەردون لەدەردوەی دەوارەکەمان. هەندێك جار ئێمەی منداڵان پرسیارمان لە دایکمان دەکرد، سەبارەت بە بریاری شووکردنی بە باوکمان. 'بۆچی دوای ئەو پیاوە کەوتی؟ سەیرکە چ ژیانێکت هەیە، لەکاتێکدا برا و خوشکەکانت لە هەموو کون و قوژبنێکی جیهاندا هەن باڵوێزن و تۆش چییت! بۆچی لەگەڵ ئەم پیاوە بێسەر و شوێنە هەڵهاتی؟' وەڵامی دەدایەوە کە شەیدای باوکم بووە و بریاری

داوە لەگەڵی هەڵبێت بۆئەوەی پێکەوە بژین. هەرچی چۆنێك بوو، هێشتا دایکم ژنێکی بەهێزە، سەرەڕای هەموو شتێك دەیبینم خۆی گونجاندووە، هەرگیز نەم بیستووە گلەیی بکات. هەرگیز نەم بیستووە بلێ، 'ئیتر وەڕس بووم،' یان 'ئیتر لەمە زیاتر نایکێشم.' دایکم ئاسایی بێدەنگ و زۆر بە وره بوو. پاشان لەپڕ بە نوکتەیەکی قۆڕ دەیهەژاندین. ئاواتەخوازم ڕۆژێك وەك دایکم بەهێز بم، ئینجا ئەوسا دەتوانم بڵێم لە ژیاندا سەرکەوتووم.

خێزانەکەمان لە هەڵبژاردنی پیشەدا نموونەیی بوون، بەهۆی ئەوەی زیاتر لە سەدا شەستی خەڵکی سۆماڵی شوانداری کۆچەرییە، نانی ڕۆژانەیان لە بەخێوکردنی ئاژەڵ دەردەهێنن. هەندێك جار باوکم دەچووە گوند و ئاژەڵێکی دەفرۆشت بەخاتری کڕینی فەردەیەك برنج، کوتاڵ بۆ جلوبەرگ یان بەتانی. ناوبەناو، هەر کەسێك بچوایە بۆ شار، شمەکەکانی پیادا دەنارد بۆ فرۆشتن و لەبەرامبەریدا، بە پێی لیستێك داوای کڕینی کەلوپەلی دەکرد.

ڕێگایەکی تر بۆ پارە پەیداکردن کۆکردنەوەی بخورد بوو. بخورد دوکەلێکە لە ئینجیلدا هێمای بۆ کراوە، کە جادوگەر وەك دیارییەك بردویەتی بۆ موسای منداڵ. بۆنێك کە هەیەتی تا ئیمرۆ وەك کالاّیەك نرخی هەیە، هەروەك لە سەردەمی کۆنەوە بوویەتی. بخورد دارێك دروستی دەکات، کە لە بەرزایەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتدا دەڕوێت. دارێکی بچوکی جوانە، بە بەرزایی نزیك پێنج پێیە، لق و پۆپەکانی شێوەیەکی کەوانەیی بەخۆیەوە دەگرێ، وەك چەتری کراوە. تەورێکم لەگەڵ خۆم دەبرد و بەئاستەم قڵیشێکم دەکردە قەدی دارەکە - کە ئەوەندە گەورە نەبوو دارەکە لەناوبەرێت - ، تەنها توێکڵی دارەکە بریندار دەبوو. پاشان دارەکە شلەیەکی شیری دەداتە دەرەوە. ڕۆژیك چاوەڕوان دەبووم تا ئەم شلە سپییە وەك لاستیك ڕەق بێت، لەڕاستیدا هەندێك جار وەك بنێشت دەمانجوو کە تامێکی تاڵی

دەدا. ئـەم كلۆیانـەمان لـە زەمیلەیەكـدا كـۆدەكردەوە، پاشـان بـاوكم دەیفرۆشـتن. خیزانەكـەشمان لـە شـەودا بـە ئاگرێـك كـە دەمـانكردەوە، بغوردمـان دەسـوتاند، تـا ئیمرۆش هەر كاتێك بۆنی بە سەرمدا بێت، دەماباتەوە یادی ئەو ئێوارانـە. هەنـدێك جار، لە *مانهاتان*، رێكلامی دوكەڵی وەك بغـورد بەرچاوم دەكـەوێت. بێـچارە بـەدوای تۆزێك یادی ماڵەوە، دەیكڕم بەڵام بەناستەم بۆنەكەی وەك ئەو دەردەچوو و هەرگیز نەددگەیـشت بـەو بۆنـە خۆشـەی لای خۆمـان، كـە لـە ئـاگردانی شـەوانی بیابانـەوە بڵاودەبوەوە.

خێزانەكەشمان لە گەوردییدا نموونەیی بوو لـە سۆماڵدا، كـە ژنـان بـە تێكـڕا هـەر یەكی حەوت منداڵیان هەیە. منداڵان وەك داهـاتووی خانەنـشینی گـەورەكان چـاویان لێدەكرێ، كە چاودێری دایك و باوكیان دەكـەن كاتێـك پـیر دەبـن. منـداڵانی سـۆماڵی رێزێكی بێپایانیان هەیە بۆ دایك و باوك و نەنك و باپیرانیـان، هـیچ كـات جورئـەتی ئەوە ناكەن گەورەییان بخەنە ژێر پرسیارەوە. هەموو ئەوانەی لـە خـۆت گـەورەترن، هەتا برا و خوشكەكانت، دەبێت بـەڕێزەوە هەڵسوكەوتیان لەگەڵدا بكـەیت و دەبێـت بەدوای خواستەكانیانەوە بیت. ئەم ڕاستییە یـەكێك لـەو هۆیانـە بـوو، كـە كـردەوەی هەڵهاتنەكەم بێ سێ و دوو وەك ئابڕووچوونێك چاوی لێدەكرا.

هۆیـەكی تـری گـەورەبوونی خێـزان، بێجگـە لـە نـەبوونی ئـامرازی بـەرگرتن بـە منـداڵبوون، ئەوەیـە تـا ئەنـدامی خێـزان زۆربێـت بـۆ بەشـداری كـار، ژیـان ئاسـانتر دەبێت. هەتا شتێكی بنەڕەتی وەك ئاو - نەك بەشێوەیەكی زۆر یـان پێویـست، تـەنیا ئـاو بەگـشتی پێویـستی بـە كـارێكی كەمـەر شـكێن هەیـە. كاتێـك ئـاوی ناوچـەكانی دەوروپشتمان وشكی دەكرد، باوكم دەكەوتە گەڕان بە دوای ئـاودا. جەوەنـەی گـەورە، كە دایكم لە گیا دروستی كردبـوون، لـە حوشـترەكانی دەبەسـت. مـاڵی جێدەهێـشت و دەڕۆیـشت بـۆ چـەند ڕۆژ هـەتا ئـاوی دەدۆزییـەوە، جەوەنـەكانی پڕدەكـرد لـە ئـاو و دەگەڕایەوە بۆ لای ئێمە. هەوڵمان دەدا لە شـوێنێكدا چـاوەڕوانی بكـەین، بـەڵام هـەر

ڕۆژە گیانکێشانێکی زیاتر بوو کە میل بە میل دەگەڕاین بۆ ئاودانی ئاژەڵەکانمان. هەندێك جار ناچار دەبووین بەبێ باوکمان بجوڵێین، سەرەڕای ئەوەش هەمیشە ئێمەی دەدۆزییەوە، هەرچەند هیچ هێمایەکی ڕێگا و بان یان نەخشە نەبوو، ئەگەر باوکم لە ماڵەوە نەبوایە، ئەگەر بچوایە بۆ لادێ بەدوای خواردندا، دەبوایە یەکێك لە منداڵەکان ئەو کارەی ئەنجام بدایە، چونکو دەبوو دایکم لە ماڵەوە بێت و سەرپەرشتی ئەنجامدانی هەموو کارەکانی بکردایە.

هەندێك جار کارەکەی باوکم دەکەوتە سەر شانی من. دەچووم دەگەڕام بۆ چەند ڕۆژ، هەرچەندێکی بخایاندایە تا ئاوم دەدۆزییەوە، چونکو نەدەبوو بە دەستی بەتاڵ بگەڕێینەوە، هیچ هیوایەکی تر نەبوو. هیچ کەسێك لێت قبوول ناکات بڵێیت 'ناتوانم.' دایکم پێی وتووم ئاو بدۆزمەوە، دەی دەبێت بیدۆزمەوە. کاتێك هاتمە جیهانی ڕۆژئاوا، سەرسام دەبووم کاتێك کەسێکم دەبینی بۆڵەی لێوە دەهات، 'سەرم ئێشێت، ناتوانم کار بکەم.' دەمویست پێی بڵێم، 'ڕێگام پێبدە کارێکی قورست پێبدەم، ئیتر هەرگیز گلەیی ناکەی لە کارەکەی خۆت.'

چەندژنە، کە لە ئەفریقا زۆر باوە، ڕێگایەکی تری فەراهەم کردنی هێزی کارە بۆ ئاسان کردنی سەختی کار، بە زیادکردنی ژمارەی ژن و منداڵ. دایك و باوکم لەمەدا نائاسایی بوون، وەك تەنیا جووتێك کە تا ساڵانێکی زۆر هەر خۆیان بوون. تا لەکۆتاییدا ڕۆژێکیان، پاش ئەوەی کە دایکم دوانزە منداڵی بووبوو، بە باوکمی وت، 'من زۆر پیر بووم... بۆچی ناچی ژنێکی تر بێنی و وچانێکیش بە من بدەیت؟ تەنیا جێم بهێڵە.' نازانم دایکم ئەوەی مەبەست بوو یان نا - لەوانەیە هەرگیز بیری لەوە نەکردبێتەوە، کە باوکم قسەکەی لەسەر حساب دەکات.

بەڵام ڕۆژێکیان باوکم دیار نەما. لەسەرەتاوە وامان دەزانی کە ڕۆیشتووە بەدوای ئاودا یان خواردن، دایکم خۆی سەرپەرشتی هەموو شتێکی دەکرد. پاشئەوەی دوو

مانگ تێپەڕی، هەموو کەوتینە ئەو خەیاڵەوەی کە مردووە. پاشان ئێوارەیەکیان، وەك چۆن لە پڕ وون بوو ئاوا دەرکەوت. هەموو ئێمەی منداڵ لەبەردەمی دەوارەکەدا دانیشتبووین. باوکم بە ئارامی هاتەپێشەوە و وتی، 'دایکتان لە کوێیە؟' پێمان وت هێشتا لەگەڵ ئاژەڵەکاندا لەدەرەوەیە. 'باشە، سڵاو لە هەمووتان،' بە زەردەخەنەوە وتی، 'دەمەوێت ژنەکەم ببینن.' کچێکی بچکۆلەی نزیك تەمەن حەڤدە ساڵی هێنایە پێشەوە - لە من زۆر گەورەتر نەبوو. تەنیا لێی وردبووینەوە، چونکو بۆمان نەبوو هیچ شتێك بڵێین، سەرەڕای ئەوەش نەمان دەزانی چی بڵێین.

ساتێکی تۆقێنەر بوو، کاتێك دایکم هاتەماڵەوە. هەموو منداڵەکان بە پەشۆکاوییەوە چاودڕوانی ئەوەیان دەکرد، چی ڕوودەدا. دایکم تێبینی ژنەکەی نەکرد لە تاریکاییەکەدا. سەیرێکی باوکمی کرد و وتی، 'بڕیارت دا بێیتەوە، وا نییە؟'

باوکم سەرێکی هێنا و سەرێکی برد، سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد. 'ئا، باشە، وایە. بەو بۆنەوە، ژنەکەم ببینە' و دەستی کردە ملی بووکە تازەکەی. هەرگیز دەموچاوی دایکم لە یاد ناچێت لەبەر ڕۆشنایی ئاگرەکە. ڕێك کەوتە سەر زەوییەکە. پاشان تێگەیشت، 'خەلکینە، ئێستا من ئەوم لەدەست دا بەخاتری ئەو کچە بچوك، بچوکە!' دایکم لە بەغیلیدا خەریك بوو گیانی دەرچێت، هەرچەند هەوڵی دەدا خۆی وا نیشان نەدات.

ئێمە هیچ شتێکمان لەبارەی ژنی تازەی باوکمەوە نەدەزانی و نەشمان دەزانی لە کوێوە هاتووە. بەڵام ئەمە بەرگری لەوە نەکرد یەکسەر بنەڕێنێت بەسەر هەموو منداڵەکاندا. پاشان ئەم کچە تەمەن حەڤدە ساڵە کەوتە فەرماندان بەسەر دایکمدا - بەدایکمی دەوت ئەمە بکات، ئەوەی بداتێ، ئەوەی بۆ سازکات. گرژی و ئاڵۆزی بەوپەڕی گەیشت، کاتێك ڕۆژێکیان هەڵەیەکی کوشندەی کرد: زللەیەکی دا لە پیرەی برام.

ئەو ڕۆژەی ئەوە ڕوویدا هەموو ئێمەی منداڵ لە دەوارەکەماندا بووین (هەرکات کۆچمان بکردایە بۆ هەر شوێنێك، درەختێکمان لە نزیك دەوارەکەمان دەدۆزییەوە و دەمان کرد بە 'ژووری' منداڵان). لەژێر ئەم درەختەدا لەگەڵ برا و خوشکەکانمدا دانیشتبووین کە گوێم لە پیرە بوو دەگریا. هەستامە سەرپێ و سەیرم کرد برا بچکۆلانەکەم بەرەو من دێت. دانەویمەوە و دەموچاویم سڕی و پێم وت، 'چییتە؟ چیی ڕوویداوە؟'

'لێی دام - زۆر قایم لێی دام.' هەتا نەمپرسی کێ، چونکو هیچ کەسێك لە خێزانەکەمان لە پیرەی نەدابوو. هەتا دایکم، هەتا هیچ یەك لە خوشك و برا گەورەکانم، هەتا باوکیشم، کە هەمیشە لە باقی ئێمەی دەدا. پێویستیش نەبوو کەس لە پیرە بدات، چونکو لە هەموومان ژیرتر بوو و هەرگیز هاری نەدەکرد. لێدانی براکەم ئەوپەڕی بوو، ئەمەم بۆ قووت نەدەچوو، و چووم گەڕام بە دوای ئەو کچە کەرەدا.

'بۆچی لە براکەمت داوە؟' داوام لێکرد بۆم ڕۆشن بکاتەوە.

' شیرەکەمی خواردۆتەوە،' بە فیزێکەوە وتی، وەك ئەوەی شاژن بێت و شیری ئاژەڵەکان هەمووی هینی ئەو بێت.

'شیری تۆ؟ ئەو شیرە من لە دەوارەکە دامناوە و ئەگەر ئەو بییەوێ، ئەگەر تینوی بێت، دەتوانێت بیخواتەوە. پێویست ناکات لێی بدەیت!'

'ئەیی، دەمت داخە و بڕۆ بە ڕێگای خۆتەوە!' قیژانی و بە دەست ڕاوەشاندن دەری کردم. سەیرێکم کرد و سەرم ڕاوەشاند، هەرچەند تەمەنم نزیك سیانزە ساڵ بوو، دەمزانی هەڵەیەکی گەورەی کردووە.

خوشك و براکانم لەژێر درختەکەدا چاوەڕانیان دەکرد، بە وردیەوە گوێیان دەدا بە بگرە و بەردەی من و باوەژن. کە لێیان نزیك بوومەوە، سەیرێکی دەموچاوی پڕ پرسیاریانم کرد و وتم، 'بەیانی.' هەموو سەریان بۆ لەقاند.

بۆ ڕۆژی دوایی بەخت یاوەری ئێمە بوو، چونکو باوکم ڕایگەیاند کە بۆ دوو ڕۆژ جێمان دەهێڵێت. کاتی سەرخەوشکاندنی نیوەڕۆ ئاژەڵەکانم هێنایەوە ماڵەوە، خوشکێك و دوو برام لە ماڵەوە بوون. 'ژنە تازە بچوکەکەی بابە کۆتایی دێت،' بە وردییەوە کەوتمە ڕوونکردنەوەی هەلومەرجەکە. 'دەبێت پەندێکی وەهای دابەین، ئاقڵی بکەین، چونکە ئەمە دەبێت کۆتایی بێت.'

'باشە، بەڵام چی بکەین؟' عەلی پرسیاری کرد.

'دەیبینی، بەس تۆ وەرە لەگەڵم، و یارمەتیم بدە.' گوریسێکی ئەستوری قایمم هێنا، کە بەکارمان دەهێنا بۆ بارکردنی کەلوپەلەکانمان لە سەر پشتی حوشتر لەکاتی گواستنەوەدا. باوەژنی زەنەقچوومان لە دەوار هێنایە دەرەوە و کێشمان کرد بەرەو دەوەنەکان و زۆرمان لێکرد هەموو جلەکانی داکەنێ. سەرێکی گوریسەکەم بەسەر لقی دارێکی گەورەدا برد و پاشان لە قولەپێ بچوکەکانی باوەژنمان بەست. باوەژن دەمێك هاواری دەکرد و جنێوی پێدەداین، دەمێك دەگریا، کاتێك گوریسەمان ڕاکێشا و سەربەرەوخوار هەڵمان واسی. من و براکانم ئەوەندە گوریسەمان ڕاکێشا تا باوەژن نزیك بە هەشت پێ لە زەوی بەرز بۆوە، بۆئەوەی دڵنیا بین هیچ ئاژەڵێکی کێوی نەتوانێت بیخوات. پاشان گوریسەمان بەست و گەڕاینەوە ماڵەوە، تەنیا جێمان هێشت لەو بیابانە پەلی دەهاویشت و هاواری دەکرد.

بۆ سبەینێ پاش نیوەڕۆ، باوکم ڕۆژێك زووتر دەرکەوت. پرسیاری لە هەموومان کرد ژنە بچۆلەکەی لە کوێیە. هەموومان شانمان هەڵتەکاند و وتمان نەمان دیوە. خۆشبەختانە ئەوەندە دوور هەڵمان وایسبوو، هاتوهاواری نەدەگەیشتە لای ئێمە. 'دەی، دەی،' باوکم وتی و بە گومانەوە تەماشای هەموومانی کرد. تا تاریکیش داهات هیچ ئاسەوارێکی لە ژنە بچکۆلەکەی پەیدا نەکرد. باوکم دەیزانی هەڵەیەکی زۆر گەورە لە ئارادا هەیە و دەستی کرد بە پرسیارکردن: 'کەی بۆ دواجار

بینیوتانە؟ دوێنێ بینیتان؟' پێمان وت لە دوێنێ شەوەوە نەگەڕاوەتەوە ماڵەوە، کە لە ڕاستیشدا هەروا بوو.

باوکم ترس دایگرت و بێئومێدانە کەوتە گەڕان بە هەموو کون و قوژبنێکدا. بەڵام نەیدۆزییەوە تا سبەینێ بەیانی. بووکی باوکم نزیکی دوو ڕۆژ سەربەرەوخوار هەڵواسرابوو، کاتێك کە دایگرت لە پەلوپۆ کەوتبوو. کە باوکم گەیشتە ماڵەوە خەریك بوو لە پێستی خۆی دەهاتە دەرەوە. داوای کرد: 'کێ بەرپرسی ئەمەیە؟' هەمووومان ورتەمان لەخۆمان بڕی و سەیری یەکتریمان دەکرد. بێگومان باوەژن پێی وتبوو. هاتە قسە و وتی، 'واریس ئاگری بن کایە. یەکەم ئەو پەلاماری دام!' باوکم هاتە وێزەی من و دەستی کرد بە لێدانم، بەڵام هەموو منداڵەکان پەلاماریان دا. دەمان زانی هەڵەیە لە باوکی خۆمان بدەین، بەڵام ڕاستییەکەی ئیتر لەوە زیاتر لە تواناماندا نەبوو.

لەو ڕۆژەوە، باوەژنی تازە بوو بە ژنێکی تر. پەندێکی باشمان دا و ئەویش زۆر باش لێی تێگەیشت. لەو بڕوایەدا بووم، بۆ دوو ڕۆژ هاتوچۆکردنی خوێن بەناو مێشکیدا، ئەقڵی هێنابۆوە سەرخۆی و کردبووی بە ژنێکی باش و بەڕەووشت. لەو کاتەوە کەوتە ماچکردنی قاچی دایکم و لەبەردەمیدا وەك کۆیلە ڕادەوەستا. 'شتێك هەیە بتوانم بیکەم بۆت؟ دەتوانم چیت بۆ بکەم؟ نا، نا - من دەیکەم. تۆ دانیشە و پشو بدە.'

لە دڵی خۆمدا دەموت، 'ئاوا دەبێت. دەبوایە لەسەرتاوە هەروا هەڵسوکەوتت بکردایە، تووتکە دەڵە سەگ بەخۆڕایی دەردەسەریت بۆ دروست کردین.' ژیانی کۆچەری ژیانێکی سەخت بوو، هەرچەند بیست ساڵ لە دایکم بچوك تر بوو، بەڵام وەك دایکم بەهێز نەبوو. لەکۆتایدا دایکم بۆی دەرکەوت کە ئەم کچە بچکۆلەیە ئەوە نییە لێی بترسێ.

ژیانی کۆچەری زۆر سەختە، بەڵام پڕیشێتی لە جوانی - ژیانێکە بە سروشتەوە گرێدراوە کە لەیەکتری جیاناکرێتەوە. دایکم بەناوێکی سروشتەوە ناوی نام: واریس بە واتای گوڵی بیابان دێت. گوڵی بیابان لە کەشێکی بێ پیتدا دەڕوێت کە بەدەگمەن شتی تری لێ سەوز دەبێت. هەندێك جار لە وڵاتەکەم بۆ ماوەی ساڵێك باران نابارێت. بەڵام لەکۆتاییدا باران دەبارێت و تەپۆتۆزی زەوی پاك دەکاتەوە و پاشان وەك دەرئاسایەك ئەم گوڵانە پەیدا دەبن. ئەم گوڵانە زەردێکی نارنجی تۆخن و لەبەر ئەو هۆیەشە هەمیشە ڕەنگی زەردم لا پەسەند بووە.

کاتێك کچێك شوودەکات، ژنانی خێڵەکەی دەکەونە بیابان و ئەو گوڵانە کۆدەکەنەوە. وشکی دەکەن و پاشان ئاوی تێکەڵ دەکەن و هەویرێکی لێدروست دەکەن و بەدەموچاوی بووکدا دەیسوون، کە ڕەنگێکی ئاڵتونی گەشی پێدەدات. بە خەنە دەست و قاچی دەنەخشێنن. بە کل چاوی دەڕێژن، بۆئەوەی قووڵ و سێکسی بنوێنێت. هەموو ئەم کەرەستەی ئارایشتانە لە ڕوەك و گیای وەرزی دروست دەکرێن، لەبەرئەوە تەواو سروشتین. پاشان ژنان بە جلوبەرگی ڕەنگ تۆخ - سور، پەمەیی، نارنجی و زەرد - تا زۆرتر بێت باشترە، دەیڕازێننەوە. بەڵام لەوانەیە شتێکی وایان نەبێت، هەندێك خێزان تەواو هەژارن، بەڵام ئەمە مایەی شووردیی نییە. بووك باشترین جل لەبەردەکات، جا هی خۆی بێت یان دایکی، خوشکەکانی یان هاوڕێکانی و شانازییەکی زۆریشی پێوە دەکات - ئەمە تایبەتمەندی هەموو سۆماڵییەکە. ڕۆژی زەماوەند بووکێ بەوپەڕی جوانییەوە بەرەو پیری زاوا دەچێت. جوانییەك کە پیاو بە هەندی نازانێت.

بۆ زەماوەند خەڵکی خێڵ بە دیارییەوە دەچن، دیسان ئەمەش شورەیی نییە، ئەگەر شتێکی تایبەت نەکڕی یان نیگەرانی ئەوە بیت، کە ناتوانی شتێکی باشتر بکەی بە دیاری. ئەو شتە دەدەیت کە هەتە: ڕاخەرێك بۆ نووستن دەچنی بۆیان، یان کوپێکیان پێشکەش دەکەی، یان ئەگەر هیچت لەمانە نەبوو، لەپاش زەماوەندەکە

هەندێك خواردن دەبەیت. شتێك بەناوی مانگی هەنگوین لە کەلتووری ئێمەدا نییە، لەبەرئـەوە ڕۆژی پـاش زەماوەنـد، ڕۆژی کـارە بـۆ ژن و مێـردی تـازە، هـەموو ئـەو دیاریانەیان پێویستە بۆ دەستپێکردنی ژیانی هاوسەرایەتی.

بێجگە لە زەماوەند، ئێمە چـەند ئاهـەنگی ترمـان هەیـە. هـیچ ڕۆژێکـی پـشوومان نییە کە لە ڕۆژژمێردا دیاری کرابێت. لـەجیاتی ئـەوە شـتی ترمـان هەیـە کـە مایـەی ئاهەنگ گێڕانە، وەك چاوەڕوانی درێژی باران. لە وڵاتەکەمدا ئاو زۆر پیرۆزە، لەگەڵ ئەوەی کە زۆر بنەڕەتییە بۆ ژیـان. ئـەو کۆچـەرییانەی لـە بیابانـدا دەژیـن، ڕێزێکـی زۆری بێپایانیـان هەیە بۆ ئاو، هەر تنۆکێکی وەك کاڵا تەماشا دەکەن، من تا ئیمرۆش ئاوم خۆشدەوێت. ئاسایی لەزەتێکی زۆر لە بینینی دەبینم.

هەنـدێك جـار، بێبـارانی مـانگ لـە دوای مـانگ، پەرێـشانی دەکـردین. کـە ئەمـە ڕوویدەدا، خەڵك هەموو کۆدەبوونەوە و لە خوا دەپاڕانـەوە بـۆ بـاران. هەنـدێك جـار سەری دەگرت و هەندێك جار نا. ساڵێکیان وامان دەزانی وەرزێکی باراناویمان دەبێت، بەڵام هێشتا دڵۆپەیەك چیبوو نەباریبوو. نیوەی ئاژەڵەکانمان مردن و باقیەکەی تـری لـە تینوێتیـدا وشـك بووبوونـەوە. دایکـم پێـی وتم، هـەموو دەچـین کۆدەبینـەوە بـۆ نوێـژکردن بـۆ بـاران. خەڵکەکـە بـە یـەکجار هـەموو قووتبوونـەوە، وەك ئـەوەی لـە زەوییەوە هەڵقوڵابن. هەموو دەستمان کرد بە نوێژکردن، گـۆرانی و سـەما، هـەوڵمان دا دڵی خۆمان خۆشکەین و هیوای باران بـارین بـەرز ڕاگـرین. پاشـان، وەك هەمیـشە کە باران باری، ئاهەنگی ڕاستەقینە دەستی پێکـرد. جلمـان بـە بـەرخۆوە نەهێـشت و ڕامان کردە ناو ئاوەکەوە، دەستمان کرد بە شڵپووهوڕ و بۆ یەکـەم جـار، پـاش چـەند مانگ، خۆمان شت. خەڵکەکە بـە سـەمای فۆلکلۆری ئاهـەنگ دەگێـڕن: ژنـان چـەپڵە لێدەدەن و گۆرانی دەڵێن، دەنگی خۆش و نزمیان، شـەوی بیابـان دەهێنێتـە جـۆش و

پیاوان بە قەڵەمبازەکانیان خۆیان حەوا دەدەن. هەر یەك بە خواردنەوە بەشداری دەکات و ئێمەش وەك پاشا دەخۆین بۆ ڕێزگرتن لە دیاری ژیان.

لە ڕۆژەکانی پاش باراندا، دەشتاییەکان سەوز دەبن و بە گوڵی ئالتونی خۆیان دەنەخشێنن. ئاژەڵ بە هەوەسی خۆیان دەخۆن و دەخۆنەوە، هەلێکیش بۆ ئێمە دەرەخسێ وچانێ بدەین و لەزەت لە ژیان ببینین. دەتوانین بچین بۆ ئەو گۆمانەی کە تازە بەهۆی بارانەوە دروست بوون، خۆمان بشۆین و مەلە بکەین. لە هەوایەکی ئازادا، پەلەوەر دێتە خوێندن و بیابانی کۆچەر دەبێت بە بەهەشت.

## بەشی چوارهەم
## بوون بە ژن

ئامان، خوشکە گەورەکەم، کاتی ئەوەی هاتبوو خەتەنەبکرێت. منیش، وەك باقی خوشەکە بچوکەکانم، بەغیلی و خۆزگەم پێدەخواست، کە گەورە بووە و دەچێتە جیهانێکەوە، کە هێشتا دەرگاکەی بە ڕووی مندا داخراوە. ئامان جەهێڵ بوو، زۆر لە تەمەنی ئاسایی گەورەتر بوو بۆ خەتەنەکردن، بەڵام هەتا ئێستا هەلی بۆ هەڵنەکەوتبوو. بەهۆی ئەوەی هەمیشە لە گەڕاندا بووین بەناو بیاباندا، بۆ چەند جار ئەو ژنە قەرەچەمان لەدەست دابوو، کە ئەم نەریتە کۆنەی ئەنجامدەدا. لەکۆتاییدا باوکم دۆزییەوە و بانگی کرد بۆ خەتەنەکردنی هەردوو خوشکەکەم ئامان و حەلیمۆ. کە ژنەکە گەیشتە لامان بۆ دەوارەکە، ئامان ڕۆیشتبوو بەدوای ئاودا، لەبەرئەوە تەنیا حەلیمۆی خەتەنەکرا. تا دەهات باوکم نیگەرانی زیاتر دەبوو، چونکە ئامان دەچووە تەمەنی شووکردنەوە، بەڵام شووکردن نەدەکرا تا بە ڕێکوپێکی 'چاکنەکرێت.' لەنێو خەڵکی سۆماڵدا بۆچوونێك هەیە کە دەڵێت، لە نێوان لاقی کچدا شتی خراپ هەیە، هەرچەند بەو شتانەوە لەدایك دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەر پیسن. ئەو شتانە پێویستە لێکرێنەوە - میتکە، لچی ناوەوە زێ و بەشی هەرە زۆری لچی دەرەوە، پاشان برینەکە پێکەوە بدوورێنەوە، لە هەموو ئەندامی زاوزێ، جێگای برینی چاکبووەوە دەمێنێتەوە. بەڵام ڕاستییەکانی ئەم نەریتە وەك پەرلەیەك ماونەتەوە - هەرگیز بۆ کچانی ڕوون ناکەنەوە. هەر ئەوەندە دەزانی شتێکی تایبەت ڕوودەدات، دەمێك کاتت دێت.

وەك سەرئەنجامێك، هەموو کچانی گەنج لە سۆماڵدا بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەم مەراسیمە دەکەن، کە ئەمە نیشانەدەری گەورە بوونیانە لە کچێکی بچوکەوە بۆ

ژنێك. لە ڕاستیدا ئەم کارە کاتێك دەکرێت کە کچان دەگەنە تەمەنی باڵغ بوون، کە کچ هێلکەدانی ئامادە دەبێت و توانایی سکپڕبوون دەستپێدەکات. بەڵام لەگەڵ ڕۆیشتنی کاتدا، خەتەنەی مێینە زووتر و زووتر پێش ئەو تەمەنە ئەنجام دەدرێت، بەشێکی بەهۆی فشارێکەوەیە کە کچان خۆیان دەیهێنن، چونکە بە پەرۆشەوە چاودڕوانی ئەو "کاتە تایبەتییەیان" دەکەن، وەك منداڵانی ڕۆژئاوا چۆن چاوەڕوانی ئاهەنگی ڕۆژی لە دایکبوون دەکەن یان هاتنی بابە نۆئێل لە ئێوارەی شەوی سەری ساڵی مەسیحیدا.

کاتێك بیستم، پیرە قەرەچ دێت بۆ خەتەنەکردنی ئامان، دەمویست منیش خەتەنە بکرێم. ئامان خوشکە گەورە جوانەکەی من بوو، شەبەنگی من بوو، هەرچی شتێك ئەو بیکردایە و بیویستایە منیش دەمکرد و دەمویست. ڕۆژێك پێش ئەم ڕووداوە گەورەیە، لە دایکم پاڕامەوە، قۆڵیم گرت، "دایە، هەر دووکمان لە یەك کاتدا بکەن، دەی دایە، سبەینێ هەر دووکمان بکەن!"

دایکم پاڵێکی پێودنام "دەمت داخە، کچە بچکۆلە." هەرچی چۆنێك بوو، ئامان زۆر بە شووروشەوق نەبوو. بیرم دێت لەبەرخۆیەوە بۆڵاندی، "تەنیا هیوام ئەوەیە، ئەوەی بەسەر حەلیمۆ هات بەسەر من نەیەت." بەڵام لەو کاتەدا زۆر بچوك بووم تا لەوە بگەم و کاتێك لە ئامانم پرسی مەبەستت چییە، باسەکەی گۆڕی.

سبەینێ بەیانی زۆر زوو دایکم و هاوەڵەکەی ئامانیان برد بۆ لای ئەو ژنەی کە خەتەنە دەکات. ئاسایی لە دایکمم داواکرد، منیش لەگەڵیاندا بچم، بەڵام دایکم پێی وتم لەگەڵ منداڵە وردەکان بمێنمەوە. بەڵام چۆن ئەو جارە بە دزییەوە دوای دایکم کەوتم، کە چوو بۆ بینینی هاوەڵەکانی، ئاوا دوایان کەوتم و لەپشت دەوەن و دارەکانەوە خۆمم شاردەوە، تا لە شوێنێکی باشدا لە دوورەوە تەماشایان بکەم.

ژنە قەرەچەکە گەیشت. کە وەك کەسێکی بە هەیبەت لە کۆمەڵگاکەماندا چاوی لێدەکرێت. نەك لەبەرئەوەی لە پیشەکەیدا شارەزایی پەیداکردووە، بەڵکو

لەبەرئەوەی سامانێکی زۆری لە ئەنجامدانی خەتەنەوە بەدەستهێناوە. خەرجی ئەم کارە، یەکێکە لە خەرجە گەورەکانی تێچوونی ناوماڵ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا وا چاوی لێدەکرێت، کە سەرمایەیەکی باشیان بەگەڕخستووە، چونکو بەبێ ئەوە کچان لە بازاڕی شووکردندا ڕەونەقیان نابێت. کچانی نەدووراوە، وا چاویان لێدەکرێت کە شایەنی شووکردن نیین، کچانێکی ناپاك و دیمەن ناشیرینن کە هیچ پیاوێك بەنیاز نییە بچێتە خوازبێنییان. لەبەرئەوە هەندێك کەس ئەم ژنە قەرەچە وەك ئەندامێکی گرنگی کۆمەڵگاکەمان ناوی لێدەبات، بەڵام من وەك قەسابی ژنان سەیری دەکەم چونکو هەموو ئەو کچە بچکۆلانانەی قەسابی کردووە.

لەپشت دارێکەوە بە وردی تەماشام دەکردن، بینیم خوشکەکەم لەسەر زەوییەکە دانیشت. پاشان دایکم و هاوەڵەکەی هەردوو شانی ئامانیان گرت و جوڵەیان لێبڕی. قەرەچەکە لە نێوان لاقی خوشکەکەمدا دەست بەکاری شتێك بوو و بینیم مچوڕکەی ئازار بە نێو دەموچاوی ئاماندا ختووری کرد. خوشکەکەم کچێکی بەخۆوە بوو، زۆر بەهێز، لەپڕ چوو بە ئاسماندا. ئامان قاچێکی بەرزکردەوە و لەقەیەکی دا لە سنگی قەرەچەکە و خستی بە پشتدا. ئینجا کەوتە خۆ ڕزگارکردن لەو ژنانەی کە گرتبوویان و کەوتە سەر پێی خۆی. ترس دایگرتم کە بینیم خوێن جۆگەلەی بەست بە لاقی خوشکەکەمدا بۆ سەر لەکە، خوێنی بەدوای خۆیدا جێدەهێشت کاتێك کەوتە ڕاکردن. هەموو کەوتنە ڕاکردن بە دوایدا، بەڵام ئامان ئەوەندە دوور نەکەوتەوە لێیان، هێزی لێبڕا و کەوتە سەر زەوییەکە. ژنەکان نیشتنە سەری و کەوتنە تەواوکردنی کارەکەی خۆیان. هەستم کرد نەخۆشم و ئیتر نەمتوانی لەوە زیاتر تەماشایان بکەم و بەرەو ماڵەوە ڕام کرد.

ئێستا ئیتر شتێکم بینی، بەڵام لە ڕاستیدا ئاواتەخوازبووم هەر نەمبینییایە. تێنەگەیشتم چی ڕوویدا، بەڵام بیرکردنەوەی لەوەی کە منیش شتێکی وام بەسەر دێت، بۆ خۆی ترسناك بوو. نەشم دەتوانی زۆر پرسیار لە دایکم بکەم، چونکو بڕیار

نەبوو من شاهێدی ئەمە بم. ئامانیان لە باقی منداڵەکان جیاکردبۆوە لە کاتی ساڕێژبوونی برینەکەیدا. دوو ڕۆژ پاش خەتەنەکەی ئاوم بۆ برد، لە تەنیشتی لەسەر ئەژنۆ دانیشتم و بە هێمنی پرسیارم لێکرد، ‹چۆن بوو؟›

‹ئۆی، ترسناك بوو......› کەوتە قسە. پێشبینیم کرد، کە لەو باوەڕەدایە باشترە ڕاستیم پێنەڵێت. چونکو دەیزانی منیش دەبێت خەتەنەبکرێم، چاکترە بەرەو پیری بچم لەجیاتی ئەوەی لێی بترسم. ‹هەرچی چۆنێك بێت، زۆرت نەماوە، لەکاتی خۆیدا بۆ تۆشی دەکەن.› ئیتر ئەوە تەنیا شتێك بوو کە وتی.

لەدوای ئەوەوە، لەو نەریتە کە لەسەر ڕێگای ژنبوونمدا پێیدا دەڕۆیشتم، ترسام. هەوڵمدا ئەو ترسە لە مێشکی خۆم دەرکەم و بە تێپەربوونی کات، ئەو ئەشکەنجەیەی کە لە دەموچاوی خوشکەکەمدا بینیبووم، لەبیری خۆمم بردەوە. لە کۆتاییدا، کەرانە خۆمم ڕازی کرد کە دەمەوێت ببم بە ژن و بچمە ڕیزی خوشکە گەورەکانمەوە.

هاوڕێیەکی باوکم، کە هەمیشە لەگەڵ خێزانەکەیدا، هاوکۆچمان بوو، پیاوێکی پیری داخلەدڵ بوو. هەرکاتێك خوشکە بچوکەکانم یان من هەراسانمان بکردایە، بە هێمای دەست دەری دەکردین وەك ئەوەی مێش و مەگەز بین و هەراسانی دەکردین بەوەی کە دەی وت، ‹دوورکەونەوە لێم، ئێوە ئەی دوو کچە بچکۆلە ناپاکەکان - ئێوە کچە بچکۆلە پیسەکان. ئێوە تا ئێستاش خەتەنەنەکراون!› ئەم جۆرە وشانەی لە دەم دەهاتە دەرێ، وەك ئەوەی ئێمە، چونکو خەتەنە نەکراوین، ئەوەندە بۆگەنین کە بەئاستەم چاوی پیاماندا هەڵدێت. ئەم سوکایەتی کردنانە هانیدام بەدوای هەر ڕێگەیەکەوە بم تا دەمی پیسی داخەم.

ئەم پیاوە کوڕێکی جەهێڵی هەبوو بە ناوی جاما، کەوتمە دڵداری لەگەڵی، هەرچەند ئەو منی پشتگوێ دەخست. لەجیاتی من، جاما دڵی چووبوو بە ئامان دا.

بە تێپەڕبوونی کات، کەوتمە ئەو بیرەوەی، کە بە دڵپیاچوونی جاما بۆ خوشکە گەورەکەم دەگەڕێتەوە بۆ پایە بەرزی خوشکەکەم چونکو خەتەنەکراوە. لەوانەیە جاماش، هەر وەك باوکی، نەیەوێت لەگەڵ کچێکی بچوکی خەتەنەنەکراوی پیس دۆستایەتی هەبێت. کاتێك تەمەنم نزیك پێنج ساڵ بوو، چووم بۆ لای دایکم و سکاڵام کرد، 'دایە، تەنیا ئەو ژنەم بۆ بدۆزەرەوە. دەی دایە، کەی ئێوە دەیدۆزنەوە؟' کەوتبوومە ئەو باوەڕەوە، *کە هەر دەبێت خۆم رزگارکەم لەمە - ئەم شتە ڕازە دەبێت بکرێت*. بەخت یاوەرم بوو، چەند ڕۆژی نەبرد تا ژنە قەرەچەکە دووبارە دەرکەوتەوە.

ئێوارەیەکیان دایکم پێی وتم، 'بۆ ئاگاداریت، باوکت ڕۆیشتووە بە دوای ژنە قەرەچەکەدا. ئێمە ئێستا چاوەڕوانی دەکەین، هەر ڕۆژێك بێت دەگاتە لامان.'

ئێوارەی پێش خەتەنەکردنم، دایکم پێی وتم ئاو یان شیری زۆر نەخۆمەوە، چونکو دەبێت زۆر میز نەکەم. لەمە نەگەیشتم بۆچی، بەڵام پرسیاریشم لێنەکرد، تەنیا سەرم بۆ لەقاند. نیگەران بووم بەڵام بڕیارم دابوو بەسەریدا سەرکەوم. ئەو ئێوارەیە خێزانەکەمان ڕێزێکی تایبەتییان لێگرتم و ژەمە خواردنێکی زۆرتریان پێدام. ئەمە کەلتوورێك بوو کە بۆخۆم ساڵەهای ساڵ دەمبینی و وای لێکردبووم، بەغیلی بە خوشکە گەورەکانم بەرم. پێشئەوەی بچمە ناو جێگاوە، دایکم پێی وتم، 'کە وەختی هات، بەیانی خۆم هەڵت دەسێنم.' چۆنی دەزانی ژنەکە کەی دێت، لێی تێنەگەیشتم، بەڵام دایکم هەمیشە ئەو شتانەی دەزانی. زۆر ئاسایی ژیرانە دەیزانی فلاّن کەس کەی دێت یان دروست کەی شتێك ڕوودەدات.

ئەو شەوە بە خۆشییەوە چوومە ناو جێگاوە، بێئەوەی خەو بچێتە چاوانم تا لەپڕ دایکم بەسەرمەوە ڕاوەستا. ئاسمان هێشتا تاریك بوو، پێش تاریك و ڕوونی بەیانی بوو، کە ڕەشایی ئاسمان بەرەو خۆڵەمێشی دەرەوێتەوە. هێمای بۆ کردم کە بێدەنگ بم و دەستی گرتم. پارچە بەتانییەکەی خۆمم هەڵگرت، هێشتا خەو

بەرینەدابووم کەوتمە دووی دایکم. ئێستا تێدەگەم، هۆی چییە بەیانیان زۆر زوو کچان دەبەن. دەیانەوێت خەتەنەیان بکەن پێشنەوەی کەس لە خەو هەڵسێت، تا کەس گوێی لە قاوقریشکیان نەبێت. بەڵام لەو کاتەدا، هەرچەند شپرزە بووبووم، ئاسایی هەرچی شتێکیان پێدەوتم دەم کرد. دوورکەوتینەوە لە دەوارەکەمان و کەوتینە ناو دەوەنەکانەوە. 'لێرانەدا چاوەڕوان دەبین،' دایکم وتی و لەسەر زەوییە ساردەکە دانیشتین. دنیا وردە وردە ڕۆشن دەبۆوە. بەحاڵ تارماییم دەبینی لەگەڵ ئەوەش گوێم لە خشەخشی پێڵاوی نەعلی ژنە قەرەچکە بوو. دایکم بە دەنگی بەرز ناوی ژنەکەی برد، پاشان وتی، 'ئەوە تۆی؟'

'بەڵێ، ئەوە منم،' دەنگێك هات. لەگەڵ ئەوەی هێشتا کەسم نەدەبینی. پاشان، بە بێئەوەی نزیکبوونەوەکەی ببینم، لە تەنیشتمدا قووتبوەوە. 'لەویانەدا دانیشە.' هێمای بۆ بەردێکی تەخت کرد. نە قسە و باسێك، نە سەلامێك. نە ئەوەی بڵێت 'ئەم کاتەت باش؟' نە ئەوەی بڵێت 'ئەوەی ئیمڕۆ ڕوودەدا زۆر ئازاری هەیە، لەبەرئەوە دەبێت زۆر ئازا بیت.' هەر هیچ. قەسابی کچان تەواو نوقمی کاری خۆی بوو.

دایکم پارچەیەك لە ڕەگی دارێکی پیری هێنا، پاشان منی لەسەر بەردەکە دانا. خۆشی لە پشتمەوە دانیشت و سەری ڕاکێشام بۆ دواوە و نووساندی بە سنگییەوە، هەر دوو لاقی ئاڵاند لە لەشمەوە. منیش هەر دوو قۆڵم ئاڵاند لە سێبەنگەی دایکمەوە. دایکم ڕەگەکەی خەستە نێوان دانمەوە. 'دانی پیادا بنێ.'

لە ترساندا موچڕکەیەك هات بە گیانمدا، کاتێك لەپڕ دیمەنی دەموچاوی پڕ ئەشکەنجەی ئامانم هاتەوە بەرچاو. 'ئەمە ئازارێکی زۆر لەگەڵ خۆ دەهێنێ!' بە دەمی پڕ ڕەگەوە لەبەرخۆمەوە وتم.

دایکم بەسەرمدا نووشتایەوە و بە گوێمدا چرپاندی، 'دەزانی لە توانای مندا نییت بتگرم. تەنیا بۆخۆم لێرانەدام. لەبەرئەوە هەوڵبدە کچی باش بیت، منداڵە

بچکۆلەکەم. بەخاتری دایکت ئازا بە، زوو تەواو دەبێت.ْ لەنێوان لنگی خۆمەوە تەماشام دەکرد و بینیم ژنە قەرەچەکە خۆی ئامادە دەکات. لە هەر ژنێکی سۆماڵی دەچوو - بە کراسێکی کاڵی لۆکەیی و سەرپۆشێکی ڕەنگاو ڕەنگی کە بە سەریەوە پێچابوو - بێجگە لە زەردەخەنەی سەر لێوانی. بە مۆنییەکەوە تەماشای کردم، نیگایەکی کوشندە لە چاوانیدا بەدیدەکرا، پاشان دەستی گەڕان بەناو جانتایەکی پەڕۆی کۆندا. چاوم لێنەدەترووکاند، دەمویست بزانم دەیەوێت کوێم ببڕێت. چاوەڕوانی چەقۆیەکی گەورە بووم، کەچی توورەکەیەکی لۆکەی بچوکی لە جانتاکەی دەرهێنا. پەنجە درێژەکانی پیاکرد و گوێزانێکی ڕیش تاشینی شکاوی تیادا دۆزییەوە. ئەم دیواو دیوی کرد، تاقیکردەوە. ڕۆژ بەئاستەم هەڵهاتبوو، ئەوەندە ڕووناکی هەبوو بەئاستەم ڕەنگم لەیەکتر جیادەکردەوە. هەرچی چۆنێك بوو، خوێنی وشکبووەوەم بینی بە قەراخی تیژی گوێزانەکەوە. تفی تێکرد و بە جلەکانی خۆی پاکی کردەوە. ژنەکە خەریکی کڕاندنی بوو، کاتێك دنیا لەبەر چاوم ڕەش بوو، دایکم بە سەرپۆشەکەی چاوانی بەستم.

پاشان شتێك کە هەستم پێکرد گۆشتەکەم بوو، ئەندامی زاوزێی دەرەکیم بوو، لێدەکرایەوە. گوێم لە خرمەی بڕینی گوێزانی کولل بوو، کە بەناو پێستمدا هاتووچۆی دەکرد. کاتێك بیر لەوە دەکەمەوە، ڕاستگۆیانە بیڵێم، باوەڕ ناکەم ئەوە بەسەر مندا هاتبێت. وا هەست دەکەم لەبارەی یەکێکی ترەوە دەدوێم. هیچ شتێك نییە لە جیهاندا تا بەهۆیەوە هەستی خۆم بەیان بکەم. وەك ئەوە وایە کەسێك گۆشتی لاڕانت لێکاتەوە، یان قۆڵێکت بقرتێنێت، بێجگە لەوەی کە ئەو ئەندامە هەستیارترین شوێنی لەشە. لەگەڵ ئەوەشدا یەك ئینج نەجولام، چونکو ئامانم لە بیربوو و ئەشم زانی ڕێگای هەڵهاتنم نییە. دەشم ویست دایکم شانازیم پێوە بکات. لە جێگای خۆم ڕەق بووم وەك ئەوەی بەرد بم، وەبیر خۆشم دەهێنایەوە، کە چەند بجوڵێم ئەوەندە ماوەی ئەشکەنجەم درێژتر دەبێتەوە. بەداخەوە لاقەکانم لە

خۆیەوە کەوتنە لەرزین، لەرزینێك کە توانای دەستبەسەرا گرتنیم نەبوو و کەوتمە پاڕانەوە، خوایە، با خێرا تەواو بێت. لەو کاتەدا ئیتر لە هۆشخۆم چووم.

کاتێك هاتمەوە هۆشخۆم، وام دەزانی تەواو بوون، کەچی تازە لە سەرەتای پڕ ئازارترین بەشی کارەکەدا بوون. سەرپۆشی چاوبەستەکەم لێکرابۆوە و بینیم ژنە قەسابەکە لەبەردەمی خۆیدا کۆمەڵێك دڕکی داری ئاکاسیای کۆکردۆتەوە. کە بۆ کونکردنی پێستی من بەکاری دەهێنێت و پاشان دەزوی سپی قایم بە ناو ئەم کونانەدا دەبات بۆ دوورینەوەی من. لاقەکانم بە تەواوی سڕ بووبوون، بەڵام ئازاری نێوان لاقم ئەوەندە تاوی سەندبوو کە مردنم بە ئاوات دەخواست. هەستم کرد زەوییەکە نامگرێتە خۆی، ئازارم لە پاش خۆمەوە جێدەهێشت و بە بەرزایی پێیەك کەوتمە ئاسمان و تەماشای ئەم دیمەنەی خوار خۆمەوەم دەکرد، چاوم لێبوو ژنەکە خەریکی دوورینەوەی پێکەوەنانی لەشی من بوو لەکاتێکدا دایکە هەژارەکەم منی لە باوەشی خۆیدا گرتبوو. لەو ساتەدا هەستم کرد تەواو ئازارم نەما، ئیتر ترس و نیگەرانییەکەم نەما.

ئیترلەو ساتەوە ئاگام لە دنیا نەما تا چاوم کردەوە و بینم ژنەکە ڕۆیشتووە. منیان گواستبۆوە و لە شوێنێك نزیك بەردەکە دایان نابووم. هەردوو لاقم لە قوولەپێمەوە تا سمتم پێکەوە بە پارچە پەڕۆ بەسترابوو بۆئەوەی نەتوانم بجوڵێم. چاوم گێڕا بۆ دایکم، بەڵام ئەوەیش ڕۆیشتبوو، هەرخۆم لەو نێوەدا کەوتبووم، بۆم پرسیار بوو چی تر ڕوودەدا. سەرم وەرگێڕا بۆ بەردەکە، نوقمی خوێن بووبوو، وەك ئەوەی ئاژەڵیان لەسەر سەربڕی بێت. پارچە گۆشتی من، کۆئەندامی دەرەوەم، هەروا لەسەر بەردەکە، بێدەستکاری، لەبەر هەتاوەکە وشك بووبۆوە.

لەوناوە کەوتبووم، تەماشای ڕۆژم دەکرد، ڕێك هاتبووە سەر سەرم. هیچ سێبەرێکم نەبوو، شەپۆلی گەرما دەیدا بە دەموچاومدا تا دایك و خوشکم گەیشتنە سەرم. منیان ڕاکێشایە بن سێبەری دەوەنێك و کەوتنە ئامادەکردنی درەختەکەم.

ئەمە جۆرێکە لە داب و نەریت، کە کەپرێکی بچوکی تایبەت لە ژێر درختێکدا ئامادە دەکەن، تا لەوێدا بۆ چەند هەفتە وچان بدەم و برینەکەم سارێژ بێت و بێمەوە سەرخۆم. کاتێك دایکم و ئامان ئەمەیان تەواو کرد، منیان خستە ناوی.

لەو باوەڕەدا بووم ئازار تەواوو بووە تا میزم هات، ئینجا لە ئامۆژگاری دایکم تێگەیشتم کە وتی نابێت زۆر ئاو و شیر بخۆمەوە. پاش چەند کاژێر چاوەڕوانی، خەریك بوو دەمردم، بەڵام بە لاقی بەستراو جووت بە یەکەوە نەمدەتوانی بجولێم. دایکم ئاگاداری کردبوومەوە کە نەجولێم تا تەقەڵەکانم نەپچرێت و نەکرێمەوە، چونکو ئەگەر بکرامایەوە دەبوو دووبارە بدورامایەوە. باوەڕ بکەن، ئەوە دوا شت بوو کە دەم ویست.

'میزم دێت،' هانام بۆ خوشکەکەم برد. نیگای خوشکەکەم نیشاندەری هەواڵێکی ناخۆش بوو. هات و منی خستە سەر لایەك و چاڵێکی بچوکی لە لمەکەدا کرد.

'دەی لێرەدا.'

یەکەم دڵۆپ هات و پیامدا چزا، وەك ئەوەی تێزاب بێت و پێستم بسوتێنێت. ژنە قەرەچەکە منی دووریبوەوە و تەنیا کونێکی هێشتبوەوە بۆ میزکردن و خوێنی سووڕی مانگانە، کە ئەوەندە بچوك بوو بە ئەندازەی تیرەی بازنەی سەری دەنکە شقارتەیەك. ئەمەش بە مەبەستی دەستەبەرکردنی ئەوەی کە هەرگیز نەتوانم سێکس بکەم تا شوو دەکەم و مێردەکەم مسۆگەری کردبێت، کە کچێکی پاکیزە دەهێنێت. کاتێك میز لە ناو برینە خوێناوییەکەمدا کۆدەبوەوە و بە لاقەکانمدا بڵاودەبوەوە - هەر جارەی دڵۆپێك - دەستم دەکرد بە گریان. هەتا کاتێك قەسابی کچان پارچەی لێدەبڕیم، ورتەی گریانم لێوە نەهات، بەڵام ئێستا زۆر بە خراپی دەسوتامەوە و لەوە زیاتر لە تواناما نەبوو.

لە ئێوارەدا کاتێك دنیا تاریك بوو، دایکم و خوشکەکەم گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، تەنیا بۆخۆم لە کەپرەکەدا مامەوە. بەڵام لەو کاتەدا، ترسم لە تاریکی، شێر یان مار

نەمابوو، هەرچەند بێدەسەڵات کەوتبووم، توانایی ڕاکردنم نەبوو. لەو ساتەوە کە لە پێستی خۆم چوومە دەرەوە و بە بەرچاوی خۆمەوە ئەو ژنە پیرە ئەنـدامی دەرەوەی زاوزێمی پێکەوە دووریـیەوە، ئیتر هیـچ شتێك ئەما بتوانێت بمترسێنێت. ئاسایی وەك لاشە لەسەر زدوییە ڕەقەکە کەووتم، بێگوێ دانە ترس، سڕ لەناو ئازاری خۆمدا، بۆم گرنگ نەبوو ماوم یا مردوم. هەتا گوێم نەدەدا بەوەی هەر یەکە لە ماڵەوە لەبەردەم ئاگردا دانیشتوون و پێدەکەنن، منیش لێرە تەنیا لە شەوە زەنگی تاریکدا کەوتووم.

ڕۆژ هات و ڕۆژ چوو، من هەر لە کەپری خۆمدا بووم، ئەندامی زاوزێم هەوی کرد و تایەکی زۆرم لێهات. لە هۆشخۆم دەچووم و دەهاتمەوە هۆشخۆم. لـە ترسـی ئـازاری میزکردن، هەرچی میز بوو لە خۆمدا ڕامگرت تـا دایکـم وتـی، 'کچم، ئەگـەر بێتـوو میـز نەکەیت، بەردو مردن دەچیت.' ئینجا کەوتمە زۆرکردن لـە خـۆم. ئەگـەر میـزم بهاتایە و کەس لەدەورم نـەبوایە، خۆم دەجووڵاند و دەکەوتمـە سـەرلا و خـۆم ئامـادە دەکرد بۆ ڕوو بە ڕووبوونـەوە لەگـەڵ ئـازاری سووتانەوە. بـەڵام ئەوەنـدە برینەکـەم هەوی کرد کە ئیتر توانای میزکردنم لێبڕا. دایکـم بـۆ مـاوەی دوو هەفتـە خـواردن و ئـاوی بـۆ هێنـام، بێجگـە لـەوە، خـۆم بـە تـاقی تـەنیا بـە لاقـی بەسـتراوەوە کـەوتم و چـاوەڕوانی سارێژ بـوونی برینەکـەم دەکـرد. لـە تـا لێهـاتن، وەڕسـی و کـەوتن هـیـچ شتێکی ترم نەبوو، بەڵام بۆم پرسیار بـوو: بۆچـی؟ ئـەم هـەموو شـتانە لەبـەرخاتری چی؟ لەو تەمەنەدا هـیـچ شـتێکم لـەبارەی سێکسەوە نـەدەزانی. هـەموو ئـەوەی لێـی ئاگاداربووم، بە مۆڵەتی دایکم فەسابی کرام و نەمدەتوانی تێبگەم بۆچی.

لەکۆتاییدا، دایکم هاتو و بە لاقی بەستراوەوە منی گواستەوە بۆ ماڵەوە. لـە یەکـەم شەوی گەڕانەوەم بۆ لای خێزانەکەمان، باوکم پرسیاری کرد، 'ئەحواڵی چۆنە؟' وام لە خەیاڵدا بوو، کە مەبەستی پلە و پایەی تازەی ژنێتی منە، بەڵام چەند سەرم هێنا و چەند سەرم برد مەبەستی ئازاری نێوان لاقم بوو. چونکو تەمەنم ئەو پەڕی پێنج

ساڵ بوو، ئاسایی زەردەخەنە گرتمی و هیچم نەوت. چیم دەزانی لەبارەی ئەوەی ژن بم؟ لەگەڵ ئەوەشدا سەرم لە زۆر شت دەردەچوو، دەمزانی بوون بە ژنی ئەفریقی بە واتای چی دێت: دەمزانی، ملکەچ، بێدەسەڵات وەك منداڵ، بێدەنگ دەبێت بژیت.

بۆ زیاتر لە یەك مانگ لاقەکانم بەیەکەوە بەستران تا برینەکەم سارێژ بوو. دایکم بە بەردەوامی ئاگاداری دەکردمەوە، کە ڕانەکەم یان باز نەدەم، لەبەرئەوە زۆر بە ورياييەوە دەجووڵامەوە. بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە من چەند پڕ توانا و چالاك بووم، وەك مەیمون ڕام دەکرد، بەسەر دار و بەردا هەڵبەز و دابەزم بوو، دەبێت ئەمە چەند پڕ ئازار بوو بێت بۆ کچێکی منداڵ دەبێت دانیشێت، لەکاتێکدا هەموو خوشك و براکانی خەریکی یاری کردن بن. بەڵام ئەوەندە ترسا بووم لەوەی کە جارێکی تر بەو دەردەم بەرن، یەك ئینج چیی بوو نەدەجووڵام. هەموو هەفتەیەك دایکم دەیپشکنیم تا بزانێت برینەکەم بە تەواوی سارێژ بووە. کاتێك کە لاقمیان کردەوە، بۆ یەکەم جار توانیم خۆم تەماشای خۆم بکەم. پێستێکی تەواو سافم بینی جگە لە جێگای چاکبووەوەی برینەکە، کە لە زنجیری پانتۆڵ دەچوو بۆ خوارەوە. زنجیرێك کە بە تەواوەتی داخرابوو. ئەندامی زاوزێم بە دیوارێکی خشتی مۆرکرا، کە هیچ پیاوێك بۆی نییە کونی بکات تا شەوی بووکێنیم، کاتێك مێردەکەم بە چەقۆ دەیکاتەوە یان بەزۆر تێی دەبڕێت.

هەر کە کەوتمەوە ڕۆیشتن، خولیای ئەرکێك کەوتە سەرمەوە، ئەرکێك کە تەواوی ئەو ڕۆژانەی لە جێگادا کەوتبووم، بیرم لێدەکردەوە. ئەرکی گەڕانەوەی بۆ لای بەردەکە، کە لەسەری قوربانی کرابووم و بگەڕێم بەدوای ئەندامی زاوزێکەمدا کە هێشتا لەوناوە کەوتبوو. بەڵام نەما بوو - گومانی تیادا نەبوو، خورابوو لە لایەن هەڵۆ، کەمتیار و ئاژەڵی گۆشتخۆرەوە، کە بەشێکن لە دەورەی ژیانی ئەفریقا. کاریان پاکردنەوەی گۆشتی بۆگەنە - بەڵگەیەکی غەمناکاوی ژیانی سەختی بیابانیمانە.

شانـــسم هــەبوو، هەرچــەندە بــە هــۆی خەتەنــەوە ئــازارێکی زۆرم چێــشت. سەرئەنجامەکانی ددکرا زۆر خراپ تر بێت، وەك ئەوەی ناوبەناو بەسەر کچانی تـردا ددهـات. کاتێـك بـەناو سـۆماڵدا دەگـەڕاین، توشـی خێزانـی تـر دەبـووین و لەگـەڵ کـچەکانیاندا دەکەوتینـە یـاریکردن. دووبـارە کـە تووشمـان دەبوونـەوە، ئـەم کـچانە نەبوون. هیچ کەسێك ڕاستی لـەبارەی دیارنـەمانی ئـەم کچانەوە نـەدەوت یـان هـەتا لـەبارەی خۆیانـەوە. ودك سـەرئەنجامێکی خەتەنـە هـەموویان مردبـوون - بـەهۆی خوێن بەربوون، شۆك، هەوکردن. یان کـەزازەوە. بـە لەبەرچاوگرتنی هەلومـەرجێك کە ئەم کارەی تیادا ئـەنجام ددەدرێـت، ئەمـە مایـەی سەرسامی نییـە. ئـەوەی جێگای سەرسامییە کە چۆن هەر یەك لە ئیمە گیانمان بەدەربردووە.

بەئاستەم خەیاڵی حەلیمۆی خوشکم دێت. تەمەنم نزیك سێ ساڵ بوو، بـیرم دێـت پاشان ئیتر ئەم بینییەوە، بەڵام نەمزانی چیی بەسـەرهات. دوایـی زانـیم، کاتێـك کـە `وەخـتی تایبـەتی` خـۆی هـاتووە و ژنـە قەرەچـە پیرەکـە خەتەنـەیکردووە، بـەهۆی خوێنبەربوونەوە مردووە.

کاتێـك تەمـەنم نزیکـەی دە سـاڵان بـوو، بەسـەرهاتی ئـاموزا بـچکۆلەکەی خـۆمم بیست. تەمەنی شەش ساڵ بوو خەتەنەکرا و پاش ئەوە یەکێك لـە براکانی هـات بـۆ لامان و مایـەوە و پێـی وتـین چـی ڕوویـداوە. ژنێـك هـاتووە و خوشـکەکەی خەتەنـە کردووە، پاشان لەژێر کەپرەکەی دایان ناوە بۆ چاکبوونەوە. بەڵام `هینەکـەی،` وەك ئەوەی پێیان دەوت، ئاوساوە و بۆگەنی ئەوەنـدە پیس بووە کەس خۆی پێڕانەگیراوە. لەو کاتەدا باوەڕم بە ئاموزاکەم نـەکرد. بۆچـی بۆگـەنی لێبێـت، کـە لـە مـن و ئامـان ئەمە هەرگیز ڕووینەدا؟ ئێستا دەزانم ڕاستی وتووە: وەك سەرئەنجامی هەلومـەرجی پیسوپۆخڵی ئەنجامدانی کارەکە، کە قەسابی کردنی کچانە لە ناو دەوەندا، برینەکەی هەوی کردووە. ئەو بۆگەنە پیسە نیشانەی گانگرینە. بەیانییەکیان دایکی ڕۆیشتبوو سـەری کـچەکەی بـدات، ئاسـایی شـەو بـە تـەنیا لـە کەپرەکـە مـابوەوە. بینیبـووی

کچەکەی لە جێگای خۆیدا مردوە، گیانی شین هەڵگەڕاوە و سارد بۆتەوە. بەڵام پێش ئەوەی ئاژەڵە گۆشتخۆرەکان فریاکەون ئەم قەواڵە غەمناکە نەهێڵن، خێزانەکەی لە گۆڕیان نابوو.

## بەشی پێنجهەم
## قەباڵەی مارەیی

بەیانییەکیان دەنگە دەنگی خەڵك خەبەری کردمەوە. لەسەر ڕاخەرەکەم هەستام و بینیم کەس دیار نییە، بڕیارمدا بزانم چییە. لەو بێدەنگییەدا دوای دەنگەکە کەوتم، نیو میلێك ڕۆیشتم تا گەیشتم بە دایك و باوکم کە دەستیان بەرز دەکردەوە بۆ ماڵئاوایی کردن لە کۆمەڵێك خەڵك، کە خەریکبوون دوور دەکەوتنەوە. 'دایە، ئەوە کێیە؟' دەستم بۆ ژنێکی باریکەلەی سەرپۆش بەسەر ڕاکێشا، کە پشتی لە ئێمە بوو.

'ئەوە شوکرینە، هاوڕێکەی تۆیە.'

'لەم ناوە ماڵ دەگوێزنەوە؟'

'نا، شووی کردووە،' دایکم وەڵامی دامەوە.

سەرسام لە جێگای خۆمەوە لە قەد و باڵای وردبوومەوە، کە خەریکبوون لە چاو ونەبوون. تەمەنم نزیك سیانزە ساڵ بوو، شوکرین بەئاستەم لە من گەورەتر بوو، نزیکەی چواردە ساڵ، ئەم دەتوانی باوەڕ بکەم کە شوودەکات. 'بە کێ؟' کەس وەڵامی نەدامەوە، وەك ئەوەی بڕیار بێت ئەم پرسیارە پەیوەندی بە منەوە نەبێت. 'بە کێ؟' پرسیارەکەمم دووبارەکردەوە، دووبارە بێدەنگی لێکرا. 'لەم ناوە دەگوێزێتەوە - لەگەڵ ئەو پیاوەی کە شووی پێکردووە؟' لەو کاتەدا ئەمە پرسیارێکی ئاسایی بوو، گەورەترین ترسم ئەوە بوو، جارێکی تر ئەم هاوڕێیەم نەبینمەوە.

'نیگەران مەبە. نۆبەی تۆش دێت،' باوکم بە ڕەقییەکەوە وتی. دایك و باوکم گەڕانەوە بۆ لای دەوارەکە، بەلام من لە شوێنی خۆمدا ڕاوەستام و لەگەڵ ئەم هەواڵە کەوتبوومە کێشەوە. شوکرین شوویکرد! شوویکرد! ئەمە دەستەواژەیەك بوو دەهات

و دەچوو، بەڵام لەڕاستیدا تا ئەو بەیانییە هەرگیز بۆم پرسیار نەبوو بە واتای چی دێت.

وەك كچێكی سۆماڵی، هەرگیز بیرم لە شووكردن و سێكس نەكردبووەوە. لەناو خێزانەكەماندا - لە كەلتووری ئێمەدا - كەس باسی هیچ یەك لەمانە ناكات. تەنیا بیرێك كە لەبارەی كوڕانەوە هەم بوو، پێشبڕكێ بوو لەگەڵیاندا، كە كێ باشتر دەتوانێت چاودێری لە ئاژەڵەكان بكات، لەگەڵیاندا ڕاكات و پێشیان بداتەوە. هەتا ئەگەر یەكێك قسەی لەسەر بابەتی سێكس بكردایە، تەنیا ئەوە بوو 'ئاگاداری خۆت بە، تووشی كێشە نەبیت لەگەڵ هیچ كوڕێكدا. پێویستە پاكیزە بی كاتێك شوو دەكەیت.' كچان دەیان زانی وەك پاكیزە شوودەكەن، تەنیا بە یەك پیاو شوودەكەن و ئیتر هەر ئەوەیە. ئەوە ژیانیانە.

باوكم خووی گرتبوو بەوەی، بە من و خوشكەكانم بڵێت، 'كچەكانم ئێوە شاژنی منن،' چونكو لەوە دەچوو خۆشحاڵ بێت، بەوەی خاوەنی هەندێك لە جوانترین كچان بێت بە دەوریدا. 'ئێوە شاژنی منن، هیچ پیاوێك بۆی نییە كێشەتان بۆ بنێتەوە. ئەگەر كەسێك خەریكبوو، زوو ئاگادارم كەنەوە. من لێرەم تەنیا بۆ پارێزگاریكردنی ئێوە - بۆ ئێوە گیانی خۆم بەخت دەكەم.'

زیاتر لە جارێك هەڵكەوت، باوكم پارێزگاری لە 'شاژنەكانی' بكات. ڕۆژێكیان ئامان، خوشكە گەورەكەم، چاودێری ئاژەڵەكانی دەكرد، كە پیاوێك لێی نزیك بووبووەوە. پیاوەكە تەنگی پێهەڵچنی بوو، ئەویش بەردەوام پێی وتبوو، 'دووركەوەرەوە لێم، حەز لە چارەت ناكەم.' لەكۆتاییدا پیاوەكە كە دەزانێت فرۆفێڵی سەرناگرێت، پەلاماری دەدا و هەوڵ دەدات شتێكی لێبكات. ئەمە ئیتر هەڵەیەكی گەورە بوو، چونكو ئامان ئەمەزۆنێك بوو بۆ خۆی، باڵای شەش پێ بوو و وەك پیاو بەهێز. فەلاقەی پیاوەكەی كردبوو، پاشان گەڕایەوە ماڵەوە و بەسەرهاتەكەی بۆ باوكم گێڕایەوە. باوكم ڕۆیشت بەدوای ئەو ناشرینە هەژارەدا،

پاشان ئەویش فەلاقەیەکی تری کرد. هیچ پیاوێك بوّی نەبوو دەست بوّ کچەکانی بەرێت.

شەوێکیان لە قریشکەی قایمی خوشکێکی ترم بە ناوی فەوزیە، ڕاپەڕیم. ئاسایی ئێمە لە دەرەوە لەژێر ئەستێرەدا دەخەوتین، بەڵام ئەو شەوە فەوزیە لە ئێمە جیابووبووەوە و لە لایەکی ترەوە خەوتبوو. هەستام و لە تاریکاییدا تارمایی پیاوێکم بینی بە ڕاکردن لە دەوارەکەمان دووردەکەوتەوە. فەوزیە هەر هاوار هاواری بوو، کاتێك باوکم هەستا و ڕای کرد بەدوای پیاوەکەدا. چووین بوّ لای خوشکەکەم و خوشکەکەم دانەوییەوە و دەستی هێنا بە لاقەکانیدا، کە بە ئاوێکی سپی خەست ئاوڕشێن کرابوو. پیاوەکە توانی لەدەست باوکم دەرچێت، بەڵام بوّ سبەینێ بەیانی، لەنزیك جێگای خەوی خوشکەکەمەوە، شوێنەواری جێ پێڵاوی تاوانبارەکەمان بینییەوە. باوکم بوّی دەچوو تاوانبارەکە کێ بێت، بەڵام دڵنیا نەبوو.

ماوەیەك دواتر، کاتێك کە بێبارانی تاوی سەندبوو، باوکم چووبوو بوّ هێنانی ئاو لە بیرێکی نزیکدا. کاتێك چووبووە ناو بیرەکەوە و لەسەر زەویە تەڕەکە ڕاوەستابوو، پیاوێك دێت. پیاوەکە چاوەڕوانی نوّبەکەی دەکات بەڵام تا دێت بێئارامی تەنگی پێهەڵدەچنێت و هاوار لە باوکم دەکات٬ خێراکە! منیش هاتووم توّزێك ئاو بەرم!٬ لە سوّماڵ ئەم بیرانە گشتییە، کەسێك هەڵی کەنیوە تا گەیشتوّتە ئاو، هەندێك جار ئەم هەڵکەندنە دەگاتە قووڵایی سەد پێ. کە ئاو ڕوو لە کەمی دەکات، خەڵك دەکەوێتە فرکان فرکان، هەوڵدەدەن ئاوی پێویست بوّ ئاژەڵەکانیان بەدەستبهێنن. باوکم وەڵامی دەداتەوە، کە بێتە خوارەوە و چەند ئاوی پێویستە بیبات.

٬دەی، هەر ئەوەم مەبەست بوو.٬ کابرا بستی بە قەرز نادات و دێتە خوارەوە بوّ ناو بیرەکە. دەست بەکار دەبێت، جەوەنەکانی پڕدەکات لە ئاو، کە کابرا ئەم بەرو ئەو بەر دەکات، باوکم سەرنجی بوّ لای جێ پێڵاوەکانی دەچێت لە قوڕەکەدا.

'ئەوە تۆ بووی، وا نییە؟ !' باوکم وتبووی، هەردوو شانی کابرا دەگرێت و ڕایدەوەشێنێت. 'زۆڵی نەخۆش، تۆ ئەوەی دەستدرێژی بکەیتە سەر کچی من!' باوکم تێی دەسرەوێنێت، وەك تاوانبارێك لێی دەدا. بەڵام کابرا دەست دەداتە چەقۆیەکی قەسابی گەورەی ئەفریقی نەقشکراو وەك خەنجەری شاهی. لە چوار پێنج لاوە سنگ و بەرۆکی باوکم بریندار دەکات، تا باوکم فریادەکەوێت چەقۆکەی لێدەستێنێ و هەر بە چەقۆکەی خۆی برینداری دەکات. هەردووکیان بە سەختی بریندار دەبن. باوکم بە هەزارحاڵ توانی بووی لە بیرەکە بێتەدەرەوە و خوێناوی و نیوەمردوو خۆی بگەیەنێتە ماڵەوە. پاش لە جێگا کەوتنێکی زۆر، باوکم چاك دەبێتەوە، ئیتر بۆمان دەرکەوت کە باوکم ڕاستی وتووە: ئامادەیە گیانی خۆی بەختکات بە خاتری ئابڕوی کچەکانی.

باوکم هەمیشە لەگەڵ کچەکانیدا شۆخی دەکرد، 'ئێوە شاژنی منن، غەزنەی منن، و ئێوەم خستۆتە باوەڵێکەوە و قفڵێکم لێداوە. کلیلی ئەو قفڵە بە منە!'

منیش پێم دەوت، 'بەڵام باوکە، ئەو کلیلەت لە کوێ دانەوە؟'

باوکم وەك شێت پێدەکەنی و دەی وت، 'لەو ناوە فڕێمداوە!'

'باشە، چۆنی بدۆزینەوە؟' هاوارم دەکرد و هەموومان پێدەکەنین.

'نا گوڵی من ئەوە نەکەن تا خۆم پێتان دەڵێم.'

ئەم سوعبەتانە لە ئامانی خوشکە گەورەکەمەوە دەستی پێکرد تا خوشکە بچوکەکەم. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانە سوعبەت نەبوون. بەبێ مۆڵەتی باوکم کەس بۆی نەبوو دەست بۆ کچەکانی بەرێت. بەڵام شتێك لە ئارادابوو زیاتر لەوەی باوکمان لە بەرامبەر ڕووداوێکی کتوپڕدا پارێزگاریمان لێ بکات. پاکیزەیی کاڵایە، کە لە بازاڕی شووکردن و ژنهێنانی ئەفریقادا کڕیاری زۆرە، یەکێکە لە هەرە هۆ سەرەکییەکانی خەتەنەکردنی کچان، کە کەس باسی لێوە ناکات. باوکم چاوەڕوانی نرخێکی بەرز بوو بۆ کچە پاکیزە جوانەکانی، بەڵام هیوایەکی وەهای نەبوو

لەدەست کچێك ڕزگاری بێت، کە ئابڕووی خۆی بردبێت بەوەی سێکسی لەگەڵ پیاوێکدا کردبێت. کاتێك کچ بووم هیچ یەك لەمانە جێگای سەرنجی من نەبوون، چونکو منداڵ بووم و هەرگیز بیرم لە سێکس یان شووکردن نەکردبووەوە.

ئاوا بووم تا ئاگاداری شووکردنی شوکرین بوومەوە. چەند ڕۆژ دواتر، ئێوارەیەکیان باوکم هاتە ماڵەوە و گوێم لێبوو هاواری لەمن دەکرد، 'ئەرێ واریس لە کوێیە؟'

'لێرەم، باوکە' هاوارم بۆ کرد.

' وەرە بۆ لام،' بە دەنگێکی نەرمەوە بانگی کردم. ئاسایی زۆر مۆن و تووڕە بوو، لەبەرئەوە زانیم شتێك لە ئارادایە. وای بۆدەچووم ئیشێکی بە من هەبێت بۆ سبەینێ لەپەیوەند بە ئاژەڵەکاندا کارێکی بۆ بکەم، بچم بەدوای ئاودا، یان کارێکی تر لەم بابەتانە. لەبەرئەوە لە جێگای خۆم مامەوە و بە وردی کەوتمە تەماشاکردنی باوکم، هەوڵمدا بیخوێنمەوە چی لە ژێر سەردایە. 'وەرە، وەرە، وەرە، وەرە،' بێئارامانە هاواری دەکرد. دوو هەنگاوم بەرەو ڕووی نا، بەگومانەوە تەماشام کرد، بەڵام هیچ شتێکی نەوت. باوکم لە باوەشی گرتم و لەسەر ئەژنۆی دانیام. 'دەزانی،' دەستی پێکرد، 'بەڕاستی تۆ کچێکی چاکی.' ئیتر زانیم شتێکی گرنگ لە ئارادایە. 'بەڕاستی کچێکی باشی، زیاتر وەك کوڕ، زیاتر وەك کوڕی من وای.' زانیم ئەمە گەورەترین ستایشە.

'دەی، دەی،' وەڵامم دایەوە، بەدوای ئەوەوە بووم، کە بۆچی ئەم بەخشیشەم پێدەدات.

'وەك کوڕی من وایت، وەك هەر پیاوێکی تر باش کاردەکەیت، چاودێرییەکی باشی ئاژەڵەکان دەکەیت. تەنیا دەمەوێت بزانی کە جێگای تۆم هەرگیز بۆ پڕنابێتەوە.'

کاتێك ئەوەی وت، بۆ ئەوە چووم کە باوکم ترسی لێنیشتووە، نەوەکو منیش وەك

ئامان هەڵبێم. کاتێك باوکم ویستی ئامان بدا بە شوو، ڕایکرد. باوکم دەترسا منیش وەك ئەو ڕاکەم و ئەو هەموو کارە بەسەر ئەو و دایکمدا جێبهێڵم.

هەزار خەیاڵ بە مێشکمدا هات، باوەشم بە باوکمدا کرد و هەستم بە تاوانباری دەکرد، کە ئەوەندە گومانم لێبکرێت. 'ئۆی، باوکە، من بۆ هیچ شوێنێك ناچم!'

تۆزێك سەری بردە دواوە، لە دەموچاوم وردبووەوە. بە دەنگێکی ناسك وتی، 'ئا، تۆ، دڵەکەم.'

'بۆ کوێ دەچم؟ من بۆ هیچ شوێنێك ناچم - من، تۆ و دایکم جێناهێڵم.'

'ئا، تۆ، واریس، من هاوسەرێکم بۆ دۆزیویتەوە.'

'نا، باوکە، نا!' دەرپەڕیم و باوکم ویستی لە دواوە بمگرێت، ویستی قۆڵم بگرێت و دامنیشێنێت. 'من ناومەوێ بڕۆم، من نامەوێ ماڵەوە جێبهێڵم، دەمەوێت لەگەڵ تۆ و دایکمدا بمێنمەوە!'

'ش، ش، ش، ژیانت خۆش دەبێت. هاوسەرێکی باشم بۆ دۆزیویتەوە.'

'کێیە؟' بەشێوەیەکی سەیر وتم.

'دەیبینیت.'

هەر دوو چاوانم پڕبوو لە فرمێسك، هەرچەند هەوڵمدا بەهێز بم. دەستم کرد بە لێدانی باوکم و هاوارم کرد، 'من نامەوێ شووبکەم!' 'باشە، واریس، تەماشاکە....' باوکم دەستی برد بەردێکی هەلگرتەوە و هەردوو دەستی خستە پشتیەوە و دەستاودەستی بە بەردەکە کرد. پاشان هەر دوو دەستی بە نووقاوی خستە بەردەمم، لەبەرئەوە ئەم دەزانی بەردەکە لەناو کامیاندایە. 'هەڵبژێرە دەستی ڕاست یان چەپ. ئەو دەستە هەڵبژێرە کە بەردەکەی تیادایە. ئەگەر هەڵتهێنا، ئەوا من چیم وت دەبێت بە قسەم بکەیت و هەموو ژیانت بەختەوەر دەبیت. ئەگەر هەڵتنەهێنا، ئەوا ژیانت هەر ناخۆشی دەبێت، چونکو لە خێزان بێبەش دەبیت.'

سەیرێکی باوکمم کرد و کەوتمە بیرکردنەوەوە، کە ئەگەر هەڵینەهێنم چی ڕوودەدا. بەرەو مردن دەچم؟ دەستم برد بۆ دەستی چەپی. دەستی پانکردەوە و هیچی تیادا نەبوو. 'خەملاندبووم ئەوەی تۆ دەیڵێیت بەقسەت ناکەم،' بە خەمبارییەوە لەژێر لێودوە وتم.

'دەتوانین دووبارەی بکەینەوە.'

'نا.' بەهێواشی سەرم بادا. 'نا، بابە. من شوو ناکەم.'

'پیاوێکی باشە!' باوکم هاواری کرد. 'تۆ دەبێت متمانە بە من بکەیت - کەسێك ببینم دەزانم پیاوێکی باشە. ئەوەی من دەیڵێم دەبێت بیکەیت!'

هەستامە سەرپێ، دەست لە ئەژنۆ درێژتر، هەستی ترس و نەخۆشی دایگرتبووم و سەرم بادا.

ئەو بەردەی کە لەدەستی ڕاستیدا شاردبوویەوە، بەرەو تاریکایەکە فڕێی دا و هاواری کرد، 'دەی تەواوی ژیانت بەختت ڕەش دەبێت!'

'وایە، دەمزانی من ئەو کەسەم، کە ژیانێکی وام دەبێت، وا نییە؟' زللەیەکی قایمی لێدام، چونکو کەس بۆی نەبوو قسە لە قسەی باوکمدا بکات. ئێستا تێدەگەم، کە دەبوو فریاکەوێت زوو بە شووم بدات، چونکو ئەو هەڵسوکەوتەی من لەگەڵ هیچ داب و نەریتێکدا نەدەهاتەوە. سەرکەشێکی کوڕانەی چەتوونی چاونەترسم لێدەرچووبوو، خەریکبوو ناوم دەزڕا. تا بازاڕم مابوو دەبوو باوکم هاوسەرێکم بۆ بدۆزێتەوە، چونکو هیچ پیاوێکی ئەفریقی ژنێکی ناوێت کە کێشەی بەدواوە بێت.

بۆ سبەینێ بەیانی هەستام و ئاسایی ئاژەڵەکانم برد بۆ لەوەڕ. کاتێك چاودێریم دەکردن، کەوتمە بیرکردنەوەی بیرۆکەی تازەی شووکردن. هەوڵمدا بیر لە ڕێگایەك بکەمەوە، کە باوکم ڕێگام بدا لە ماڵەوە بمێنمەوە، بەڵام لە ناخی دڵەوە دەمزانی ئەمە هەرگیز نابێت. بۆم پرسیاربوو، ئەوەی دەبێت بە هاوسەری من کێ بێت. تا

ئەو کاتە، تەنیا خۆشەویستییەکی منالآنە بووبێتم، هەر ئەوە بوو کە دڵم چووبوو بە جامای کوڕی هاوڕێکەی باوکمدا. بۆ چەند جارێك بینیبووم، چونکو لەگەڵ خێزانەکەیان زوو زوو پێکەوە کۆچمان دەکرد. جاما دیاربوو کە لە من گەورەترە، زۆر بە قۆزم دەزانی، بەلآم هێشتا ژنی نەهێنابوو. باوکم وەك کوڕی خۆی خۆشی دەویست و لەو باوەڕەدا بوو، باوکی وەجاخی ڕوونە. بەلآم لەوەدەچوو زۆرترین سەرنج ڕاکێشانی من بە لای جامادا لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت، کە ماوەیەکی زۆر حەزی لە ئامانی خوشکم کردبوو و نەیدەزانی کە من حەزم لێکردووە. من لەچاوی ئەودا کچێکی منداڵ بووم، لەکاتێکدا ئامان جێگای حەز و ئاوات بوو. کاتێك کە چرپاندم بە گوێیدا کە جاما حەزی لێکردووە، ئامان دەستی ڕاوەشاند و وتی، 'ویشش.' ئیتر ئامان ڕووی تێنەکرد، چونکو تێری خواردبوو لە ژیانی کۆچەری و سەرنجی بەلای پیاوێکی وەك باوکماندا نەدەچوو. هەمیشە قسەوباسی چوون بۆ شار و شووکردن بە پیاوێکی دەوڵەمەند بوو. کاتێك باوکم ویستی بیدا بەشوو بە یەکێك لە هاوڕێ کۆچەرییەکانی خۆی، هەڵهات و دوای ئاواتەکانی خۆی کەوت لە شاری گەورەدا.

تەواوی ئەو ڕۆژە، کە دانیشتبووم و چاودێری ئاژەڵەکانمم دەکرد، هەوڵم دەدا خۆم ڕازیکەم، کە لەوانەیە شووکردن خراپ نەبێت و ژیانی خۆمم لەگەڵ جامادا، وەك ژیانی دایك و باوکمم، دەهێنایە بەرچاوی خۆم. کاتێك ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەڕۆیشت، لەگەڵ ئاژەڵەکانمدا بەرەو ماڵ گەڕامەوە. خوشکە بچوکەکەم بەرەو پیرم هات و پێی ڕاگەیاندم، 'بابە کەسێکی لەگەڵدایە و لەو باوەڕەدام چاوەڕوانی تۆ دەکەن.' خوشکەکەم لە ناوکەوتنە ناو ناوانەوەی لە پڕی واریس کەوتبووە گومانەوە، بەوەی کە لەوانەیە شتێکی باش هەبێت و ئەو لێی بێبەش بێت. بەلآم من موچورکە بە گیانمدا هات، چونکو دەمزانی باوکم خەریکی پلانی خۆیەتی - وەك ئەوەی من هیچ نارەزایەتییەکم نەبووبێت.

`لە کوێن؟` خوشکەکەم دەستی ئاراستەی شوێنێ کرد، و پاشەوپاش گەڕامەوە و لەوان دوورکەوتمەوە.

`واریس، ئەوان چاوەڕوانی تۆ دەکەن!` خوشکەکەم هاواری لێکردم.

`ئای، دەمت داخە! لێم دوورکەوەرەوە!` بزنەکانم خستە پەچەکەوە و کەوتمە دۆشینیان. کاتێك دەستم بەکارەکەوە بوو، گوێم لێبوو باوکم بانگی دەکردم. `بەڵێ، بابە. وا هاتم.` بە ترسەوە هەستامە سەرپێ، چونکو دەمزانی شەڕێکە و بەر دەرگای پێگرتووم و گەڕانەوەی نییە. تروسکاییەك لە دڵمدا هەبوو، کە بەلکو جاما لەگەڵ باوکمدا چاودڕوانم بکەن و دەموچاوە جوانە سافەکەیم هێنایە بەرچاوی خۆم. بەچاوی نووقاودود بەرەو ڕوویان ڕۆیشتم. `تکایە با جاما بێت...` لەبەرخۆمەوە دەموت لەکاتێکدا قاچم هڵدەنووت. جاما بووبوو بە ئازادکەرم لەو بیرۆکە ناحەزە، کە ماڵەوە بەجێبهێڵم بۆنەوەی لەگەڵ پیاوێکی نەناس بژیم.

لەکۆتاییدا چاوم کردەوە و بەردو سوورایی ئاسمان ڕوانیم، ڕۆژ لە ئاوابووندا بوو، سێبەری دوو پیاوم لە پێش خۆمەوە دەبینی. باوکم وتی، `نۆی، ئەوە لێرەی. وەرە ئێرە، دڵەکەم. ئا ئەمە بەڕێز.....` هیچی ترم نەبیست بیلێت. ڕوخسارێك لەچاوم چەقی، کابرایەك دانیشتبوو، گۆچانێکی بەدەستەوە بوو. بەلایەنی کەمەوە تەمەنی شەست ساڵ دەبوو، بە ڕیشێکی سپی درێژەوە.

`واریس!` لەکۆتاییدا بە ئاگا هاتمەوە، کە باوکم قسە بۆ من دەکات. `بە بەڕێز گالول بڵێ چۆنی.`

`چۆنی،` بەو پەڕی ساردییەوە کە لە زمانم بێتەدەرەوە، وتم. دەبوو ڕێزی لێبگرم، بەڵام پێویست نەبوو بە پەرۆش بم. ئەو ناشیرینە پیرە لەویدا دانیشتبوو بەمن زەردەخەنە دەیگرت، بە تەواوی خۆی دابوو بەسەر گۆچانەکەیدا، بەبێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە. لەوانەیە نەیزانیبێت چی بڵێت بە کچێك کە خەریکە مارەی

دەكات، بەڵام ئەو بە ترسەوە تەماشای دەكات. بۆ شاردنەوەی نیگام سەرم داخست و چاوم لە زەوییەكە بڕی.

'دەی، واریس، دڵەكەم، شەرم مەكە،' باوكم وتی. تەماشایەكی باوكمم كرد، كاتێك كە دەموچاومی بینی، تێگەیشت كە باشترین شت ئەوەیە كشم لێبكات، تا هاوسەری داهاتووم نەترسێنم. 'باشە، دەی برۆ كارەكەی خۆت تەواو كە.' ڕووی لە گالول كرد و بۆی باسكرد، 'هەر خۆی شەرمنە، كچێكی گەنجی بێدەنگە.' یەك چركە بۆی نەوەستام و گەڕامەوە بۆ لای بزنەكانم.

تەواوی ئەو ئێوارەیە بیرم لەوە دەكردەوە ژیانم چۆن دەبێت گەر شووبكەم بە گالول. هەرگیز لە دایك و باوكم دوورنەكەوتبوومەوە، هەوڵم دەدا وێنەی ژیانم بكێشم كە ئەوانی تیادا نەبێت، بەڵام لەجیاتی ئەوان كەسێكی تیادا بێت كە هەتا نایناسم. بەلایەنی كەمەوە بەختم بوو، لەو كاتەدا بیرۆكەی ئەوەی لەگەڵ ئەو كابرا پیرە قێزهێنەرەدا سێكس بكەم، نەم دەخستە سەرباری ئەو پەژارەیەی كە هەم بوو. بەڵام لەو تەمەنە هەستیارەی سیانزە ساڵیدا، كامڵ نەبووم كە لەو بەشە سەودایە تێبگەم. جامی پەرێشانی گرفتی شووكردنم لە سەری برا بچوكەكەمدا خاڵی كردەوە.

بۆ سبەینێ بەیانی زوو باوكم بانگی كردم.

'دەزانی ئەو كەسەی دوێنێ شەو بینیت كێ بوو؟'

'پێشبینی دەكەم.'

'ئەوە هاوسەری داهاتووی تۆیە.'

'بەڵام باوكە، زۆر پیرە!' هێشتا نەمدەتوانی باوەڕبكەم، كە باوكم ئەوەندە منی بۆ گرنگ نەبێت و هەروا سوك و ئاسان بمنێرێت لەگەڵ پیاوێكی وەهادا بژیم.

'ئەوە لە هەموو كەس باشترە، دڵەكەم! تەمەنی ئەوەی نەماوە دوای ئەم ژن و ئەو ژن بكەوێت، ژنت بەسەردا بێنێت. جێتناهێڵێت - هەر چاوی لە تۆیە. سەرەڕای ئەوەش - باوكم بە شانازییەوە زەردەخەنە دەیگرت - دەزانی چەندت پێدەدات؟'

`چەند؟`

`پێنج حوشتر! پێنج حوشترم پێدەدات.` باوکم دەستی هێنا بە قۆڵمدا. `من زۆر شانازی بە تۆوە دەکەم.`

ڕووم لە باوکم وەرگێڕا، وردبوومەوە لە تیشکی ئاڵتونی خۆری بەیانی کرد، کە ژیانی بیابان دەهێنێتە جۆش. چاوم داخست، لەسەر دەموچاوم هەستم بە گەرمایی دەکرد. گەڕامەوە خەیاڵاتی شەوی پێشووم، کە نەمتوانی خەوم لێبکەوێت. تا بەیانی لەناو خێزانەکەماندا خۆم حەشار دا، چاوم لە ئەستێرە گەشەکان بڕیبوو بەسەرمەوە و بڕیارم دەدا چی بکەم. دەمزانی ئەگەر مانبگرم لە شووکردن بەو پیاوە پیرە، دەردێك دەوا ناکات. باوکم پیاوێکی تر، پاشان کابرایەکی تر، پاشان یەکێکی تر دەدۆزێتەوە، چونکو بڕیاری دابوو خۆی لەدەست من ڕزگار بکات.... و حوشتری خۆی وەرگرێت. سەرم بۆ لەقاند. `باشە، بابە، ئێستا دەچم ئاژەڵەکان دەبەمە دەرەوە.` باوکم بە ئاهێکی ئاسودەوە تەماشای کردم، مێشکیم خوێندەوە چی تیادایە: `ئایی، زۆر ئاسانتر دەرچوو لەوەی کە بیرم لێدەکردەوە.`

ئەو ڕۆژەی کە دانیشتم و چاودێری یاریکردنی بزنەکانی باوکمم دەکرد، زانیم ئەمە دوا جارە. وێنەی ژیانی خۆمم لەگەڵ ئەو پیاوە پیرەدا کێشا، پێکەوە تاق و تەنیا لە بیابانی کاکی بە کاکیدا. ئەو شەلە شەل بە گۆچانەوە خەریکی گەڕانە، منیش هەموو ئیشێك بەسەر شانمەوە. ئەو تووشی دەردە دڵ دەبێت، باشتر کە دەمرێت، منیش تەنیا چوار پێنج منداڵ بە بەردەوە و دەبێت هەر خۆم گەورەیان بکەم. چونکو لە سۆماڵ بێوەژن شووناکاتەوە. بڕیاری خۆمم دا - ئەمە ئیتر نەبوو بە ژیان. ئەو شەوە کە گەڕامەوە ماڵەوە، دایکم پرسیاری لێکردم هیچ بووە.

`ئەو پیاوەت بینی؟` بە ساردییەکەوە وتم.

پێویست نەبوو بڵێت چ پیاوێك. `بەڵێ، لەم ڕۆژانەدا بینیوومە.`

بۆ ئەوەی باوکم گوێی لێنەبێت، پەرۆشی چرپەیەك بووم لەگەڵ دایکمدا، 'دایکە، من نامەوێت شووبکەم بەو پیاوە!'

دایکم شانی هەڵتەکاند. 'باشە، دڵەکەم. هیچ بەدەست من نییە. من دەتوانم چیی بکەم؟ ئەوە بڕیاری باوکتە.' دەمزانی لەوانەیە سبەینێ دوو سبەی هاوسەرەکەم بە خۆی و هەر پێنج حوشترەکەیەوە بێت و داینێت و دەستی من بگرێت و بمبات. پلانی خۆمم دانابوو پێش ئەوەی درەنگ بکەوم.

ئەو ئێوارەیە پاش ئەوەی هەموو نووستن، گوێقوڵاغی پرخەپرخی باوکم بووم. هەستام و چووم بۆ لای دایکم کە هێشتا لەبەر ئاگرەکەدا دانیشتبوو. 'دایە،' بە گوێیدا چرپاندم، 'من ناتوانم شوو بەو پیاوە بکەم - من هەڵدێم.'

'شش، وسبە! بۆ کوێ، بەبە؟ بەرەو کوێ دەچیت؟'

'پوورم دەدۆزمەوە لە مەقادیشۆ.'

'دەزانی لە کوێیە؟ من نازانم!'

'نیگەران مەبە، دەیدۆزمەوە.'

'باشە، ئێستا دنیا تاریکە،' دایکم لێکی دایەوە، وەك ئەوەی بییەوێت پێش بە ئاکامی ئەمە بگرێت.

'ئێستا نا، بەیانی،' بە گوێیدا چرپاندم. 'هەڵمسێنە پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵبێت.' دەمزانی پێویستیم بە یارمەتی ئەو هەیە، چونکو کاتژمێری خەبەرکردنەوە نەبوو تا بیخەمە سەر زەنگ. پێویستم بەوە بوو تۆزێك وچان بدەم پێش ئەوەی سەفەری دوورودرێژم دەستپێبکەم، بەڵام دەمویست بکەومە ڕێ پێشئەوەی باوکم لە خەو هەستێت.

'نا.' دایکم سەری بادا. 'زۆر مەترسیدارە.'

'دەی، تکات لێدەکەم! دایە، من ناتوانم شوو بە پیاوێکی وا بکەم و ببم بە ژنی! تکایە، تکایە. دەگەڕێمەوە بۆ لات. دەزانی دەیکەم.'

"برۆ بنوو." دایکم نیگایەکی مۆنی بە خۆیەوە گرت، نیگایەك کە دەیوت باسەکە داخە. دایکی شەکەتم بەدیار ئاگرەکەوە جێهێشت و چووم و خۆم خزاندە نێوان قاچ و دەستی برا و خوشکەکانمەوە تا گەرمم بێتەوە.

نووستبووم، هەستم کرد دایکم بە هێواشی دای بە قۆڵمدا. لەسەر زەوییەکە لەتەنیشتم لەسەر ئەژنۆ دانیشتبوو. "هەستە برۆ." دەستبەجێ لە خەو ڕاپەڕیم، پاشان غەمبارییەك دایگرتم لەبەرامبەر ئەوەی دەیکەم. بە وریاییەوە لەنێو لەشە گەرمەکاندا خۆم کێشایە دەرەوە و بۆ دڵنیایی تەماشایەکی باوکمم کرد بۆ ئەوەی بزانم لە شوێنی خۆیەتی کە لەوێوە ئاسایی چاودێری خێزانەکەی دەکرد. هێشتا لە جێگای خۆیەوە پرخەی دەهات.

دەلەرزیم کاتێك لەگەڵ دایکم لە دەوارەکە دوورکەوتینەوە. "دایە، سوپاست دەکەم بۆئەوەی منت خەبەرکردەوە." لەو تاریك و ڕوونی بەیانییەدا هەوڵمدا دەموچاوی ببینم وەك یادگارییەك لە مێشکمدا هەڵیگرم، چونکو بۆ ماوەیەکی زۆر دوور و درێژ نەم دەبینییەوە. بڕیارم دابوو بەهێز بم، بەڵام زۆرم لەخۆم کرد نەمهێشت فرمێسکەکانم بێتە خوارەوە و قایم باوەشم کرد بە دایکمدا.

"برۆ - برۆ پێش ئەوەی باوکت خەبەریبێتەوە،" بە هێواشی بە گوێمدا چرپاندی. هەستم بە قایمی باوەشەکەی کرد بەدەوری خۆمدا. "باش دەبێت - نیگەرانی ئەوە مەبە. بەس زۆر ئاگات لەخۆت بێ. وریا بە!" لێم چووە دواوە. "واریس.... تکایەکت لێدەکەم. منت لەبیرنەچێت."

"هەرگیز، دایە...." خێرا پشتم لە دایکم کرد و بەرەو تاریکایی ڕام کرد.

## بەشی شەشەم

## لە ڕێگادا

تەنیا چەند کیلۆمەترێك ڕۆیشتبووین کە پیاوە جوانپۆشەکە، لە ڕێگا لایدا و ئوتومبیلەکەی ڕاوەستاند. 'بەداخەوە لەمە زیاتر ناتوانم بتگەیەنم. ئالێرەدا داتدەبەزێنم تا لەگەڵ یەکێکی تردا سوار بیت.'

'ئۆی...' هەواڵێکی ناخۆش بوو، لەوەتەی لەدەست باوکم هەڵهاتبووم،ماڵەوەم جێهێشتبوو، بیابانم بڕیبوو، چەند ڕۆژم بە برسێتی بەسەربردبوو، لووتم بە لووتی شێردا تەقیبوو، قامچی شوانم خواردبوو و لەلایەن شۆفێری لۆرییەوە پەلامار درابووم، ئەم پیاوە جوامێرە باشترین کەس بوو کە تووشی بووبووم.

'سەفەرێکی خۆش،' لە پەنجەرەی کراوەی ئوتومبیلەکەیەوە هاواری کرد و دەستی ڕاوەشاند، دانە سپییەکانی دەرکەوتنەوە. لە کەنار جادەی پڕ تەپۆتۆزدا، لەبەر هەتاوەکە ڕاوەستام و بە ساردییەکەوە دەستم بۆ ڕاوەشاند. ماشێن بە خێرایی و لەناو هاڵاوی گەرمیدا لێم دوورکەوتەوە و منیش کەوتمەوە ڕۆیشتن، بۆم پرسیاربوو، کە بەرەو مەقادیشۆ دەڕۆم.

ئەو ڕۆژە چەند جار سواری ماشێن کرام، بەڵام هەموویان کورت ماوەبوون. دەمەوو ئێوارە، ماشێنێکی بارهەڵگری گەورەی تر لای دایە کەنار جادەکە. ترس دایگرتم کە لایتە سوورەکانی ستۆپم بینی، بەسەرهاتی لۆرییەکەم هاتەوە یاد. کاتێك ڕاوەستابووم و بیرم دەکردەوە، شۆفێرەکە سەری لەپەنجەرەکەی هێنایە دەرەوە و ئاوڕی بۆ دامەوە. دەمزانی ئەگەر زوو نەکەومە خۆ جێم دەهێڵێت، لەبەرئەوە یەکسەر بەرەو ماشێنەکە ڕام کرد. بارهەڵگرەکە زۆر گەورە نەبوو، شۆفێرەکە لەناوەوە دەرگاکەی بۆ کردمەوە کاتێك هەوڵمدەدا سەرکەوم. 'بەرەو کوێ دەچیت؟' شۆفێرەکە وتی. 'من لە گالکایۆ زیاتر ناچم.'

کە شۆفێرەکە وتی "گالکایۆ." بیرێکی زۆر بە مێشکمدا هات. نەمدەزانی ئەوەندە لەو شارە نزیك بوومەتەوە، کە مامە دەوڵەمەندەکەم لەوێ دەژیا. لەجیاتی ئەوەی هەموو سۆماڵ بکێڵم بەدوای مەقادیشۆدا، دەتوانم لەلای مامە ئەحمەد بمێنمەوە. لە مێشکی خۆمدا هەندێك کاری نیوە ناچڵم لەگەڵیدا مابوو، چونکە هیچ کات ئەو جوتە پێڵاوەم وەرنەگرت، وەك پاداشتێك بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵەکانی. بیرم لە ژەمێك خواردنی زۆر دەکردەوە لە خانووە ڕازاوەکەیدا، کە ئەو شەوەی دەگەمە ئەوێ و لەوێ دەنوم لەجیاتی ئەوەی لە ژێر درەختدا. "بەڵێ، هەر ئەو شوێنەیە کە بۆی دەچم." زەردەخەنە گرتمی، وەك ئەوەی هەواڵێکی خۆشم بیستبێت. "منیش بەردو گالکایۆ دەچم." پشتی ماشێنەکە بارکرابوو لە خواردن: شارای گەنمەشامی، گونییە برنج و شەکر. بە تەماشاکردنیان هەستی برسێتیم زیاتر دەوروژا.

شۆفێرەکە تەمەنی نزیك چل ساڵ بوو و هەوەسبازێکی تەواو بوو. بەردەوام هەوڵی دەدا قسە دامەزرێنێت، منیش دەمویست برادەرێتی لەخۆ نیشان بدەم، بەڵام بە تەواوی ترسم لێنیشتبوو. دوا شت ئەوە بوو ڕێگای پێبدەم دەستێکم بۆ بەرێت. لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد، بیرم لە ڕێگایەك دەکردەوە چۆن ماڵی مامم بدۆزمەوە، چونکە هیچم نەدەزانی لەکوێ دەژی. بەڵام پاشان قسەیەکی شۆفێرەکە سەرنجی ڕاکێشام: "تۆ هەڵهاتووی، وا نییە؟"

"بۆچی وا دەڵێیت؟" بەسەرسامییەوە وتم.

"دەتوانم وا بڵێم دەزانم. دەدبەم و دەتدەمە دەست پۆلیس."

"چی نا! تکات لێدەکەم.... . تۆ تەنیا بمگەیەنە... بمگەیەنە گالکایۆ. من هاتووم بۆ سەردانی مامم، لەوێ چاوەڕێم دەکات." بە دەموچاویدا دیاربوو باوەڕم پێناکات، بەڵام لە ڕێگای خۆی لای نەدا. کەوتمە بیری ئەوەوە - لەکوێ بە شۆفێرەکە بڵێم دام ببەزێنێت؟ پاش ئەوەی وتبووم، مامم چاوەڕوانمە، نەمدەویست پێی بزانێ، کە نازانم لەکوێ دادەبەزم. کە چوینە ناو شار بەهەر چوار دەوری خۆمدا تەماشای

جادەکانم دەکرد کە تەنرابوو بە خەڵك، ماشێن و خانووبەرە، ئەمە زۆر لەو لادێیە گەورە تر بوو کە لەوەوپێش بینیبووم. دیاربوو کە زۆر سەختە مامم بدۆزمەوە.

لە کورسی ماشێنەکەوە بە نیگەرانیەوە تەماشای ژاوەژاوی گالکایۆم دەکرد. لەبەرچاوم، ئاژاوە هەموو شاری گرتبوودوە، گیرم کردبوو لە نێوان ئەوەی نەمدەویست لە ماشێنەکە بێمەخوارەوە، لەگەڵ ئەوەی لەپڕ دەرپەڕمە دەرەوە پێش ئەوەی شۆفێرەکە بڕیار بدات، وەك ڕاکردوویەك بمداتە دەست پۆلیس. کاتێك لەبەردەم بازاڕێکدا وەستا، چاوم بە گالیسکەی پڕ خوادن کەوت، بڕیارم دا دابەزم. 'ئەوا، کاکە، لێرەدا دادەبەزم. مامم لەو خوارەوە دەژی.' ئەمەم وت، هێمایەکم بەرەو کەناری جادەکە کرد و بازم دایە خوارەوە پێش ئەوەی بتوانێت بەرم پێبگرێت. 'سوپاس بۆ سواربوونەکە،' ئەمەم وت کاتێك دەرگاکەم داخست.

بەسەرسامییەوە بەناو بازاڕکەدا ڕۆیشتم. هەرگیز لە ژیانمدا ئەوەندە خواردنم نەبینیبوو. بیرم دێتەوە کە چەند پێم جوان بوون! کۆمێك لە تەماتە، شاخێك لە گەنمەشامی، ڕەفەی پڕ قوتووی مەعکەرۆنی و سپاگێتی. بە هەموو ڕەنگێکەوە! سەبەتەی قەڵاچنراوی مۆزی زەردی کاڵ، شوتی ڕەنگ ئاڵتونی و سەوز و هەزار بە هەزاری تەماتەی سوور. لەوەوپێش هەرگیز ئەم خواردنانەم نەبینیبوو، لەبەردەم نمایشی ئەم تەماتانەدا وەستام. لەو کاتەوە حەزم لە تەماتەی گەیوی بەتام کردووە و تا ئیمرۆش چەندی لێبخۆم تێرنابم. هەروا تەماشای ئەم خواردنانەم دەکرد و ئەو خەڵکەش کە بەناو بازاڕەکەدا تێدەپەڕین تەماشای منیان دەکرد. ئەو ژنەی کە خاوەنی گالیسکەکە بوو بە تووڕەییەوە بەرەو ڕووم هات. دایکێکی تەواو بوو. (لە ئەفریقادا واژەی 'دایە' بۆ ڕێزلێنان بۆ ژن بەکاردێت. بە واتای ئەوەیە تۆ کامڵی، تەمەنێکت بەسەربردووە و بۆئەوەی شایەنی ئەمە بیت، لەڕاستیدا دەبێت ببیت بە دایك.) هەموو جلوبەرگ و سەرپۆشەکەی بریق و باقی دەهات. 'چیت دەوێت؟' ژنەکە پرسیاری کرد.

"تکات لێدەکەم، دەتوانی تۆزێکم لەوە بدەیتێ؟" دەستم بۆ تەماتەکە ڕاکێشا و وتم.

"پاردت پێیە؟"

"نا، بەڵام برسیمە "

"برۆ لەم ناوە - بڕۆ!" هاواری لێکردم و دەستی بەرزکردەوە تا لە گالیسکەکەی دوورم خاتەوە.

چووم بۆ لای گالیسکەیەکی تر و دەستم کردەوە بە تەماشاکردن. ئەم ژنەیان وتی، "پێویستم بە هیچ سواڵکەرێك نییە لەبەردەمی گالیسکەکەمدا ڕاوەستێت. من لێرەدا خەریکی کاسپی خۆمم. بڕۆ. دوورکەوەرەوە."

بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێڕایەوە کە بە دوای مامە ئەحمەدەوەم و پرسیارم لێکرد کە لە کوێ دەژی. وام دانابوو لەبەرئەوەی مامم کاسپکارێکی دەوڵەمەندە، دەبێت خەڵکی گالکایۆ بیناسن. "سەیرکە، دەمت داخە. تۆ لە دەوەنەوە هاتوویتەتە دەرەوە و بۆت نییە لێرە دەست بە هاتوهاوار بکەیت. شش. کچێ ڕێزی خۆت بگرە. دەبێت بێدەنگ بیت. بێدەنگ. لەناو خەڵکدا ناوی کەسوکارت مەبە." لە ژنەکە وردبوومەوە، کەوتمە بیرکردنەوە، ئەم ژنە لەبارەی چییەوە قسەدەکات و چۆن لەگەڵ ئەم خەڵکەدا بکەومە گفتوگۆ؟

لەتەنیشتمانەوە، پیاوێك پاڵی دابوو بە دیوارێکەوە. بانگی کردم، "کیژۆڵە، وەرە نێرە." بەخۆشییەوە چووم بۆ لای و هەوڵمدا کێشەکەی خۆمی بۆ باسبکەم. پیاوەکە تەمەنی نزیك سی ساڵ دەبوو. ئەفریقاییەکی ئاسایی دیاربوو - شتێکی تایبەتی نەبوو بەڵام دەموچاوێکی دۆستانەی پێوە بوو. لەسەرخۆ وتی، "تەنیا ئارام بە. من دەتوانم یارمەتیت بدەم، بەڵام دەبێت ووریا بیت. نابێت لەخۆتەوە بچیت و هەروا ناوی خێڵەکەتان بەری. سەر بە چ خێڵێکی؟" ئەوەی دەمزانی لەبارەی خێزانەکەمان

و مامە ئەحمەدەوە، پێم پێوت. 'چاکە، لەو باوەڕەدام دەزانم لە کوێ دەژی. با بڕۆین و یارمەتیت دەدەم بیدۆزیتەوە.'

'ئۆی، تکایە - تکایە، دەتوانی بمبەیت بۆ ئەوێ؟'

'نا، خێراکە. نیگەران مەبە، ئەو پیاوە دەدۆزینەوە.' لە بازاڕی قەرەباڵغ چووینە دەرەوە، بەلای بەری جادەی سێبەردا چووینە خوارەوە. لەبەردەمی خانوویەکدا پیاوەکە وچانێکی دا. 'برسیتە؟' ئاسایی بە چاوانمدا بۆ هەر کەسێك ئاشکرا بوو.

'بەڵێ.'

'چاکە، ئەمەماڵی منە. بۆ نایەیتە ژوورەوە و شتێکت بدەمێ بیخۆیت، پاشان دەتوانین مامت بدۆزینەوە؟' بە مەمنونییەوە ئەم پێشنیارەم قبووڵ کرد.

هەر کە چووینە ماڵەوە بۆنێکی زۆر نامۆ هات بەسەرمدا، بۆنێکی نائاشنا بوو. کە هەرگیز لەوەوپێش بۆنم نەکردبوو. داینیشانم و خواردنی بۆ هێنام. هەر کە دوا پاروم تەواو کرد، وتی، 'بۆچی نایەیت، لەگەڵمدا پاڵکەویت و سەرخەوێك بشکێنین؟'

'سەرخەو؟'

'نا، وچانێك بدەین.'

'نا، تکات لێدەکەم. تەنیا دەمەوێ مامم بدۆزمەوە.'

'دەزانم، دەزانم. بەڵام با لەپێشدا سەرخەوێك بشکێنین. کاتی سەرخەو شکاندنە. پاشان دەیدۆزینەوە، نیگەران مەبە.'

'نا، تکات لێدەکەم. تۆ بڕۆ - من لێرانەدا چاوەڕوانت دەبم. من گوێ نادەمێ.' هەرچەند کاتی سەرخەو شکاندن بوو، بەڵام من هیچ نییەتێکم نەبوو لەگەڵ ئەو پیاوە نەناسەدا پاڵکەوم. دەمزانی لەم کارەدا هەڵەیەکی زۆر گەورە هەیە. بەڵام وەك کچێکی بچوکی نەفام، نەمدەزانی لەو کاتەدا چی بکەم.

"سەیرکە، کچۆڵە،" بە توڕەییەوە وتی، "ئەگەر دەتەوێت بتبەم بۆ دۆزینەوەی مامت، باشترە لەگەڵمدا پالکەویت و سەرخەوێك بشکێنین." دەمزانی پێویستم بە یارمەتی ئەم پیاوە هەیە بۆ دۆزینەوەی مامم. هەرکە دڕندەیی و سووربوونی بەرەو زیادبوون چوو، ترسم لێنیشت، لەکۆتاییدا خراپترین ڕێگام گرتەبەر. ملم بە داواکەی دا. بێگومان چرکەیەکی نەبرد، کە لە سەر جێگاکەی پالکەوتین، سەرخەو شکاندن لە مێشکیدا دوا شت بوو. لە دوو چرکەدا ئەم حیزە دەویست سوارم بێت. کاتێك لە بەرامبەریدا وەستامەوە و لێی دوورکەوتمەوە، زرمەی لە پشتی سەرم هەڵساند. وابزانم ورتەی لە دەم نەهاتە دەرەوە، بەڵام هەلم لەدەست خۆم نەدا، لە ژێر چنگی خۆم ڕزگار کرد و لە ژوورەکەی دەرپەڕیمە دەرەوە. کە ڕام کرد، گوێم لێبوو لەناو جێگاکەیەوە هاواری لێکردم، "هۆ، کچە بچکۆلە، بگەڕێرەوە ..." پاشان گوێم لێی بوو پێکەنینێکی هێواشی لێوە هات.

بە گریانێکی پەرکەمانەوە بەناو جادەکەدا ڕام کرد بەرەو بازاڕەکە، بەدوای کەسێکەوە کە دالدەم بدات. داپیرەیەك بۆ لام هات، تەمەنی نزیك شەست ساڵ دەبوو.. "منداڵ، چی ڕوویداوە؟" بەهێواشی قۆڵی گرتم و داینیشاندم. "وەرە، وەرە، قسەم بۆ بکە  پێم بڵێ چ گرفتێکت هەیە." نەمدەتوانی ئەوەی بەسەرم هاتبوو قبووڵی بکەم. ئەوەندە پەرێشان و شەرمەزار بووم لە ڕووم نەدەهات بە هیچ کەس بڵێم. هەستم دەکرد زۆر گەوجم، زۆر گێلم کە ڕێگام دا ئەم کارەساتەم لێبقەومێت بە چوونە ژوورەوەم بۆ ناو ئەو ماڵە. بەدەم گریانەوە بۆم باسکرد کە بەدوای مامەدا دەگەڕێم و نایدۆزمەوە.

"مامت کێیە؟ ناوی چییە؟"

"ئەحمەد دیرییە."

داپیرە پەنجە ڕەقەڵەکەی بەرز کردەوە و هێمای بۆ خانوویەکی شینی کاڵ کرد لە سوچێکی ئەو سەردوە. "دروست لە وێدایە،" داپیرە وتی. "ئەوە دەبینی؟ ئەوە ئەو

خانووەیە کە تۆ بەدوایدا دەگەڕێیت.' دروست لەوێدا بوو. هەر لەوێدا بوو، لەوبەر جادەکەوە کە وەستابووم و لەو زۆڵە داوای یارمەتیم کرد کە ماڵی مامم بدۆزمەوە. دوایی پێمزانی کە کاتێك بەسەرهاتی خۆمم بۆ باسکردووە، دروست زانیویێتی من کێم و مامم کێیە. داپیرە پێی وتم، کە ئەگەر دەمەوێت بمگەیەنێت، لەگەڵمدا دێت. بە وردییەکی زۆرەوە تەماشام کرد چونکە وام لێهاتبوو متمانە بە کەس نەکەم. بەڵام لە دەموچاویدا دیاربوو، کە دایکێکی ڕاستەقینەیە.

'بەڵێ، تکات لێدەکەم،' لەژێر لێوەوە وتم.

پێکەوە چووینە سەر سووچەکە و لە دەرگای خانووە شینەکەم دا. ئامۆژنم دەرگاکەی کردەوە و بە پەشۆکاوییەوە لێم وردبۆوە. 'لێرە چی دەکەیت؟' داپیرە گەڕایە دواوە و ڕۆیشت.

'ئامۆژن، ئا من لێرەم!' نەفامانە وەڵامم دایەوە.

'ئەی هاوار، تۆ چی دەکەیت لێرە؟ هەڵهاتووی، وا نییە!؟'

'باشە.....'

' من دەتنێرمەوە،' بە ڕەقییەکەوە وتی.

مام ئەحمەدیش، برای باوکم، بە بینینی من سەرسام بوو، بەڵام سەرسامی ئەو لەوەوە بوو، کە توانیومە ماڵەکەی بدۆزمەوە. بەسەرهاتی خومم بۆ باسکرد بەڵام نەچوومە پای ئەوەی کە بە بەرد لە شۆفێری لۆرییەکەم داوە و دراوسێکەیان خەریك بوو بێبنم بکات. سەرەڕای ئەوەی سەرسام بوو بەوەی، کە چۆن توانیومە بە بیاباندا بێم و ئەم بدۆزمەوە، بەڵام هیچ بە نیاز نەبوو ڕێگام بدا بمێنمەوە. مامم نیگەرانی ئەوە بوو کێ چاودێری ئاژەڵەکانی دەکات - کارێك کە بۆ چەندەها ساڵ بە شانی منەوە بوو و لەبەرامبەر ئەو هەموو هیلاکییەدا جووتێ پیلاوی لاستیکی بۆ کڕیبووم. هەموو منداڵە گەورەکانی باوکم لە ماڵ ڕۆیشتبوون. لەوانەی مابوونەوە

من گەورەترینیان بووم کەللەڕەقەکەیان - کە زیارتر لە هەموویان سەربەخۆتر بووم. 'نا، دەبێت بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە. بەو هەموو ئیشەوە کێ یارمەتی دایك و باوکت بدات؟ چی دەکەیت لێرە ئەگەر بمێنیتەوە؟ لە جێگای خۆت دانیشە؟' بەداخەوە وەڵامێکی باشم بۆ ئەو پرسیارانە نەبوو. دەمزانی کەڵکی نییە بۆی باسبکەم کە هەڵهاتووم چونکە باوکم ویستویەتی بمدات بەشووم بە پیاوێکی پیری ڕیش چەرموو. مامم بە شێتی دادەنام و دەیوت، 'ئینجا ئەوە چییە؟ ئەوە چییە؟ واریس، تۆ دەبێت شووبکەیت. باوکت پێویستی بە حوشترە.....' کەڵکی نەبوو بۆی ڕۆشن کەمەوە، کە من و خێزانەکەمان لە یەکتر جیاوازین، دایك و باوکی خۆمم خۆشدەوێت، بەڵام ئەوەی ئەوان بۆ منی دەخوازن، هەموو شتێك نییە. دەمزانی زۆر شتی تر لە ژیاندا هەیە، هەرچەندە دڵنیا نەبووم چییە. پاش چەند ڕۆژ زانیم، کە مامم پەیامنێرێکی ناردووە بە شوێن باوکمدا و ئەویش بەڕێگاوەیە بۆ ئێرە.

دۆستایەتیم لەگەڵ دوو کوڕی مامما هەبوو، چونکە ئاسایی کاتێك قوتابخانەیان نەدەبوو دەهاتن بۆ لامان و پشووەکەیان لای ئێمە بەسەردەبرد. یارمەتییان دەداین چاودێری ئاژەڵەکان بکەین و چەند وشە سۆماڵیمان فێربکەن. لەو کاتەدا ئەمە جۆرێك لە نەریت بوو: منداڵانێك کە لە شار دەچوون بۆ قوتابخانە، لە کاتی پشوداندا دەهاتن بۆ ناو بیابانەکان بۆ فێرکردنی منداڵانی کۆچەرییەکان. کاتێك لە گالکایۆ لە ماڵیان بووم، ئامۆزاکانم پێیان وتم کە دەزانن ئامان، خوشکە گەورەکەم، لە کوێیە: کە لە ماڵەوە هەڵهاتبوو، چووبوو بۆ مەقادیشۆ و لەوێ شووی کردبوو. بەم هەواڵە زۆر زۆر خۆشحاڵ بووم، چونکە لەوەتەی ماڵەوەی جێهێشتبوو هەرگیز هەواڵیم نەبیستبوو، وام دانابوو مردووە. بە قسەکاندا دەرکەوت کە دایك و باوکم دەیان زانی ئامان لە کوێیە، بەڵام چونکە بێبەریان کردبوو لە خێزانەکە هەرگیز ناویان نەدەبرد.

کاتێك زانیم باوکم بە ڕێگاوەیە بۆ بردنەوەی من، پلانێکم دارشت. ئامۆزاکانم بۆیان باسکردم کە گەیشتمە پایتەخت چۆن خوشکەکەم بدۆزمەوە. بەیانییەکیان منیان خستە سەر ئەو ڕێگایە لە دەرەوەی شار، پاشان ئەو تۆزە پارەیەی پێیان بوو دایان بە من. 'واریس، لێرەوە دەڕۆیت،' وتیان و ئاراستەیان کردم. 'ئەو ڕێگایە بۆ مەقادیشۆ دەچێت.'

'بەڵێنم پێ بدەن بە هیچ کەسێك نەڵێن بۆ کوێ چووم. لە بیرتان نەچێت کاتێك باوکم دەگاتە ئێرە، ئێوە نازانن چیم بەسەر هاتووە. دوا جار کە ئێوە منتان بینیوە ئەو بەیانییە بووە لە ماڵەوە، باشە؟' سەریان لەقاند و دەستی ماڵئاواییان بەرزکردەوە کاتێك کەوتمە ڕێ.

سەفەری مەقادیشۆ ئازارێکی درێژخایەن بوو. چەند ڕۆژ درێژەی کێشا، بەڵام خراپ نەبوو تۆزێك پارەم پێبوو، تا لە ڕێگادا کەمێك شتی پێ بکڕم و بیخۆم. ناوبەناو سواری ماشێن دەبووم و لە نێوانیشیاندا بۆ چەند میل پیادە دەڕۆیشتم. بێووره بووبووم لە بەرەو پێشەوە چوونی خاوی هەوڵەکانم. لەکۆتاییدا پارەم دا بە سواربوونی تاکسی بوشی ئەفریقایی، کە بارهەلگرێکی گەورەیە نزیکەی چل نەفەر هەڵدەگرێت. لە ئەفریقادا ئەم جۆرە بارهەلگرانە زۆر باوە. پاش ئەوەی بارەکەی لە دانەوێڵە یان قامیشی شەکر خاڵی دەکات ڕێبوار هەڵدەگرێت. لە ناوەکەیدا چوارچێوەیەکی تەختەی تیادایە کە خەڵك لەسەری ڕادەوەستێ یان دادەنیشێ خەڵك لە ناویدا لە منداڵانی ناو پارکی یاریکردن دەچن. هەروەها ئەم تەکسی بوشانە پڕ دەکرێن لە منداڵان، باوڵ، کەلوپەلی ناوماڵ، بزن و قەفەزە جوجەڵە. کابرای شۆفێر تا پارەی پێبدرێت و جێگای هەبێت ڕێبوار سوار دەکات. بەڵام پاش ئەو بەزمانەی کە بەسەرم هاتبوون، حەزم دەکرد لەناو قەڵەباڵغیدا بم تائەوەی لەگەڵ پیاوانی نەناسدا. کاتێك گەیشتینە دەوروبەری مەقادیشۆ، لە تەنیشت

بیریکەوە. کە خەڵك لێی کۆبووبوونەوە بۆ ئاودانی ئاژەڵەکانیان، ماشێنەکە وەستا و دابەزین. بە مشت چەند قوم ئاوم خواردەوە پاشان چەند شڵپێکم بە دەموچاومدا دا. بەهۆی ئەوەی مەقادیشۆ گەورەترین شاری سۆماڵ بوو بە دانیشتوانی حەوت سەد هەزار کەسەوە، سەرنجم دا چەند ڕێگای بەسەرەوەیە. لە چەند کۆچەرییەك کە بە حوشترەکانیانەوە ڕاوەستابوون، نزیکبوومەوە و پرسیارم کرد، "دەزانن چ ڕێگایەك لەوانە دەچێتە ناو پایتەختەوە؟"

بەڵێ، ئەودیانە،" کابرایەك وتی و هێمایەکی بۆ کرد. ئەوەی ئەو کابرایە پێی وتم، گرتم و چوومە ناو شارەوە. مەقادیشۆ شارێکی بەندەرییە بەسەر دەریای هیندەوەیە و لەوکاتەدا شارێکی جوان بوو. لە ڕێگادا هەر چاوەچاوم بوو تەماشای خانووە سەرسوڕهێنەرە سپییەکانیم دەکرد، کە دەوردرابوو بە دارخورما و گوڵی ڕەنگاوڕەنگی جوان. زۆربەیان بە شێوازی ئیتالیایی دروستکرابوون، کاتێك کە سۆماڵ کۆلۆنیالی ئیتالیا بووە. ئەو ژنانەی بەلامدا تێدەپەڕین سەرپۆشی زۆر جوان بە ڕەنگی زەرد، سوور و شینەوە بەسەریانەوە بوو. کاتێك ژنان دەکەوتنە بازاڕەوە ئەم قوماشە تەنکە جوانانە لە پشتیانەوە دەشەکانەوە. چەند ژنە موسڵمانم بینی، کە سەرپۆشەکانیان بەسەرەوە پێچابوو، پەچەیەکی ڕەشیان گرتبووەوە، کە تەواوی دەموچاویانی شاردبووەوە. تەماشام دەکردن، بۆم جێگای پرسیار بوو، کە چۆن بەرپێی خۆیان دەبینن. شار لەبەر تیشکی خۆردا بریسکەی دەهات و هەموو ڕەنگەکان وەك گڵۆپ دەدرەوشانەوە. لە ڕێگادا خەڵکم وەستاند و پرسیاری ماڵە دراوسێکانی خوشکەکەمم لێکردن. ئەدرێسی جادەم پێنەبوو، بەڵام هەوڵمدا چۆن مامم لە گالکایۆ دۆزییەوە، ئەویش ئاوا بدۆزمەوە، بڕیارمدا کە گەیشتمە ناوچەکەیان بۆ بازاڕەکەیان بچم و هەوڵ بدەم یەکێك بدۆزمەوە کە ئەو بناسێت. هەرچی چۆنێك بوو ئەم جارەیان ئەوەندە منداڵ نەبووم ڕێگا بدەم پیاوانی نەناس "یارمەتیم بدەن."

هەرکــە گەیــشتمە ناوچــەکەیان خێــرا بازاڕەکــەم دۆزییــەوە و گــەڕام بــەناو خواردنەکانــدا و بڕیــارم دا بــەو پەنجاییــە سۆماڵیانەی پــێم مــابوو شــتێك بکــڕم. لەکۆتاییدا لە گالیسکەیەك کە دوو ژنی بەلاوە بـوو، نرخێکی باشیان بـۆ شـیرەکەیان دانابوو، تۆزێکم لێکڕین. کە یەکەم قومم لێدا زانیم گومانێکی تیادایـە - تـامی خـۆی نەدەدا. 'ئەم شیرە چییە؟' پرسیارم کرد.

'هیچ! شیرەکەمان هیچ شتێکی نییە!'

'ئەی، سەیرکە. من شتێك لەبارەی شیرەوە دەزانم. ئەمە تامی خۆی نییە. ئاو یان شتێکی ترتان تێکردوە؟' لەکۆتاییدا قبووڵیان کرد، کە ئاویـان تێکـردوە تـا هـەرزانتر بیفرۆشن. کڕیارەکانیان ئەمەیان بۆ گرنـگ نەبوو. قسەوباسمان درێژەی کێشا و پـێم وتن کە هاتووم بۆ پایتەخت بۆ دۆزینەوەی خوشکم، پرسیارم کرد کە ئامان دەناسن.

'بەڵێ، لەوەدەچێ خزمیان بیت!' یەکێك لە ژنەکان وتی. پێکەنیم، چونکە کاتێك منداڵ بووین، لەگەڵ خوشکەکەمدا لـە سێوێك دەچووین کـرابین بـە دوو کەرتـەوە. دەیان ناسی چونکە هەموو ڕۆژێـك بـۆ بـازاڕ دەهـات. ژنێکیـان کـوڕە گـەنجێکی خـۆی بانگ کرد و پێی وت، کە ماڵی خوشکەکەمم پیشان بدات. 'ئـەم کچە بـەرە بـۆ مـاڵی ئامان، پاشان یەکسەر بگەڕێرەوە!' بەسەر کوڕەکەدا فەرمانی دا.

بەناو جادەی چۆڵدا ڕۆیشتین، کاتی سەرخەوشکاندن بوو و خەڵك لـە تـاو گـەرمی نیوەڕۆ وچانیان دەدا. کوڕەکە زنجێکی بـچوکی پیـشان دام. چـوومە ژوورەوە بینـیم خوشکم نوستووە. بە قۆڵ ڕاوەشاندنێك خەبەرم کردەوە. 'لێرە چی دەکەیت....' بە چـاوی خـەواڵووەوە پرسـی، تەماشـای دەکـردم، وەك ئـەوەی خـەو ببینێـت. لەسـەر جێگاکەی دانیشتم و بەسـەرهاتی خـۆمم بـۆ گێڕایـەوە، کە وەك چـەند سـاڵی پێـشی ئەو، منیش هەڵهاتووم. هەرچی چۆنێك بوو، کەسێك پەیدابوو قسەی بۆ بکەم و تێم بگات. تێدەگات کە سیانزە ساڵم و ناتوانم لەبەرخاتری باوکم بە پیـاوێکی پـیری کـەر شووبکەم.

ئامان بۆی باسکردم، کە چۆن گەیشتۆتە مەقادیشۆ و چۆن هاوسەرەکەی بینیوە. هاوسەرەکەی پیاوێکی بێدەنگی باش بوو، ڕۆژانە کارێکی قورسی دەکرد. ئامان سکی بە یەکەم منداڵی پڕبوو، لە مانگی خۆیدا بوو. بەڵام کە هەڵدەستایە سەرپێ، لەوە نەدەچوو سکی پڕ بێت و نزیك منداڵبوونی بێت. بە باڵای سەد و هەشتا سانتیمەتردوە تەواو جوانی قەدی دەردەکەوت، هەتا بەو کراسە ئەفریقییەوە نەرمەوە سکی پێوە دیارنەبوو. بیردەکەمەوە کە چەند پێم جوان بوو، ئاواتەخواز بووم منیش وەك ئەو وابم کە سکم دەبێت.

پاش تۆزێك قسەکردن، هێزم دایە خۆم و ئەو پرسیارەی کە لە ناخمدا پەنگی دەخواردەوە، لێم کرد، "ئامان، تکات لێدەکەم، نامەوێت بگەڕێمەوە - دەتوانم لای تۆ بمێنمەوە؟"

"تۆ هەڵهاتووی و ئەو هەموو ئێشەت بەسەر دایکمدا بەجێهێشتوە،" بە غەمبارییەکەوە وتی. بەڵام ڕازیبوو چەند پێویست بێت بمێنمەوە.ماڵە تەسکەکەیان دوو ژووری هەبوو: بچوکەکەیان منی تیادا دەنوستم ئەوی تریان خۆی و مێردەکەی. زۆر کەم مێردەکەی دەکەوتە ماڵەوە، بەیانی هەڵدەستا و دەچوو بۆ کار، بۆ نانی نیوەڕۆ دەگەڕایەوە و سەرخەوێکی دەشکاند، پاشان دەچووە سەر کار و ئێوارەیەکی دردنگ دەگەڕایەوە. هەتا کە لە ماڵەوە بوو زۆر کەمدوو بوو، کە هیچ شتێکی وام لەبارەیەوە بیرنایەت - تەنانەت ناوی، یان بژێوی ژیانی چۆن بەدەستدەهانی.

ئامان کچێکی بچوکی جوانی بوو، لە بەخێوکردنیدا یارمەتیم دا. هەروەها ماڵم پاکدەکردەوە و جلوبەرگم دەبردە دەردوە و دەمشت و پاشان دەمدا بەسەر تەنافدا بۆ وشکبوونەوە.

دەچووم بۆ بازاڕ و شتومەکم دەکڕی، باش فێری مامەڵەیان بووبووم. وەك خەلکەکەی، دەچوومە گالیسکەیەك و یەکسەر دەموت، "ئەمە بە چەندە؟" هەموو

ڕۆژێك هەمان شت بوو، وەك ئەوەی ئەم نەریتە نووسرابێت: ژنەکە سێ تەماتەی دەخستە بەردەستم، یەکێکی گەورە و دووانەکەی تریان بچوك و داوای نرخێکی دەکرد، وام دەزانی داوای پارەی سێ حوشتری کردووە.

'ئۆی، زۆر زۆرە،' بە بێزارییەوە وەڵامم دەدایەوە و دەستێکم بۆ ڕادەوەشاند.

'باشە، وەرە، وەرە، وەرە، دەتەوێت چەند بدەیت؟'

' دوو و پەنجا.'

'ئۆی، نا، نا، زیاتر دەی....' لەو کاتەدا خۆم وا پیشان دەدا کە دەمەوێت بڕۆم و لە گالیسکەیەکی تر بیکڕم، هەردەم ئەمەم لەبەردەمی کەسێکدا دەکرد کە مەبەستم بوو. پاشان دەگەڕامەوە بۆ لای و لە کوێدا مامەڵەمان وەستاندبوو دەستم پێدەکردەوە تا یەکێکمان ملیدەدا.

خوشکەکەم بە بەردەوامی ناوی دایکمانی دەهێنا، نیگەرانی ئەوە بوو، لە هەڵهاتنی منەوە هەموو کارەکان تەنیا کەوتوونەتە سەر شانی ئەو. ئەم باسەی وا دەهێنایە پێشەوە وەك ئەوەی تاوانی ئەو هەلومەرجە بە گەردنی من بێت. منیش نیگەرانی دایکم بووم، بەڵام ئامان هیچ کات باسی خۆیی نەدەکرد، کە ئەویش هەڵهاتووە. یادگاری بیرچووەوەی ساڵانی منداڵیمان هاتەوە یاد. زۆر شت گۆڕابوو لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا یان زیاتر کە بۆ دوا جار ئەوم بینیبوو، بەڵام بۆ ئامان هێشتا من هەمان خوشکە بچوکە نەفامەکەی جاران بووم کە جێیهێشتم، وە بۆ خۆشی هەمیشە کچە هەرە گەورە و هەرە ژیرەکە بوو. بۆم ڕۆشن بووەوە، لەگەڵ ئەوەی زۆر لەیەك دەچووین، بەڵام کەسایەتیمان زۆر لە یەکتر جیاوازبوو. تا دەهات بێزار دەبووم لەوەی کەسێك ئاغایەتیم بەسەردا بکات. کاتێك باوکم هەوڵیدا بمدات بەشوو بەو پیاوە پیرە، هەڵهاتم چونکە لەو باوەڕەدا بووم، ژیان زۆر لەوە زیاترە. چێشت لێنان، جل شتن و چاودێری منداڵان - کە تائیستا زۆرم کردبوو لەگەڵ خوشك و برا بچوکەکانمدا - شتێك بوون کە لە خەیاڵمدا نەبوون.

ڕۆژێکیـــان نامـــانم جێهێـــشت و دوای سەرنەویـــشتی خـــۆم کـــەوتم. لەســـەری قسەوباسێکم نەکرد. پێم نەوت دەڕۆم - زۆر ئاسایی بەیانییەکیان هەستام و هەرگیز نەگەڕامـــەوە. لـــەو کاتـــەدا ئەمـــەم بـــە بـــاش زانـــی، بـــەڵام نـــەم دەزانـــی کـــە هـــەرگیز نایبینمەوە.

## بەشی حەوتەم
## مەقادیشۆ

کاتێك لەگەڵ ئاماندا دەژیام، بردمی بۆ سەردانی هەندێك لە کەسوکارمان، کە لە مەقادیشۆ دەژیان. بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا توانیم هەندێك لە کەسوکاری دایکم ببینم. دایکم لە پایتەخت گەورە بووبوو لەگەڵ دایکی، چوار برا و چوار خوشکیدا. زۆر خۆشحاڵ بووم بەوەی کە توانیم دایەگەورەم ببینم، کاتێك لە مەقادیشۆ بووم. ئێستا تەمەنی نزیك نەوەد ساڵە، ئەوسا کە بۆ یەکەم جار بینیم لە حەفتاکاندا بوو. نەنە تەواو لە دایکم دەچوو. ژنێکی لێهاتوو و بە ئیرادە، پێستی دەموچاوی شەوقدار بوو، نیشانی دەدا کە چەند جوان بووە. دەستەکانی لەوە دەچوو ماوەیەکی زۆر لەناو گڵدا بووبێت، پێستەکەی بووبوو بە پێستی تیمساح.

دایەگەورەم لە یەکێك لە وولاتە عەرەبییەکاندا گەورە بووبوو، بەڵام نازانم لە کامیان. ژنێکی دینداری مسڵمان بوو، ڕۆژی پێنج جار ڕوو لە مەککە نوێژی دەکرد. هەر کاتێك بچوایەتە دەرەوە، پەچەی دەگرتەوە و سەرتاپای دادەپۆشی. ڕاهاتبووم بەوەی تووڕەی بکەم: 'نەنە، ئەریٚ ئاگات لە خۆتە؟ دڵنیایت دەزانی بۆ کوێ دەچیت؟ دەتوانی بەو شتەوە بەرپێی خۆت ببینی؟'

'ئای، گوێبگرە، گوێبگرە،' نەنە دەی قیژاند. 'ئەم شتە هیچ بەرناگرێت بە بینین.'

'دەی کەواتە دەتوانی هەموو شتێك بکەیت و هەناسەش بدەیت؟ دەم دایە قاقای پێکەنین.

بە مانەوەم لە ماڵی دایەگەورە، زانیم دایکم ئەو ئیرادە بەهێزەی لەکوێوە هێناوە. باوەگەورەم چەند ساڵ بوو مردبوو، نەنە بە تەنیا دەژیا و هەموو کارەکانی خۆی بەدەستی خۆی دەی کرد. کاتێك دەچوومە سەردانی، پێویست نەبوو کارێکی بۆ

بکەم. هەر کە بەیانیان لە خەو هەڵدەستاین ئەو ئامادەی چوونە دەرەوە بوو. دەستی دەکرد بە هاوارکردن لە من: ٬دەی بجوڵێ. واریس خێراکە. دەی با بڕۆین.٬

نەنە لە دەرەوەی مەقادیشۆ دەژیا، کە زۆر دوور بوو لە بازاڕەوە. هەر جارێك خواردنمان بکڕیایە، پێم دەوت: نەنە خێراکە - ئەوەندە بە قورسی مەگرە با سواری پاس بین. دنیا گەرمە وماڵەوە زۆر دوورە بە پێ بڕۆین.٬

٬چی!؟ پاس! دەی دەی خێراکە، با بڕۆین. کچێکی گەنجی وەك تۆ دەیەوێت سواری پاس بێت. لە چی تووڕەی. واریس ئەم ڕۆژانە خەریکی تەمەڵ دەبیت. منداڵانی ئیمڕۆ هەموویان وان - نازانم چیتە. کاتێك لە تەمەنی تۆدا بووم، ئۆ، فرسەق بە فرسەق دەڕۆیشتم ... کچێ، دێیت لەگەڵم یان نا؟٬ ئیتر پێکەوە دەڕۆیشتین، چونکە دەمزانی ئەگەر نەچوومایە، خۆی بە تەنیا دەڕۆیشت. بە شتەکانەوە نقەنق لە دوایەوە دەڕۆیشتم.

پاش ئەوەی مەقادیشۆم بەجێهێشت، یەکێك لە خوشکەکانی دایکم مرد و نۆ منداڵی لەدوای خۆی بەجێهێشت. دایەگەورەم منداڵەکانی گرتە خۆی و وەك منداڵی خۆی گەورەی کردن. وەك دایکم وابوو، هەرچی بیویستایە دەی کرد.

یەکێك لە کوڕەکانی نەنەم بینی، کە دەبوو بە خاڵم بەناوی *ولداب*. ڕۆژێکیان چووبووم بۆ بازاڕ کە گەڕامەوە لە ماڵەوە دانیشتبوو، خاڵۆزایەکمی لە باوەشدا بوو. هەرچەند لەوەوپێش هەرگیز نەم بینیبوو، بەرەو پیری ڕام کرد، چونکە یەکسەر دایکمم هاتە بەرچاو، کە بە تەواوی لە دایکم دەچوو - منیش سەرگەردان بەدوای هەر شتێکەوە بووم کە دایکمم بێنێتەوە یاد. ڕام کرد بۆ لای، چونکە منیش زۆر لە دایکم دەچووم، زۆر خۆش بوو بەڵام ساتێکی نامۆ بوو، لەوەدەچوو وەك شێت خۆت لە ئاوێنەیەکی لێڵدا ببینی. بیستبووی هەڵهاتووم و لە مەقادیشۆ ماومەتەوە. کاتێك زیاتر لێی نزیکبوومەوە، وتی، ٬لەو باوەڕەدام ئەوە تۆ بیت؟٬ ئەو پاش نیوەڕۆیە، لە تەواوی ئەو ماوەیەی کە ماڵەوەم جێهێشتبوو، زیاتر پێکەنیم، چونکە خاڵە ولدابم

نەك تەنیا هەر لە دایکم دەچوو بەڵکو گاڵتە قۆڕەکانیشی هەر لەو دەچوو. دەبێت خوشك و برا دەستەیەك بووبن پێکەوە گەورە بووبوون، هەر یەك لە خێزانەکەیان هێناوەتە پێکەنین تا خۆیان تەرکردووە، منیش ئاواتەخوازبووم، کە هەموویانم پێکەوە ببینیایە.

ئەو بەیانییەی کە لە ماڵی خوشکم هاتمە دەرەوە، چووم بۆ ماڵی خاڵۆژنە لول. ماوەیەکی کورت بوو گەیشتبوومە مەقادیشۆ، کە پێکەوە چووینە سەردانی. ئەو ڕۆژەی ماڵی ئامانم جێهێشت، بڕیارم دا بچم و داوای لێبکەم کە دەتوانم بمێنمەوە لە لای. ئەو بەهۆی شووکردن و ژنهێنانەوە، خاڵۆژنم بوو، چونکە شووی کردبوو بە خاڵە سەعید، برای دایکم.هەرچەندە تەواوی ڕۆژ لە ماڵەوە بە تەنیا خەریکی بەخێوکردنی سێ منداڵەکەیان بوو، لە کاتێکدا خاڵم لە عەرەبستانی سعودی بوو. چونکە ئابوری سۆماڵ زۆر خراپ بوو، خاڵە لە سعودییە کاری دەکرد و پارەکەی بۆ بەخێوکردنی خێزانەکەی دەناردەوە. بەداخەوە، تەواوی ئەو کاتەی من لە مەقادیشۆ بووم، ئەو نەگەڕایەوە ماڵەوە و هەرگیز ڕێنەکەوت بیبینم.

کە گەیشتم، خاڵۆژنە لول سەرسام بوو، بەڵام وا دیاربوو بە بینینی من زۆر خۆشحاڵ بوو. 'خاڵۆژن، نێوانی من و ئامان خۆش نییە و پرسیار ئەوەیە دەتوانم بۆ ماوەیەك لە لات بمێنمەوە.'

'باشە، بەڵێ، دەزانی لێرە تەنیام لەگەڵ منداڵەکانمدا. سەعید زۆربەی کات لێرە نییە و پێویستیم بە یارمەتی دەبێت. ئەمە باش دەبێت.' یەکسەر ئاهێکم تێگەڕا. ئامان بە ئابەدڵییەوە ڕێگای دابووم لەلای بمێنمەوە، بەڵام دەمزانی هەلومەرجەکەی پێخۆش نییە. ماڵەکەیان زۆر بچوك بوو، تا ئاستێکیش تازە زەماوەندییان کردبوو. سەرەڕای هەموو ئەمانە، ئەوەی ئەو دەیویست لە من، گەڕانەوەم بوو بۆ ماڵەوە، بۆئەوەی باری دەروونی خۆی سوك کات، بەهۆی هەڵهاتنی ئەو هەموو ساڵانەی لە دایکم.

بە مانەوەی یەکەم جارم لای ئامان، پاشان لای خاڵۆژنە لول، ڕاهاتم بەوەی لە ناومالّدا بژیم. لەسەرەتاوە هەستم دەکرد دنیا بە ڕوومدا داخراوە بەوەی لە ناو ماڵدا دەژیم بنمیچ ئاسمانی لێگرتبووم، چوار دیوار جولاندنمی سنووردارکردبوو، بۆنی توالێت و دووکەڵی گازی شاری قەرەباڵغ، جێگای بۆنی دەوەن و ئاژەڵی بیابانی گرتبوەوە. هەرچەند ماڵی خاڵۆژنم لە ماڵی ئامان گەورەتر بوو بەڵام هەر بچوك بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئاسانکارییانە خۆشییەکی تازەی پێدام - شەو لە جێگای گەرم و بێ تەڕوتوشیدا لەکاتی باراندا - هەرچەند ئەمانە زۆر سەرەتایین بەگوێرەی پێوانەی ڕۆژئاوایی. ڕێزم بۆ ئاو بەردەوامبوو، چونکە بەهای خۆی لەدەستنەدەدا. ئەم کالاّ بەهادارەمان لە فرۆشیار دەکڕی، کە ماڵە و ماڵ بە کەر دەیان گەڕاند، پاشان لە بەرمیلدا لە دەرەوەی ماڵدا دامان دەنا. خێزانەکە دەستیان دەگرتەوە لە بەکارهێنانیدا بۆ گەرماو، پاکردنەوە، چالێنان و خواردن دروستکردن. لە چێشتخانەیەکی بچوکدا، خاڵۆژنم بە تەباخێکی گازی خواردنی دروستدەکرد. ئێواران لە ماڵەوە دادەنیشتین و قسەمان دەکرد بە دەوری چرایەکی نەوتیدا ئەگەر کارەبا نەبوایە. توالێتەکەی نموونەی توالێتی بەشێك لە جیهان بوو: چاڵێك لە زەویدا کە پیسایی تیدا دەمایەوە و لەناو گەرمادا زیاتر بۆگەنی دەکرد. حەمامیش بە واتای هێنانی ئاو بە سەتڵ لە بەرمیلی دەرەوەی ماڵ و بە لفکە خۆشتن و چڵکاوەکەی لە کونی ئاودەستەکەوە بچێتە خوارەوە.

یەکسەر پاش ئەوەی گەیشتمە لای لولی خاڵۆژنم، تێگەیشتم داوای مانەوە لەلای، زۆر لەسەرم کەوتووە. تەواوی وەخت بووم بە دایەنی هەر سێ منداڵە پۆخڵەکانی. هەرچەند نەمدەویست ناو لە منداڵێکی بچوك بهێنم بە پۆخڵ، بەڵام هەڵسوکەوتیان بە تەواوی هەراسانیان کردبووم.

هەموو بەیانییەك خاڵۆژن دەوری کاتژمێری نۆ لە خەو هەڵدەسا، دروست پاش نانی بەیانی بێباك ماڵی جێدەهێشت بۆ سەردانی هاوڕێکانی. پاشان تەواوی ڕۆژەکە لەگەڵ ئەم ژنانەدا دەکەوتنە قسەوباسی بێکۆتایی لەسەر هاوڕێ، دۆست، دوژمن و دراوسێکانیان. لە کۆتاییدا ئێوارە سەرگەردان دەگەڕایەوە ماڵەوە. کاتێك دەڕۆیشت، منداڵە شیرەخۆرە سێ مانگەکەی بەردەوام لە برساندا دەگریا. کە هەڵم دەگرت، دەستی دەکرد بە مژینی من. هەموو ڕۆژێك پێم دەوت، 'خاڵۆژن سەیرکە، دەبێت کارێك بکەیت. ئەو منداڵە هەر کاتێك هەڵی دەگرم، هەوڵدەدا من بمژێت. من هیچ شیرێکم نییە. هەتا مەمکم نییە!'

'باشە، نیگەران مەبە. بەس تۆزێك شیری بەرێ،' بێباکانە دەیوت.

لەگەڵ پاککردنەوەی ماڵ و بەخێوکردنی منداڵە بچکۆلەکەیدا، دوو منداڵی تەمەن نۆ ساڵ و شەش ساڵی هەبوو کە دەبوو چاوێکت لەوانیشەوە بێت. ئەم دووانە وەك ئاژەڵی کێوی وابوون. دار و بەرد بەدەستیانەوە زەلالەتیان بوو، ئاسایی بوو چونکە دایکیان هیچ شتێکی فێرنەکردبوون. یەکسەر هەوڵمدا لە هەر هەلێك کەڵك وەرگرم، بەر بە بێحەیاییەکانیان بگرم بە مەبەستی چاکردنی هەلومەرجەکە. بەڵام پاش ساڵانێکی زۆر وەك چەقەڵیان لێهاتبوو بەو ناوەدا، بە شەوێك بۆم نەدەبوون بە پەری.

تا دەهات زیاتر و زیاتر بێ ئومێد دەبووم. بۆم پرسیار بوو کە دەبێت چەند هەلومەرجی بێهودە ببینم تا چاوم بە تروسکاییەك دەکەوێت. هەردەم بەدوای ئەوەوە بووم کە شتەکان باش بڕوات، پاڵم بەخۆمەوە دەنا، بەدوای ئەو هەلە پەرلەیەوە بووم کە دەمزانی لەسەرم وەستاوە. هەموو ڕۆژێك بۆم پرسیار بوو، 'ئاخۆ ئەو ڕۆژە کەی دێت؟ ئیمڕۆیە؟ سبەنێیە؟ بەرەو کوێ دەڕۆم؟ چی دەکەم؟' بۆچی وەهام بیردەکردەوە، هەرگیز تێی نەدەگەیشتم. لەو کاتەدا وەهام دەخەملاند، کە هەرکەس لە دەروونی خۆیدا ئەو دەنگانە دێتە گوێی. بەڵام چەند بۆ ڕابووردوی

خۆم دەگەڕێمەوە هەمیشە ئەوەم زانیوە کە ژیانم لەوەی ئیستا هەیە، بەرەو گۆڕاندن دەڕوات، چۆن دەگۆڕێت، هیچم لەبارەیەوە نەدەزانی.

مانەوەم لەگەڵ خاڵۆژنە لولدا، ماوەی مانگێکی نەبرد بەو پەڕی ناخۆشی گەیشت. پاش نیودڕۆیەکی درەنگ. کاتێك خاڵۆژنم خەریکی گەڕان و قسەڵۆکی خۆی بوو، منداڵە هەرە گەورەکەی. کچێکی تەمەن نۆ ساڵ، ونبوو. چوومە دەرەوە و هاوارم لێکرد. کە وەڵامی نەبوو، بە ناو دەر و دراوسێدا کەوتمە گەڕان بە دوایدا. لە کۆتاییدا، لە تونێلێکدا لەگەڵ کوڕێکی گەنجدا دۆزیمەوە. ئەم کچە منداڵێکی بیرتیژی کونجکاو بوو، لەو کاتەدا کە گرتم، زۆر سەرنجی بۆ لای توێکاری ئەم کوڕە چوو. چوومە ناو تونێلەکەوە. پەلی کچەکەم گرت و خستمە سەرپێی خۆی، کوڕە وەك ئاژەڵی ترساو بۆیدەرچوو. تەواوی ڕێگا تاماڵەوە لە کچەکەم دا، لەهەموو ژیانمدا ئەوەندە لە منداڵ توڕە نەبووم.

ئێوارە کە دایکی هاتەوە، کچەکە سەبارەت بە سزایەك کە دابووم دەستیکرد بە گریان. خاڵۆژنە لول شێتگیر بوو. 'بۆچی لەو منداڵەت داوە؟' ئەڕاندی. 'دەست لە منداڵەکەم هەڵدەگری باشە. ئەگینا دێمە وێزەت. پیشانت دەدەم چیت!' هاواری کرد و بەهەڕەشەوە بەرەو ڕووم هات.

'باوڕم پێبکە، ناتەوێ بزانی هۆی سزادانی من چی بووە، چونکە ناتەوێ ئەوەی من دەیزانم تۆ بیزانی! ئەگەر دەتزانی ئیمڕۆ چی کردووە، حاشات لە کچەکەی خۆت دەکرد. ئەم منداڵە بە کەس زەوت ناکرێت - وەك ئاژەڵ وایە.' ڕوونکردنەوەکانم ئاگری نێوانمانی دانەمرکاندەوە. لەپڕ سێ منداڵی کەمتر لە دە ساڵەی، بەسەر کچێکی سیانزە ساڵەی وەك مندا جێدەهێڵێت، کەچی ئێستا کامەرانی کچەکەی لێبووە بە هەموو شتێك. خاڵۆژن مستی بەرز کردەوە و بۆم هات، هەڕەشەی لێدانی لێدەکردم لەسەر ئەوەی چیم کردووە بە پەرییە بچکۆلەکەی. بەڵام ئیتر ئەمە بەس بوو بۆ من نەك تەنیا لەوەوە، بەڵکو لە هیچ کەسێکی ترەوە. 'تەماشاکە، تۆ بۆت

نییە دەستم بۆ بەریت!' قیژاندم. 'ئەگەر وا بکەیت، قژ بەسەرتەوە ناهێڵم.' ئەمە ئیتر کۆتایی بە هەر دەمەقاڵێیەك هێنا، کە کەسێك پەنجەم بۆ بەرێت، بەڵام ئیتر دەمزانی لەم ئاستەدا دەبێت بڕۆم. بەڵام ئەم جارە بۆ کوێ بڕۆم؟

مستم بەرزکردەوە و لە دەرگای ماڵی پورە ساهروم دا، لە دڵی خۆمدا وتم، واریس دیسانەوە هاتینەوە ئێرە. شەرمنانە وتم، چۆنی کاتێك وەڵامی تەقولبابی دایەوە. پورە ساهرو خوشکی دایکم بوو. پێنج منداڵی هەبوو. ئەم ڕاستییە مایەی خۆشیم نەبوو لە ماڵیاندا، بەڵام چ ڕێگایەکی تر دەمتوانی بگرم؟ دەست بە گیرفانی خەڵکدا بکەم یان سواڵی خواردن لە سەر جادە؟ بەبێ ئەوەی درێژەی پێبدەم لەسەر ئەوەی چۆن لە ماڵی خاڵۆژنە لولەوە هاتووم، پرسیارم لێکرد، کە دەتوانم بۆ ماوەیەك لەلایان بمێنمەوە.

'تۆ هاوڕێیەکت لێرە هەیە،' ئەم وەڵامە، مایەی سەرسامیم بوو. 'ئەگەر دەتەوێت دەتوانی بمێنیتەوە. لەبارەی هەر شتێکەوە دەتوانین قسە بکەین، من ئامادەم.' شتەکان چاکتر چووە پێشەوە، وەك لەوەی چاوەڕوانی بووم. وەك پێشبینیم دەکرد، کەوتمە ئیشکردنی ناوماڵ. بەڵام فاتیمە، کچە هەرە گەورەکەی پورە ساهرو، تەمەنی نۆزدە ساڵ بوو، زۆربەی ئیشی ناوماڵ لە ئەستۆی ئەودا بوو.

پورزا هەژارەکەم فاتیمە، وەك کۆیلە کاری دەکرد. هەموو بەیانییەك زوو لە خەو هەڵدەستا و دەچوو بۆ زانکۆ، پاشان دوانزە و نیو دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆ ئامادەکردنی نانی نیوەڕۆ، دووبارە دەگەڕایەوە بۆ خوێندن و نزیك کاتژمێری شەش دەهاتەوە بۆ ئامادەکردنی نانی ئێوارە. پاش نانی ئێوارە خەریکی پاککردنەوە دەبوو، پاشان شەو درەنگ خەریکی خوێندن دەبوو. لەبەر چەند هۆیەك دایکی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا جیاواز بوو، چاوەڕوانی زۆر زیاتر بوو لێی لەچاو منداڵەکانی تریدا. بەڵام فاتیمە بۆ من باش بوو، وەك هاوڕێ هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردم و

لەو ماوەیەی ژیانمدا بێگومان پێویستیم بە یەکێك هەبوو. هەرچی چۆنێك بوو، ئەو هەڵسوکەوتەم بە ناڕەوا دەزانی. لەبەرئەوە هەوڵمدا یارمەتی پورزاکەم بدەم لە کاری چێشتخانە لە شەودا. نەمدەزانی چۆن چێشت ئامادە دەکرێت، بەڵام هەوڵمدا لە ڕێگای تەماشاکردنی ئەوەوە خۆم فێربکەم. بۆ یەکەم جار تامی معکەرۆنیم کرد، کاتێك فاتیمە دروستیکرد و خواردم، وام دەزانی باڵم لێپەیدا بووە.

زۆربەی پاککردنەوە لە ئەستۆی مندا بوو، تا ئیمڕۆش پورە ساهرو دەڵێت، کە لە من باشتری نەبووە بۆ پاککردنەوە. ماڵم گسك دەدا و دەمسڕی، کە کارێکی قورس بوو. بەڵام بە دڵنیاییەوە پاککردنەوەم لە ئاگاداری منداڵ پێباشتر بوو، بەتایبەتی پاش ئەو بەزمانەی کە لە چەند مانگی ڕابوردوودا بەسەرم هات.

پورە ساهرو، هەر وەك ئامان، ئەویش کەوتە نیگەرانی دەربڕین بۆ دایکم، سەبارەت بەوەی کە تەنها ماوەتەوە و هیچ کچێکی گەورەی نییە گۆشەیەك لە کاری لەگەڵدا بگرێت. باوکم لەوانەیە لەپەیوەند بە ئاژەڵەکاندا کارێك بکات، بەڵام بۆ چێشت لێنان، یان دروستکردنی سەبەتە، یان چاودێریکردنی منداڵەکان پەنجەیەك بەرز ناکاتەوە. ئەمانە کاری ژنە و گرفتی دایکم بوو. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئایا باوکم ژنێکی تر دەهێنێتە ماڵەوە بۆ یارمەتی دان؟ بەڵێ بێگومان دەیکات. بەڵام منیش، لەو بەیانییە تاریکەوە کە دایکمم بۆ دوا جار بینی، نیگەرانی ئەم گرفتە بووم. هەرکات بیری لێدەکەمەوە، یادی دەموچاویم لەبەر ئاگرەکە دەکەوێتەوە، کە چەند هیلاك و ماندوو دیار بوو لە شەوی پێش جێهێشتنەکەمدا. کاتێك کە بەرەو مەقادیشۆ بیابانم دەبڕی، نەمدەتوانی ئەم بیرانە لە مێشکی خۆم دەرکەم. سەفەرەکەم وەك گرفتەکەم تەواوبوونی نەبوو: چ ڕێگایەك هەڵبژێرم - دوای حەزی یارمەتیدانی دایکم بکەوم یان دوای حەزی ڕزگاربوون لەو پیاوە پیرە؟ بیرم دێت لە زەردەی دەمەو ئێوارە لە ژێر دارێکدا چۆن داتەپیبووم و بیرم دەکردەوە، ئێستا ئیتر

کێ بە هانای دایکمەوە دەچێت؟ ئەو چاودێری هەموو کەسێك دەکات، کێ ئاگاداری لەو دەکات؟

ئێستا ئیتر بوارێك بۆ گەڕانەوە نەمابوو، چونکو نەدەکرا پاش چەند مانگ سەختی کێشانێکی زۆر هەروا بە فیڕۆ بڕوات. وە ئەگەر بگەڕامایەتەوە، مانگ تێنەدەپەڕی باوکم دەکەوتە بیانوو هێنانەوە بۆ بەشوودانم بەو کمفتەکارە ناشیرنە خاوەن حوشترە لە بیاباندا. ئەمەش نەك تەنها گیرکردنە بە دەست هاوسەرێکەوە، بەڵکو نەشم دەتوانی چاودێرییەکی دایکم بکەم. بەڵام ڕۆژێکیان بەوە گەیشتم، کە بەشێك لەم گرفتە چارەسەر بکەم بە بەدەستهێنانی پارە و ناردنەوەی بۆ دایکم. پاشان دەتوانێت هەندێك لەو شتانەی کە بۆ خێزانەکە پێویستە پێی بکڕن تا ناچار نەبن زۆر زەحمەت بکێشن.

کەوتمە گەڕان بەدوای کاردا، هەموو شارم پشکنی. ڕۆژێکیان پورم منی نارد بۆ بازاڕ بۆئەوەی شتی بۆ بکڕم، لە گەڕانەوەمدا بەلای شوێنی کاری خانووکردنێکدا ڕۆیشتم. ڕاوەستام و سەیرم کردن کە چۆن کرێکارەکان خشت هەڵدەگرن، چیمەنتۆ دەگرنەوە و بە خاکەناز ئەمدیو ئەودیوی دەکەن و لمی تێکەڵ دەکەن و ئاوی پیادەکەن. 'چۆنن' سەلامم لێکردن، 'کارێکتان هەیە؟'

پیاوێك کە خشتی دادەنا ڕاوەستا و دەستی کرد بە پێکەنین پێم. 'ئەوە کێیە پرسیاری هەیە؟'

'منم. کارم دەوێت.'

' نا. ئێمە هیچ کارێکمان نییە بۆ کچێکی وەك تۆی پێست و ئێسقان. لەو باوەڕەدا نییم بتوانیت خشت دانێیت.' دووبارە پێکەنییەوە.

'تۆ هەڵەیت،' وا خۆم نیشان دا. 'دەتوانم بیکەم - من زۆر بەهێزم. بە ڕاستیمە.' هێمام بۆ کرێکارەکان کرد کە چیمەنتۆیان دەگرتەوە، پانتۆڵەکانیان بەسەر

قنگیانەوە وەستابوو. "دەتوانم یارمەتیان بدەم. دەتوانم هەموو لەکە بێنم و وەك ئەوان بە باشی تێکەڵی بکەم"

"باشە، باشە، کەی دەتوانیت دەست پێبکەیت؟"

"سبەینێ بەیانی."

"بەیانی کاتژمێری شەش لێرە بە، بزانین چی دەتوانیت بکەیت." گەڕامەوە بۆ لای پورە ساهرو، لە خۆشیدا پێم نەدەکەوتە سەر زەوی. کارم هەیە! پارە بەدەست دەهێنم پارەی تەواو! و هەر فلسێکی کۆدەکەمەوە و دەینێرم بۆ دایە. زۆر سەرسام دەبێت.

کە گەیشتمەماڵەوە، هەواڵە تازەکەی خۆمم بە پورێ وت. باوەڕی پێنەدەکردم. "کارت دەستکەوت لە کوێ؟" لە پێشدا نەیدەتوانی باوەڕ بکات، کە کچێك داوای کارێکی وەها دەکات. "دروست چی بۆ ئەو پیاوانە دەکەیت؟" پورێ پرسیاری کرد. پاشان، نەیدەتوانی باوەڕ بکات. خاوەن کار ژنێك بەکرێ بگرێت، بە تایبەتی من، کە نیوە مردوو دیار بووم. بەڵام کە پێم داگرت لەسەر ڕاستی هەواڵەکە، ڕێگایەکی بۆ نەمایەوە بێجگە لەوەی کە باوەڕم پێبکات.

هەر کە باوەڕی هێنا، ئینجا تورە بوو کە پلانم داناوە کار بکەم، لەجیاتی ئەوەی خەریکی ئیشی ماڵ بم، کار بۆ یەکێکی تر بکەم. "تەماشاکە" بە بێزارییەوە وتم. "پێویستم بەوەیە پارە بۆ دایکم بنێرم، لەبەرئەوە دەبێت کارێکم هەبێت. ئیتر ئەمە بێت یان یەکێکی تر، جیاوازی نییە. دەبێت بیکەم. تێگەیشتی؟"

"زۆر باشە."

بۆ سبەینێ بەیانی وەك کرێکاری خانوو دروستکردن دەست بەکار بووم. زۆر قورس بوو. تەواوی ڕۆژ خەریکی هێنان و بردنی کۆڵە لمی پشت شکێن بووم، دەستکێشم لە دەستدا نەبوو. دەسکی سەتڵ دەستمی بریندار کرد. پاشان تەواوی لەپی دەستم بوو بە بلۆق. لەکۆتایی ڕۆژەکەدا بلۆقەکانی دەستم تەقی و خوێنی

لێهات. هەموو کەس لەو باوەڕەدا بوو ئەمە کۆتایی منە، بەڵام من بڕیاری خۆمم دابوو کە بۆ ڕۆژی دوایی دەگەڕێمەوە.

یەك مانگ خۆم ڕاگرت تا گەیشتە ئەوەی دەستم ئەوەندە بریندا بوو، هەوی کرد کە نەمدەتوانی بینوشتێنمەوە. وازم لە کارەکە هێنا و ئەو پارەیەی کە بەدەستم هێنابوو، بەرابەر بوو بە شەست دۆلار. بە شانازییەوە بە پورم وت، پارەم هەیە و دەینێرمەوە بۆ ماڵەوە بۆ دایکم. پاش ماوەیەك پیاوێك کە پورمی دەناسی سەردانی کردین، بەم زووانە لەگەڵ خێزانەکەی بۆ بیابان دەچوون، ئامادەیی خۆی دەربڕی کە ئەو پارەیەم بۆ بەرێت. پورە ساهرو وتی، 'بەڵێ، ئەمانە دەناسم، خەڵکێکی باشن. دەتوانی متمانەیان پێبکەیت و پارەکە بدەیتە دەستیان.' بەڵام ئەمە کۆتایی شەست دۆلارەکەم بوو. پاش ئەو هەموو زەحمەتە، دوایی بۆم دەرکەوت کە فلسە سوورێك لەم پارەیە بەدەستی دایکم نەگەیشتووە.

پاش وازهێنانم لە کرێکاری، گەڕامەوە سەر ماڵ پاککردنەوە. ڕۆژێکیان ئاسایی خەریکی ماڵ پاککردنەوە بووم، کە میوانی بەناوبانگ: باڵوێزی سۆماڵ لە لەندەن گەیشت. باڵوێز محەمەد چاما فاراح، هاوسەری یەکێك لە خوشکەکانی دایکم بوو بە ناوی ماروییم. کاتێك کە خەریکی گسکدان بووم لە نزیك ژوورەکەوە، گوێم لە قسەوباسی باڵوێز بوو لەگەڵ پورە ساهرو. هاتبوو بۆ مەقادیشۆ بۆ دۆزینەوەی کارەکەرێك پێش ئەوەی کاری دیپلۆماتێکی چوار ساڵەی دەستپێبکات لە لەندەن. یەکسەر زانیم ئەمە خۆیەتی. ئەمە ئەو هەلەیە کە چاوەڕوانی بووم.

دەرپەڕیم بۆ ژوورەکە و بانگی پورە ساهروم کرد، 'پورێ، دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم.'

بە مۆنییەکەوە تەماشای کردم. 'چییە، واریس؟'

' تکایە - وەرە.' کاتێك کە هاتینە دەرەوە و لە چاوی باڵوێز بەدوور بووین، بە قایم قۆڵی پورێم گرت. 'تکات لێدەکەم. تکایە پێی بڵێ من بەرێت. دەتوانم ببمە

کارەکەری.` سەیری کردم و توانی لێبڕاوی لە دەموچاومدا ببینێت. بەڵام من منداڵێکی بە ئیرادە بووم تەنیا بیرم لەو شتە دەکردەوە کە خۆم دەمویست، جیا لەوەی ئەو چی بۆ من دەکات.

`تۆ! تۆ چی دەزانی لەبارەی چییەوە. چیی دەکەیت لە لەندەن؟`

`دەتوانم ماڵ پاککەمەوە! پێی بڵێ با بمبا بۆ لەندەن، پورێ! دەمەوێت بڕۆم!`

`لەو باوەڕەدا نییم. بەسە هەراسانم مەکە و بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە.` گەڕایەوە ژوورەکە و لە تەنیشت هاوسەری خوشکەکەی دانیشت. گوێم لێبوو بە هێواشی پێی دەوت. `بۆچی ئەو نابەیت؟ دەزانی - بەڕاستی زۆر باشە. ماڵ چاك پاکدەکاتەوە.`

پورێ بانگی کردم بۆ ژوورەکە و بە قەڵەمبازێك خۆم گەیاندێ. بە خۆم و گسکەکەمەوە لای دەرگاکەوە وەستام، چەقەی بنێشت جوینم دەهات. `من واریسم. تۆ هاوسەری پورمی، وا نییە؟`

بالۆێز ڕووی گرژی نیشان دام. `دەکرێت ئەو بنێشتە لە دەمت دەربهێنیت؟` بنێشتەم هەڵدایە سووچێکی ژوورەکەوە. `نا ئەمە ئەو کچەیە؟ نۆی، نا، نا، نا.`

`نموونەی وەك من نییە. دەتوانم ماڵ پاکەمەوە، چێشت لێنێم - هەروەها زۆر باشیشم لەگەڵ منداڵاندا!`

`نۆی، من دڵنیام لە تۆ.`

ڕووم لە پورم کرد. `پێی بڵێ `

`واریس، ئیتر بەسە، بڕۆ بەلای ئیشتەوە.`

`پێی بڵێ من باشترینم!`

`واریس! وسبە! ڕووی لە خاڵە محەمەد[1] کرد و وتی، `هێشتا گەنجە، بەڵام بەڕاستی ئیش زۆر دەکات. باوەڕم پێبکە زۆر باشی لێدەردەچێت....`

خـاڵم بـۆ چـرکەیەك بێـدەنگ بـوو بـە نابەدڵییـەوە تەماشـای دەکـردم. 'باشـە، گوێبگرە. بەیانی دەتبـەم. باشـە؟ بـەیانی پـاش نیـوەڕۆ بـە پاسـپۆرتەوە دێـم، پاشـان دەچین بۆ لەندەن.'

1. لە پەیوەندی خزمایەتی سۆماڵیدا، بەهۆی ئەوەی محەمەد چاما فـاراح هاوسـەری یـەکێك لـە خوشـکەکانی دایکی واریـسە، بـەپێی یاسا دەبێـت بـە بـرای دایکی. بۆیـە واریس بە خاڵە محەمەد ناوی دەبات. وەرگێڕ

## بەشی هەشتەم

## بەرەو لەندەن

لەندەن! هیچ شتێکم لەبارەیەوە نەدەزانی، بەڵام لەسەر زمانم زۆر خۆش بوو. ئەم دەزانی لە کوێیە، بەڵام دەمزانی کە زۆر دوورە. چەند زیاتر دوور بوایە، من ئەوەم دەویست. لەوە دەچوو ئاواتەکانم هاتبێتەدی و وا ئێستاش بەچاوی خۆم دەیبینم. هاوارم کرد "پورێ، بەڕاستی من دەڕۆم؟"

پورم بە مۆنییەکەوە پەنجەیەکی لێبەرز کردمەوە. "دەمت داخە. دەستی پێمەکەرەوە." کاتێك دەیبینی ترسم لێدەنیشێت، بە زەردەخەنەوە دەی وت، "زۆر باشە. بەڵێ، دڵنیابە دەڕۆیت."

بە خۆشییەکی زۆرەوە خۆم گەیاندە فاتیمەی پورزام، کە تازە دەستی کردبوو بە نان خواردنی ئێوارە. "دەچم بۆ لەندەن! دەچم بۆ لەندەن!" هاوارم کرد و کەوتمە سەما کردن لە ناو چێشتخانەکەدا.

"چیت وت؟ لەندەن!" قۆڵی گرتم و داوای لێکردم بۆی ڕوونکەمەوە. "ئینجا سپی دەبیتەوە،" فاتیمە ئەم ڕاستییەی بەیان کرد.

"چیت وت؟"

"تۆ سپی دەبیتەوە، دەزانیت..... سپی."

ئەم دەزانی. هیچم هەڵنەدەکران لەبارەی چییەوە قسە دەکات، چونکو هەرگیز کەسی سپی پێستم نەبینیبوو و لە ڕاستیشدا ئەم دەزانی کەسی وەها هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا تێبینییەکەی هیچ کاری تێنەکردم. "تکات لێدەکەم دەمت داخە،" بەو پەڕی سنگ دەرپەڕاندنەوە وتم. "تەنیا بەغیلیم پێدەبەیت، کە من دەچم بۆ لەندەن و تۆ ناچیت." دەستم کردەوە بە سەماکردن، خۆبادان و چەپڵە لێدان وەك

ئەوەی ئاهەنگی باران بارین بگێڕم، پاشان دەستم کردەوە بە گۆرانی وتن، 'من دەچم بۆ لەندەن! ئۆۆۆۆی یا!!!!! – من دەچم بۆ لەندەن!'

'واریس!' پورە ساهرو بە توڕەییەوە هاواری کرد.

ئەو ئێوارەیە پورم ئامادەی کردم بۆ سەفەرەکەم، بۆ یەکەم جار جووتێ پێڵاوم وەرگرت - قایشییەکی چەرمی جوان. بۆ ناو فڕۆکەکە کراسێکی درێژی ڕەنگ کراوە و بەسەریشیدا پاڵتۆیەکی ناسکی ئەفریقی. جانتام نەبوو، بەڵام گرفت نەبوو، چونکو هیچم نەبوو تەنیا ئەو جلانەی بەرم نەبێت، کاتێك بۆ سبەینێ خاڵە محەمەد دەهات و دەیبردم.

کاتێك ماڵئاواییم کرد بەرەو فڕۆکەخانە، باوەشم کرد بە پورە ساهرودا، فاتیمەی خۆشەویست و هەموو پورزا بچوکەکانم ماچم کرد. فاتیمە زۆر دڵسۆزم بوو، دەمویست لەگەڵ خۆمدا بیبەم. بەڵام دەم زانی تەنیا یەك کار هەیە بۆ یەك کەس، چونکو هەلومەرجەکە وابوو، خۆشحاڵ بووم بەوەی ئەو کەسە من بووم. خاڵە محەمەد پاسپۆرتەکەمی دامێ و بە سەرنجەوە تەماشام کرد - یەکەم دێکویمێنتی ڕەسمیم - چونکو لەوەوپێش هیچ کات ناسنامەی لە دایکبوون یان هەر بەڵگەنامەیەکم نەبوو، کە ناوی منی بەسەرەوە بێت. کە چوومە ناو ئوتومبیلەکەوە، هەستم بە شکۆیی کرد و دەستی ماڵئاواییم بۆ خێزانەکە بەرزکردەوە.

لەوەوپێش تەنها فڕۆکەم بە ئاسمانەوە بینیبوو. ناو بە ناو، کاتێك کە بزنەکانم دەلەوەڕاندن بە ئاسمانی بیابانەوە دەم بینین هاتوچۆیان بوو، لەبەرئەوە دەم زانی شتێکی وەها هەیە. بەڵام گومانی تیادا نەبوو، هەرگیز لە نزیکەوە نەم بینیبوو تا ئەو پاش نیوەڕۆیە لە مەقادیشۆ. خاڵە محەمەد منی بەناو فڕۆکەخانەکەدا برد و لە بەردەمی دەرگایەك کە دەکرایەوە بۆ دەرەوە بەرەو فڕۆکەکە، وەستاین. لەسەر قیرەکە، فڕۆکەیەکی بەریتانیم بینی، کە لەژێر هەتاوی ئەفریقادا دەبریسکایەوە.

لەو کاتەدا گوێم لە خاڵم بوو لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد '... و پورە مارویەمت لە لەندەن چاوەڕوانت دەکات. من لە پاش چەند ڕۆژێکی تر دەت بینمەوە. چەند کارم بۆ هاتۆتە پێشەوە دەبێت تەواوی بکەم پێش ئەوەی سەفەر بکەم.'

بەدەمی داچەقیوەوە ڕووم تێکرد و لێی وردبوومەوە. بلیتەکەی خستە دەستمەوە. 'ئێستا ئیتر بلیتەکەت ونەکەیت - یان پاسپۆرتەکەت - واریس. ئەوانە بەڵگەنامەیەکی گرنگن، ئاگاداریان بە.'

'تۆ نایەیت لەگەڵم؟' ئەوە تەنیا چەند وشەیەك بوو کە بە دڵی پڕ گریانەوە توانیم بیڵێم.

'نا،' یەکسەر وتی، 'دەبێت بۆ چەند ڕۆژێکی تر بمێنمەوە.' دەستبەجێ دەستم کرد بە گریان، لەترسی ئەوەی بە تەنیا دەڕۆم، دڵنیا نەبووم لەوەی پاش ئەم هەموو بەزمورەزمە، ئەمە شتێکی باش بێت. لەگەڵ ئەو هەموو گرفتەی کە هەم بوو، سومال تەنیا شوێنێك بوو کە دەم ناسی و ئەوەی کە چاوەڕوانی دەکردم تەواو نادیار بوو.

'بڕۆ هەموو شتێك ئامادەیە. کە گەیشتیتە ئەوێ، کەسێك دەتبینێت و پێت دەڵێت چی بکەیت.' کەوتمە هەناسەبڕکێ و ناڵاندن. خاڵم بە هێواشی پاڵی پێوە نام بەرەو دەرگاکە. 'دەی بڕۆ، فڕۆکەکە خەریکە دەکەوێتە جوڵاندن. بەس بچۆرە ناودوە ... بچۆ ناو فڕۆکەکەوە، واریس.'

بە ترسەوە بەسەر قیرە داخەکەدا ڕۆیشتم. تەماشای کرێکارەکانم کرد، هاتوچۆیان بوو بەدەوری فڕۆکەکەدا، خەریکی ئامادەکردنی بوون بۆ فڕین. کۆمەڵێکی ترم بینی خەریکی بارکردنی جانتاکان بوون، کرێکارەکان خەریکی پشکنینی فڕۆکەکە بوون، پاشان چاوم بە پێپلیکانەکان کەوت، بۆم پرسیار بوو کە چۆن بچمە ناو ئەم شتەوە. بڕیارم دا سەرکەوم بەسەر پێپلیکانەکاندا. بەلام ڕانەهاتبووم بە پێڵاوەوە بڕۆم، دەبووایە هەوڵم بدایە نەکەوم بەسەر پێپلیکانە ئەلەمنیومە خزەکەدا و لە هەمان

کاتیشدا قاچم لە کراسە درێژەکەم نەگیرێت. هەر کە چوومە ناو فڕۆکەکەوە، نەم دەزانی بۆ کوێ بڕۆم و ئیتر ڕۆشن بوو تەواو لە نەزان دەچم. لە کاتێکدا هەموو ڕێبوارەکان کورسی خۆیان گرتبوو و دانیشتبوون، بە سەرنجەوە تەماشای منیان دەکرد، دەم توانی دەموچاویان بخوێنمەوە: ئەم کچە لادێییە نەفامە کێیە کە تەنانەت نازانێت چۆن سەفەر بکات بە فڕۆکە؟' هەر لە نزیك دەرگاکەوە سەیرێکی دەوروپشتی خۆمم کرد و لەسەر کورسییەکی بەتاڵ دانیشتم.

ئەمە یەکەم جارم بوو کەسی سپی پێست ببینم. پیاوێکی سپی پێست کە بەرامبەرم دانیشتبوو، وتی، 'ئەوە کورسی تۆ نییە.' لەو باوەڕەدابووم وا دەڵێت، چونکو یەك وشە ئینگلیزی چی بوو نەمدەزانی. بە ترسەوە تەماشایم دەکرد و بیرم دەکردەوە، ئەی خوایە ئەم کابرا سپی پێستە چیم پێدەڵێت؟ بۆچی ئاواهییە؟ ڕستەکەی دووبارە کردەوە و منیش بە ترسەوە تەماشام دەکرد. بەڵام پاشان یاوەری فڕۆکەکە هات و بلیتەکەمی لەدەست وەرگرتم. ئاشکرابوو ئەم ژنە دەیزانی تەواو لە هیچ شتێك تێناگەم. دەستی گرتم و بەناو ڕاڕەوەکەدا بردمی بەرەو کورسییەکەم - گومانی تیادا نەبوو کلاسی یەکەم نەبوو، وەك ئەو شوێنەی کە خۆم لێی دانیشتبووم. کاتێك بە لای ڕێبوارەکاندا ڕۆیشتم، هەموو ئاوڕیان بۆ دامەوە. یاوەرەکە زەردەخەنەیەك گرتی و هێمایەکی بۆ جێگاکەم کرد. بە زەردەخەنەیەکی نەفامانەوە زوو دانیشتم، بەو هیوایەی بە دوور بم لە چاوی خەڵکی، بەسەر دانەواندنێك سوپاسی یاوەرەکەم کرد.

کەمێك پاش هەستانی فڕۆکەکە، هەمان یاوەری فڕۆکە بە سەبەتەیەك شیرینییەوە گەڕایەوە، بە زەردەخەنەیەکەوە فەرمووی لێکردم. بە دەستێکم کراسەکەمم گرتەوە، وەك ئەوەی میوە کۆکەمەوە، دەستەکەی ترم برد، پڕ بە چنگم شیرینیم هەڵگرت. قۆڕەی سکم لە برسا ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیشت، بە نیاز بووم کراسەکەمی لێ پڕکەم. کێ دەیزانی کەی چاوم بە خواردن دەکەوێتەوە؟ کاتێك

دووبارە دەستم ڕاکێشایەوە، یاودرکە هەوڵیدا شیرینییەکەم لێ دوورخاتەوە. خۆم درێژ کرد بۆ ئەوەی بیگەمێ ئەو زیاتر دووری خستەوە. دەموچاوی هاواری دەکرد، 'نۆی، تۆزێك هێواش. چی بکەم بە دەست ئەمەوە؟'

کاتێك خەریکی لێکردنەوەی کاغەزی شیرینییەکان و قووتدانیان بووم، تەماشای خەڵکە سپی پێستەکانی دەوروپشتم دەکرد.لەبەر چاوم سارد و نەخۆش دیار بوون. ئەگەر ئینگلیزم بزانیایە پێم دەوتن، 'ئێوە پێویستان بە هەتاوە.' لەو باوەڕەدا بووم. ئەم گرفتە دەگەڕێتەوە بۆ هەلومەرجێکی کاتی. نەدەکرا هەمیشە وەهابن، وا نییە؟ دیارە ئەم خەڵکە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە هەتاو بەدوور بوون، بۆیە وا سپی بوونەتەوە. بڕیارم دا، لە یەکەمین هەلدا دەستیان تێوەدەم، چونکە لەوانەیە ئەو سپێتییە شیاوی سڕین بێت. لەوانەیە لە ژێر ئەوەوە خۆیان لە ڕاستیدا ڕەش بن.

دوای نزیکەی نۆ دە کاژێرێك میزکردن تاوی بۆ هێنام. خەریك بوو دەتەقیم، بەڵام نەم دەزانی بۆ کوێ بچم. بیرم دەکردەوە، دەی واریس، تۆ دەتوانیت بیدۆزیتەوە. لەبەرئەوە زۆر بە وردی چاودێری خەڵکەکەی دەوروپشتی خۆمم دەکرد، کە چۆن هەڵدەستن و دەچن بۆ لای دەرگایەك. ئەوە دەبێت خۆی بێت، لێکم دایەوە. هەستام و یەکسەر بەرەو ئەو دەرگایە چووم، کاتێك یەکێك هاتە دەرەوە. بێ سێ و دوو خۆمم کرد بە ژووردا و دەرگاکەم داخست و کەوتمە گەڕان بە دوایدا. ئەمە دەبوو شوێنی خۆی بێت، بەڵام سیفۆنەکە لە کوێیە؟ تەماشایەکی دەستشۆردەکەم کرد، بەڵام لەبەرچاوم نەگرت. تەماشایەکی کورسییەکەم کرد، بۆنم کرد و بۆم ڕۆشنبۆوە ئەمە ئەو شوێنەیە کە بە دوایدا دەگەڕێم. بەخۆشییەوە دانیشتم و واووو!

ناهێکی ئارامی هات بە گیانمدا تا هەستامەوە و بینیم میزەکەم هەروا لە شوێنی خۆیدا ماوەتەوە. دەبێت ئێستا چی بکەم؟ ئەم دەویست هەروا جێی بهێلم و کەسێکی

تر ببیبنێت. بەڵام چۆن لێرە نەیهێڵم؟ نەم دەتوانی ئینگلیزی قسە بکەم - یان بیخوێنمەوە - لەبەرئەوە وشەی *بیشۆ* کە بەسەروو دوگمەیەکەوە نووسرابوو، بۆ من واتایەکی نەبوو. هەتا ئەگەر لەو وشەیەش بگەیشتمایە، لە ژیانمدا هەرگیز تواليتی وەهام نەدیبوو. تەماشای هەموو دەسك، دوگمە و پێچکم کرد لە ناو ژوورەکەدا، بۆم پرسیار بوو کە ئەم شتە ئەوەیە کە میزەکە ناهێڵێت. جار لە پاش جار دەگەڕامەوە بۆ دوگمەی بیشۆ، کە وا دەردەکەوت، کە خۆی بێت. بەڵام دەترسام ئەگەر دەستی پیادا بنێم لەوانەیە فڕۆکەکە بتەقایەتەوە. لە مەقادیشۆ بیستبووم ئەم شتانە ڕوودەدا. لەگەڵ بەردەوامی جەنگدا، خەڵك لە باری بۆمب و تەقینەوە لێرە و لەوێ قسەیان دەکرد. لەوانە بوو ئەگەر دەستم بەو دوگمەیەدا بنایە، فڕۆکەکە بتەقایەوە و هەمووومان تیابچووینایە. لەوانە بوو هەر ئەو ئاگادارییەش بەسەر دوگمەکەوە، نووسرابێت: دەست نەدەی بەمەدا! فڕۆکەکە دەتەقێتەوە. باشتر وابوو هەوڵی وەها نەدەم لەبەر خاتری تۆزێك میز، لە دڵی خۆمدا وتم. لەگەڵ ئەوەشدا نەم دەویست پاشماوەی ئەم کارە بۆ کەسێکی تر جێبهێڵم. وە دەشیان زانی دروست کێ ئەمەی کردووە، چونکو ئێستا خەڵك لەبەردەمی دەرگاکەدا ڕاوەستاون و بەردەوام بە قایمی لە دەرگاکەیان دەدا.

وەك ئەوەی پەیامم بۆ بێتە خوارەوە، پەلاماری پەرداخێکی کاغەزی بەکارهاتووم دا و لە دەزوولە ناوی بەلوعەکە پڕم کرد لە ناو و کردمە ناو سیفۆنەکەوە، بەو مەبەستەی کە میزەکە ڕوون بێتەوە و کەسی دوای خۆم وا بزانێت، کە سیفۆنەکە تەنیا پڕیەتی لە ئاو. بەردەوام خەریکی پڕکردن و خاڵی کردنی پەرداخەکە بووم، پڕیکە و خاڵیکە. ئیتر لەو کاتەدا، خەڵك نەك هەر لە دەرگایان دەدا بەڵکو کەوتنە هاوارکردنیش. منیش تەنانەت وەڵامیشم نەدەدانەوە، بڵێم، 'تەنیا یەك خولەك ....' بەبێ دەنگی خەریکی پیلانی خۆم بووم، پەرداخی کاغەزی خوساوم لە دەزوولە ئاوی بەلوعەکە پڕدەکرد و دەمڕشتە ناو سیفۆنەکەوە. تا ناو گەیشتە لێوانی و بە

تنۆکە ئاوێکی تر سەررێژی دەکرد و ئەو ئاوەی دەکرد بە ئاو، ئینجا دەستم هەڵگرت. بەڵام باش بوو، ئاو سیفۆنەکە وا دەردەکەوت، کە پڕیەتی لە ئاو، ئینجا خۆم ڕاستکردەوە و دەستێکم هێنا بە کراسەکەمدا و دەرگاکەم کردەوە. سەرم داخست و بەلای ئەو کەسانەدا کە لەبەردەمی دەرگاکەدا ڕاوەستابوون تێپەڕیم، خۆشحاڵ بووم بەوەی کە بەزمێکی گەورەم نەقەوماندبوو.

کاتێك لە هێسرۆ نیشتینەوە، خۆشی ئەوەی لە فڕۆکەکە ڕزگارم بووە، ترسی ئەوەی لا کەمکردبوومەوە کە بەرەو ڕووی وڵاتێکی ناناشنا دەبمەوە. هیچ نەبێت پورم لێرەیە و بەرەو پیرم دێت، کە شایەنی پێزانینە. کاتێك فڕۆکەکە نزم دەبووەوە، ئاسمانی دەرەوەی پەنجەرەکە، لە هەورێکی سپی کەفاوییەوە بوو بە تەمومژێکی خۆڵەمێشی. هەرکە ڕێبوارەکان هەستان، منیش هەستام و خۆم دایە بەر لێشاوی ئەو خەڵکە بەرەو دەرگای فڕۆکەکە، بێئاگا لەوەی بەرەو کوێ دەچم، چی دەبێت بکەم. کۆمەڵە خەڵکەکە منیان ڕامالی تا گەیشتینە ڕیزێك پێپلیکانە. تەنیا گرفتم ئەوە بوو: پێپلیکانەکان دەجوڵان. لەپڕ وەستام و کەوتمە تەماشاکردنی ئەو خەڵکە. لێشاوی خەڵك بەلامدا دەڕۆیشتن و منیش تەماشام دەکردن کە چۆن ئاسان هەنگاو دەنێنە سەر پێپلیکانەکە و بەرز دەبنەوە بۆ سەرەوە. لاسایم کردنەوە، هەنگاوم نا بۆ پێشەوە و چوومە سەر پێپلیکانەکە. بەڵام تاکێك لە پێڵاوە تازەکەم لەسەر زەویەکە بەجێما. "پێڵاوەکەم! پێڵاوەکەم!" بە سۆماڵی هاوارم کرد و ویستم بگەڕێمەوە. بەڵام ئەو کۆمەڵە خەڵکەی لە پشتمەوە ڕاوەستابوون، ڕێگر بوون لەبەردەممدا. لەسەرەوە، شەلەشەل بە تاکێك پێڵاوەوە لەگەڵ خەڵکەکەدا ڕۆیشتم. پاشان گەیشتینە کۆنترۆڵ. تەماشایەکی پیاوە سپی پێستەکانم کرد بە جلوبەرگی ڕەسمی ڕێکوپێکی بەریتانییەوە - هیچ شتێکم لەبارەی ئەم پیاوانەوە نەدەزانی. کارمەندی کۆنترۆڵ بە ئینگلیزی کەوتە قسەکردن و منیش لە هەوڵی دۆزینەوەی

پارمەتیدەرێکدا بووم، هێمام بۆ پێپلیکانەکان کرد و بە سۆماڵی کەوتمە هاوار کردن، 'پێڵاوەکەم! پێڵاوەکەم!'

کارمەندەکە بە بێزارییەوە چاوی تێبڕیم و دەستەپاچانە کەوتە دووبارەکردنەوەی پرسیارەکەی. بە نیگەرانییەوە کەوتمە پێکەنین، بۆ ماوەیەك پێڵاوەکەمم بیرچووەوە. هێمایەکی بۆ پاسپۆرتەکەم کرد و منیش دامە دەستی. پاش ئەوەی بە وردی تەماشای کرد، مۆری کرد و هێمای بۆ کردم، بڕۆم بۆ پێشەوە.

لە دەردوەی کۆنترۆڵ، پیاوێك بە جلوبەرگی ڕەسمی شۆفێرییەوە بەرەو پیرم هات و بە سۆماڵی پرسیاری لێکردم، 'تۆ ئەو کەسەی کە بۆ مستەر فەرەح کار دەکەیت؟'

ئاهێك بە گیانمدا هات، کە کەسێکم دۆزییەوە بە زمانەکەی خۆم بدوێت. بەخۆشییەوە هاوارم کرد، 'بەڵێ! بەڵێ! من ئەوم، واریسم.' شۆفێرەکە ویستی بمبات، بەڵام وەستاندم. 'پێڵاوەکەم، دەبێت بچینە خوارەوەی پێپلیکانەکان و پێڵاوەکەم بهێنمەوە.'

'پێڵاوەکەت؟'

'بەڵێ، بەڵێ، لەخوارەوە لەوێیە.'

'لە کوێیە؟'

'لەخوارەوەی ئەو پێپلیکانانەیە.' هێمایەکم کرد بۆ دواوە. 'لێم جێما کاتێك سەرکەوتم.' تەماشایەکی قاچەکانی کردم، یەکێکیان بە پێڵاوەوە و ئەوی تریان بێ پێڵاو.

خۆشبەختانە شۆفێرەکە بە ئینگلیزی قسەی دەکرد، مۆڵەتی وەرگرت و چووینەوە ناوەوە بەدوای لنگە پێڵاوەکەدا. بەڵام کە گەیشتینە ئەو شوێنەی لێم جێمابوو، هەواڵێك لە لنگە پێڵاو نەبوو. باوەڕم نەدەکرد ئەوەندە بەدبەخت بم. تاکە پێڵاوەکەی ترمم داکەند و گرتم بە دەستمەوە، هەر چاوە چاوم بوو بەو ناوەدا هەتا هاتینە سەرەوە. بەڵام دیسانەوە ناچار بووین بە بەردەمی کۆنترۆڵکەدا بڕۆین.

ئەم جارەش هەمان کارمەند، بە کەڵك وەرگرتن لە ئینگلیزی زانینی شۆفێرەکە، پرسیارەکەی دووبارە کردەوە کە یەکەم جار لێی کردبووم.

'چەند دەمێنیتەوە لێرە؟' کارمەندەکە پرسیاری کرد. منیش هەردوو شانم بۆ بەرزکردەوە. 'بۆ کوێ دەچیت؟'

'دەچمە لای خاڵم دەژیم، کە باڵوێزە.' بە شانازییەوە وتم.

'لە پاسپۆرتەکەت نووسراوە تۆ هەژدەی، ئەوە ڕاستە؟'

'ها؟ من هەژدە نییم!' بەرەو ڕووی شۆفێرەکە نارەزایەتیم دەربڕی. ئەویش وەریگێڕا بۆ کارمەندەکە.

'هیچ شتێکت هەیە ئەمە ڕوونبکاتەوە؟' لە پرسیارەکەی تێنەگەیشتم.

شۆفێرەکە کەوتە ڕوون کردنەوە، 'چیت لەگەڵ خۆت هێناوە بۆ ناو ئەم وڵاتە؟' لنگە پێڵاوەکەمم بۆ بەرزکردەوە. کارمەندەکە بۆ چەند ساتێك چاوی بڕییە لنگە پێڵاوەکە، پاشان کەمێك سەری بادا، پاسپۆرتەکەمی گەڕاندەوە و هێمای کرد تێپەڕین.

کاتێك شۆفێرکە منی لە قەڵەباڵغی فڕۆکەخانە بردە دەرەوە، دەستی کرد بە قسەکردن، 'تەماشاکە، پاسپۆرتەکەت دەڵێت تۆ هەژدەی، لەبەرئەوە منیش هەر ئەوەم پێوتن. ئەگەر هەر کەسێك پرسیاری لێکردی، تۆ دەبێت هەر ئەوە بڵێیت.'

'من هەژدە نییم،' بە توڕەییەوە وتم. 'ئەوە گەورە کراوە!'

'باشە، تەمەنت چەندە؟'

'نازانم - لەوانەیە چواردە - بەڵام من ئەوەندە گەورە نییم!'

'سەیرکە، ئەوەی پاسپۆرتەکەت دەڵێت، ئێستا دەبێت تەمەنت ئەوە بێت.'

'ئەوە تۆ دەڵێی چیی؟ من بۆم گرنگ نییە پاسپۆرتەکەم دەڵێت چی - بۆچی وا دەڵێت. ئایا ئەوەی من پێت دەڵێم ڕاست نییە؟'

'لەبەرئەوەی مستەر فاراح وای پێوتوون.'

'باشە، ئەو شێتە! ئەو هیچ شتێك نازانێت!'

هەتا کە گەیشتینە دەرگای چوونە دەرەوە، هەر شاتە شاتمان بوو، لەگەڵ شۆفێرەکەی خاڵە محەمەد ڕقەبەرایەتییەکی باشمان دامەزراند.

کاتێك بە پێی پەتی بەرەو ئوتومبیلەکە دەچووم، لە لەندەن بەفر دەباری. لە سەرمادا هەڵدەلەرزیم، لنگە پێڵاوەکەم لە پێ کرد و کراسە تەنکەکەمم لە خۆ پێچا. هەرگیز هەوای وام لەوەو پێش نەبینیبوو و گومانیشی تیادا نەبوو هەرگیز بەفرم نەبینیبوو. 'ئەی ئێرە چەند ساردە!'

'پێی ڕادێیت.'

کاتێك بە ئوتومبیل بە هێواشی لە فڕۆکەخانەکە هاتینە دەرەوە و کەوتینە ناو ترافیکی بەیانیانی لەندەنەوە، هەستێکی غەمناکی و تەنیایی دایگرتم، لە ناو جیهانێکی تەواو ناناشنادا، هیچت لێوە دیار نەبوو تەنیا دەموچاوی نەخۆشی سپی هەڵگەڕاو نەبێت. ئەی هاوار! ئەی ئاسمان! دایە! من لە کوێم؟ لەو کاتەدا هیوابڕاو دایکمم دەویست. لەگەڵ ئەوەی شۆفێرەکەی خاڵە محەمەد تەنیا دەموچاوی ڕەش بوو لە دەورم، بەڵام مایەی خۆشیم نەبوو، ئاشکرا بوو منی لە خۆی بە کەمتر دەزانی.

کاتێك ئوتومبیلەکەی لێدەخوڕی، گوێچکەمی کەڕ کرد بە زانیاری لەسەر ئەو خێزانەی، کە من دەبووم بە ئەندامێکی: لەوێ دەژیام لەگەڵ خاڵ و پورم، دایکی خاڵە محەمەد، خاڵێکی تر کە لەوەو پێش نەمبینیبوو - یەکێك لە براکانی دایکم و پورە ماروپم - و حەوت پورزا منداڵەکانم. پاش ئەوەی کە لێبووەوە لەوەی کێن ئەوانەی لە ماڵەکەدا دەژین، کەوتە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کەی دەبێت لە خەو هەڵسم، چی دەکەم، چی لێدەنێم، لە کوێ دەنوم، کەی دەچمە جێگاوە و کە لە کۆتایی ڕۆژدا دەچمە جێگاوە چەند هیلاکم.

"دەزانی پورت. خانمی ماڵ، ئەم کارانە بە دەستێکی پۆڵایین دەباتە پێشەوە." کابرای شۆفێر، ئەم ڕاستییەی لا درکاندم. "با بزانیت، هەموو کەس دەورانێکی سەختی لەگەڵدا بووە."

"باشە. لەوانەیە کاتێکی سەختی لەگەڵدا بەرمەسەر، بەڵام ئەو پوری منە." هەروەها ئەو ژنە، خوشکی دایکمە، لەبەرخۆمەوە وتم. بیرم لای خۆم نەما، زۆر بیری دایکمم دەکرد، بیری پورە ساهرو و فاتیمەم دەکرد، کە چۆن بوون بۆ من. هەتا ئامان مەبەستی باش بوو، بەڵام ڕێك نەدەکەوتین. ژنان لە ناو خێزاندا چاویان لە یەکترییە و یارمەتی یەکتر دەدەن. بە کورسییەکەمەوە پاڵم دایەوە، لەپڕ هەستم کرد سەفەری دوور و درێژ زۆر هیلاکی کردووم.

لە پەنجەردی ئوتومبیلەکەوە هەوڵمدەدا ببینم ئەم پڕوشە بەفرانە لە کوێوە دێن. بەفر شۆستەی ڕێگا و بانی ئەو ناوچە خەڵك نشینەی، کە ئێمە بۆی دەچووین، شەقامی هارلیف، سپی کردبوو. کاتێك کە لەبەردەم دەرگای ماڵی خاڵمدا وەستاین، بەسەرسامییەوە تەماشام کرد و زانیم کە لە چ کۆشکێکی گەورەدا دەژیم. بەپێی ئەزمونێکی سنووورداردا کە لە ئەفریقادا هەمبوو، هەرگیز شتی وام نەبینیبوو. ماڵی باڵوێز خانوویەکی چوار نهۆمی زەردی بەرز بوو، ئەو ڕەنگەی کە من حەزم لێدەکرد. بەرەو دەرگای پێشەوە ڕۆیشتین، دەروازەیەکی دلگیر، گڵۆپی چرای بەسەردوە بوو. لەو دیوی دەرگاکەوە، ئاوێنەیەکی گەورەی چوارچێوە ئاڵتونی پەرچی دۆڵابێکی پڕ کتێبی لە دیواری بەرامبەردا، دەدایەوە.

پورە مارویم هاتە ڕاڕدوەکەوە بۆ بەخێرهاتنم. "پوری!" هاوارم کرد.

ژنێك بەئاستەم لە دایکم گەنجتر بوو، بە جلوبەرگێکی ڕۆژئاواییانەوە، لە هۆڵەکەدا وەستا. "وەرە ژوورەوە." بە ساردییەکەوە وتی. "دەرگاکە داخە." وام دانابوو ڕاکەم بەرەو ڕووی و باوەشی پیادا بکەم، بەڵام لە دوورەوە وەستابوو،

هەردوو دەستی خۆیی گرتبوو، لەناو دەرگاکەدا وشکی کردم. 'لەپێشدا پێمخۆشە ئەم ناوەت پیشان بدەم و بۆت باس بکەم کارەکانت چییە.'

'ئاه،' بە هێواشی وتم، هەستم کرد، دوا تنۆك هێزم لەبەر برا. 'پورێ، زۆر هیلاکم. دەمەوێت پاڵکەوم. تکات لێدەکەم دەتوانم هەر ئێستا بچمە جێگاوە؟'

'باشە، بەڵێ. وەرە لەگەڵم.' بەناو ژووری دانیشتنەکەدا ڕۆیشتین و کاتێك سەرکەوتین بەسەر پێپلیکانەکاندا، کەلوپەلێکی ناومالّی جوانم بینی، سورەیایەك، مۆبیلەیەکی سپی کە بە دەرزەنێك گۆشە داپۆشرابوو، تابلۆیەکی زەیتی بەسەر موغەیرییەکەوە، کە قرچوهوڕی دار سوتاندنی لێوەدەهات. پورێ بردمیە ژووری نووستنەکەی خۆی و پێی وتم کە دەتوانم لە جێگاکەیدا بنوم. چەرپایەك بە قەدەر کەپرەکەی مالّی باوکم دەبوو، بە لێفەیەکی جوانی ئاوریشمی داپۆشرابوو. دەستم پیا هێنا، هەستم بە خۆشی کرد. 'هەر کاتێك هەستای ماڵەکەت پیشان دەدەم.'

'تۆ هەڵم دەسێنیت؟'

'نا، هەر کاتێك خەبەرت بۆوە، هەڵدەستیت. بە هەوەسی خۆت بنو.' چوومە ژێر لێفەکەوە و هەستم کرد، کە لە هەموو ژیانمدا هەستم بە شتێکی واها نەرم نەکردووە. پورم بە هێواشی دەرگاکەی داخست، خەوم لێکەوت وەك ئەوەی بکەومە ناو توونێلێکەوە - توونێلێکی تاریکی درێژ.

## بەشی نۆیەم
## کارەکەرەکە

کاتێك چاوم کردەوە، وام دەزانی خەو دەبینم - خەوێکی خۆش. لەپێشدا باوەڕم نەدەکرد ئەوە منم، لە ناو پێخەفێکی گەورە و ژوورێکی ڕازاوەدا وەخەبەر هاتووم. ئەو شەوە دەبێت پورە مارویم لە لای یەکێك لە منداڵەکانی خەوتبێت، چونکو بێناگا لە ناو جێگاکەیدا تا بەیانی خەوتم. هەر کە لەناو جێگاکە هاتمە دەرەوە ژیانی ڕاستەقینە ژیانی خەیاڵی ڕەواندەوە.

لە ژوورەکەی پورم هاتمە دەرەوە و بەناو ماڵەکەدا کەوتمە گەڕان بەدوای ئەو شوێنەدا، کە یەکتریمان تیادا بینیبوو. "چاکە. هەستاویت. با بچین بۆ چێشتخانە و ئەوەی تۆ دەیکەیت، با پیشانت بدەم." بەسەروچاوی خەواڵوەوە، دوایکەوتم بۆ ئەو ژوورەی پێی دەوت چێشتخانە، چەند سەرم هێنا و سەرم برد، لەو چێشتخانەیە نەدەچوو کە لە ماڵی پورم لە مەقادیشۆ بینیبووم. ژوورەکە دەوردرابوو بە کاونتەری سپی شیری، کە لەگەڵ خشتی سیرامیکی شین دەبریسکانەوە، لە ناوەڕاستدا تەباخێکی گازی شەش چاوی تیادابوو. پورم یەك لەسەر یەك چەکمەجەی دەکردەوە و دای دەخستەوە، هاواری دەکرد، "... قاپ و قاچاغی چێشتخانە، کەوچك و چەتاڵ و چەقۆ، قوماشی کەتانی..." ئەوەی ئەو دەیوت هەڕیم لە بڕی نەدەکردەوە - هیچ بیرێکم لەبارەی ئەوەی ئەو پیشانی دەدام نەبوو، هەتا بگات بەوەی من بەکاریان بهێنم. "کاتژمێر شەش و نیوی هەموو بەیانییەك بەرچایی دەدەیت بە خاڵت، چونکو ئەو زوو دەچێت بۆ باڵۆیزخانە. نەخۆشی شەکرەی هەیە، دەبێت زۆر ئاگاداری شەکرەکەی بین، هەمیشە یەك شتی دەوێت: چای حێڵاوی و دوو هێلکەی کوڵاو. کاتژمێری حەوت پێمخۆشە قاوەکەمم بۆ بێنیتە ژوورەکەی خۆم، پاشان

پانكەیك[1] دروست دەكەیت بۆ منـداڵان، دروست كاتـژمێری هەشت دەیخۆن، چـونكو كاتژمێری نۆ دەبێت لە قوتابخانە بن. پاش نانی بەیانی -'

'پورێ، بڕیارە چۆن من ئەم هەموو شتانە بزانم؟ كێ فێری ئەمانـەم دەكات؟ مـن نازانم چۆنیان بكەم - وتت چی - پانكەیك. پانكەیك چییە؟'

پورە مارویم هەناسەیەكی قوڵی هەڵكێشا و دەستی بـۆ لای دەرگاكـە درێـژ كردبـوو كە قسەكەم پێبڕی، بۆ چـركەیەك هەناسـەی خـۆی گـرت، دەسـتی هـەروا بـە حـەواوە مایەوە، بە دەموچاوێكی پڕ تـرس و نیگەرانییەوە چاوی تێبڕیم. پاشـان بـە هێواشـی هەناسـەی دایـەوە و دەسـتی هێنایـە خـوارەوە، كەوتـەوە دەسـت گوشـینی خـۆی، وەك ئەوەی كە بۆ یەكەم جار بینیم. 'بۆ یەكەم جار هەموو ئـەم شـتانە دەكـەم، واریـس. بـەڵام دەبێـت بـە وردییـەوە تەماشـایان بكـەیت. زۆر بـە وردییـەوە سـەرنج بـدەیت، گوێبگریت و فێربیت.' سەرم بۆ لەقاند، ئینجا جارێكی تـر هەناسـەی هەڵمژییـەوە، لە كوێدا قسەكەم پێبڕی بوو، دەستی پێكردەوە.

پاش هەفتەی یەكەم و چـەند كـەتنی بـچوك، دروست تـەواوی كارەكـەم بەشـێوەی بەردەوام هەموو ڕۆژێك،ساڵی سێ سەد و شەست و پێنـج ڕۆژ بـۆ مـاوەی چـوار سـاڵ، ئەنجام دا. بۆ كچێك كە هەرگیز سەری دەرنەدەكرد لە كـات و كاتـژمێر، فێـری ئـەوە بووم لەنزیكەوە چاوێكم لە كاتژمێرەوە بێت - وە بەو شێوەیە بژیم. كاتژمێر شەش هەستە، لە شەش و نیو نانی بەیانی بدە بە خاڵت، لە حەوت قـاوە بـەرە بـۆ پـورێ و لــە هەشــت بەرچــایی بــە منــداڵان. پاشــان چێــشتخانەكە پاككــەرەوە. شــۆفێری ئوتومبیلەكە لە گەیاندنی خاڵم بۆ باڵوێزخانە دەگەڕایەوە بـۆ بردنـی منداڵەكان بـۆ قوتابخانە. پاشان پاككردنەوەی ژووری پورم، ئینجا حەمامەكەی، پاشان تـۆز لابـردن، گسك دان و سڕینی ژوور بە ژووری ماڵەكە لە نهۆمی یەكەمـەوە بـۆ چـوارەم. بـاوەڕم پێبكە ئەگەر پاككردنەوەی شوێنێك بە دڵی یەكێك نەبوایـە، دەبـوو بـە هـەرا. 'بـەو شێوەیەی تـۆ حەمامەكە پاكدەكەیتـەوە، بـە دڵـم نییـە. بـۆ جـارێكی تـر دڵنیابـە لـە

پاککردنەوەکەت. خشتی کاشییە سپییەکان نابێت پەڵەیان پێوە بێت - دەبێت شەوق هەڵبهێنن.'

بێجگە لە شۆفێر و چێشتکەری ماڵ، من تەنیا کارەکەری هەموو ماڵەکە بووم، پورم دەیوت، پێویست ناکات بۆ یارمەتی، یەکێکی تر بەکرێ بگرین بۆ خانوویەکی بچوکی وەك ئەوەی ئێمە. چێشتکەر هەفتەی شەش ڕۆژ نانی ئێوارەی دروستدەکرد و ڕۆژی یەکشەممان پشووی هەبوو، من نانم دروستدەکرد. لەتەواوی چوار ساڵدا هەرگیز بۆ ڕۆژێك پشووم نەبوو. چەند جارێك کە داوام کرد، پورم وا کەللەیی دەبوو، کە ئیتر باسم نەکردەوە.

لەگەڵ خێزانەکەدا نانم نەدەخوارد. هەرکات هەل هەڵبکەوتایە دەستم بۆ شتێك دەبرد و هەر خەریکی ئیش دەبووم تا نیوەشەو بە لادا دەهاتم لە ناو جێگادا. بەڵام هەستم نەدەکرد شتێکی گەورەم لە کیس دەچێت، کە ئێواران لەگەڵ خێزانەکە نان ناخۆم، چونکو وای بۆدەچووم، کە نانی دەستی چێشتکەرەکە کەستەکە. چێشتکەرەکە سۆماڵی بوو، بەڵام لە خێڵەکەی ئێمە نەبوو. وە بە پیاوێکی لووتبەرز، خراپەکار و تەمەڵم دەزانی، کە ئازاردانی منی پێخۆش بوو. هەرکات پورم ڕێی بکەوتایەتە چێشتخانە، دەستی دەکرد بە بەزم نانەوە: 'واریس، بەیانی دووشممە کە گەڕامەوە، وا چێشتخانەکەت جێهێشتبوو کە قێزم دەهاتەوە، بۆ من چەند کاژێری وێست تا پاکی کەمەوە.' بێگومان درۆیەکی شاخدار بوو. دەیزانی خواردنەکەی هیچ نییە، مەبەستی بوو بەوە خۆی لای پورم و خاڵم خۆشەویست کات. بە پورمم وت، من نامەوێ چێشتی دەستی ئەو کابرایە بخۆم. پوریشم وتی، 'باشە، مادام وایە، هەرچی خۆت پێت خۆشە دروستی بکە.' ئیتر لێرەدا خۆشحاڵ بووم بەوەی شتێك فێربووبووم لە فاتیمەی پورزامەوە لە مەقادیشۆ. بەڵام هەر لە منداڵییەوە بە توانا بووم بۆ خواردن دروستکردن و دەستم کرد بە ئامادەکردنی معکەرۆنی و دروستکردنی خواردنی جۆراوجۆر کە لە داهێنانی خۆم بوو. کاتێك کە خێزانەکە

بینیـان چـی دەخـۆم، ئـەوانیش داوایـان کـرد. ئـیتر دەستیان کـرد بـەوەی پرسـیارم لێبکەن، کە چیم پێخۆشە دروستی کەم. ئەمەش مایەی ڕەزا سوکی زیاترم نەبوو لای چێشتکەرەکە.

بە کۆتایی هاتنی یەکەم هەفتەم لە لەنـدەن، پـێم زانـی کـە بۆچـوونی مـن لەگـەڵ پور و خاڵمدا، زەوی تا ئاسمان جیـاوازە لـە سـەر ئـەوەی، مـن چ دەورێکـم دەبێـت لـە ژیانی ئەواندا. ئەمە لە تەواوی زۆربەی وڵاتانی ئـەفریقادا ئاسایی بـوو، کـە خێزانـە دەوڵەمەنـدەکان منـداڵی خێزانـی خزمـە هـەژارەکانیان بگرنـە خۆیـان و لەبەرامبـەر ئەوەی کاریان بۆ بکەن، بەخێویان بکـەن. هەنـدێك جار ئـەم خێزانـە ئـەو منداڵانـە پـەروەردە دەکـەن و وەك منـداڵی خۆیـان هەڵسوکەوتی لەگەڵـدا دەکـەن. هەنـدێك جاریش نـا. ڕۆشـن بـوو، ئاواتـەخوازبم هەلومـەرجم وەك کۆمـەڵی یەکـەم دەرچـێت. بـەڵام زوو تێگەیـشتم، کـە پـور و خـاڵم زۆر شـتی گرنگتریـان لـە سـەردایە تـا ئـەوەی لایەك لە ڕۆشنبیرکردنی منداڵێکی نەفام بکەنەوە، کە لـە بیابانـەوە بۆیـان هـاتووە و بڕیـارە کارەکـەرییان بـۆ بکـات. خـاڵم ئەوەنـدە سـەرگەرمی کارەکـەی بـوو، سـەری نەدەپەرژایە سەر ئەوەی چی لە ماڵەکەدا ڕوودەدا. بەڵام پورم، کە لە خەیاڵی خۆمدا کردبووم بە دایکی دووەمم، لەوە دەچوو لە خەیاڵی ئـەوەدا نـەبێت، بمکات بـە کـچی سێیەمی خۆی. بەبێ هیچ دوودڵییەك کارەکەرێك بـووم. هـەر کـە ئـەم ڕاسـتییە ڕۆژ بە ڕۆژ ڕۆشـنتر دەبـووەوە، لـەپاڵ ڕۆژکاری درێـژ و قورسـدا، خۆشـی هـاتنی لەنـدەنم ڕەوییەوە. بۆم دەرکـەوت ئـەو بڕیارانـەی ئـەو داوێـتی بـە مـوو لێـی لانـادات، هـەموو شتێك هەردەم وەك ئەوەی ئەو دەیوت، دەبوایـە هـەر هـەموو ڕۆژێـك لـەکاتی خۆیـدا بکرایە. ئاوازەی تیادا نەبوو. لەوانەیە وای بۆچووبێت، کە دەبێت چاوپۆشـی نـەکات، بۆئەوەی سەرکەوتووبێت لەم کەلتوورە بیانییەدا، کە زۆر جیاواز بوو لەوەی خۆمان. هەرچی چۆنێك بوو، خۆشبەختانە هاوڕێیەکم لەناو ماڵەکەدا دۆزییەوە، کە باسمەی پورزام بوو.

باسمە گەورەترین کچی خاڵ و پورم بوو، هاوتەمەنی من بوو. جوانییەکەی سەرسوڕهێنەر بوو، کوڕان هەموو بە دوایەوە بوون، بەڵام ئەم ئاوڕی لە کەس نەدەدایەوە. دەچوو بۆ قوتابخانە و شەوانیش تەنیا حەزی لە خوێندنەوە بوو. پورزاکەم دەچووە ناو جێگاکەیەوە، بە چەندەها کاژێر سەری لەسەر کتێبەکەی بەرز نەدەکردەوە. هەندێك جار ئەوەندە سەرگەرمی خوێندنەوە دەبوو نانخواردنی لە بیر دەچووەوە، هەندێك جاری تریش تەواوی ڕۆژ دەیخوێندەوە تا یەکێك پەلی دەگرت و لە ژوورەکەی ڕایدەکێشایە دەرەوە.

کاتێك هەستم بە تەنیایی و بێزاریی دەکرد، دەچووم بۆ لای بۆ ژوورەکەی و لە قەراخی قەرەوێڵەکەی دادەنیشتم و پرسیارم لێدەکرد، 'چی دەخوێنیتەوە؟'

بەبێ ئەوەی سەر بەرز بکاتەوە، لەژێر لێوەوە دەیوت، 'وازم لێبێنە، دەخوێنمەوە....'

'باشە، دەتوانم قسەت لەگەڵدا بکەم؟'

هێشتا سەری لە کتێبەکە بەرزنەکردبووەوە، بە دەنگێکی هێواش و وشەی پچڕپچڕەوە وەڵامی دەدامەوە، وەك ئەوەی بەدەم خەوەوە بدوێت، 'لەبارەی چییەوە دەتەوێت قسە بکەیت؟

'چی دەخوێنیتەوە؟'

'ئاوا؟'

'چی دەخوێنیتەوە؟ لەبارەی چییەوەیە؟ لەکۆتاییدا جارێکیان سەرنجیم ڕاکێشاو و کتێبەکەی داخست و ناوەڕۆکی کتێبەکە چی بوو، بۆی گێڕامەوە. زۆربەی کتێبەکان چیرۆکی ڕۆمانتیکی بوون، کە تیایدا کوڕ و کچ دەگەیشتنە لوتکە کاتێك یەکتریان ماچ دەکرد، پاش چەند دابڕان و خراپ لە یەکتر تێگەیشتن. چونکو لەزۆر دەمێکەوە حەزم لە چیرۆك بوو، زۆر کەیفم بەو کاتانە دەهات، دادەنیشتم و گەشکە دەیگرتم کاتێك کە هەموو بەسەرهاتەکەی بە وردییەوە بۆی دەگێڕامەوە، لەگەڵیدا

چاوی چەخماخەی دەدا و باڵای لە جوڵە نەدەکەوت. گوێگرتن بۆ چیرۆکەکانی باسمە، حەزی فێربوونی خوێندنەوەی لا دروست کردم، چونکو هێنامە پێشچاوی خۆم کە دەتوانم کەیف لە چیرۆك ببینم هەر کات بمەوێت.

خاڵە عەبدولاّم، کە برای دایکم بوو، لەگەڵماندا دەژیا و لەگەڵ خوشکەکەیدا هاتبوو بۆ لەندەن تا بتوانێت لە زانکۆ بخوێنێت. لێی پرسیم کە دەمەوێت بچم بۆ قوتابخانە. 'واریس دەزانی تۆ پێویستت بەوەیە فێری خوێندن ببیت. ئەگەر حەزت لێیە دەتوانم یارمەتیت بدەم.' پێی وتم، قوتابخانە دەکەوێتە کوێوە، کەی دەتوانم بچم - لە هەمووی گرنگتر - بە خۆڕاییە. بیرۆکەی چوون بۆ قوتابخانە، هەرگیز بە مێشکی مندا نەهاتبوو. باڵوێز مانگانەیەکی کەمی پێدەدام، کە تەنیا پارەی گیرفان بوو، بەلاّم بێگومان بەشی ئەوەی نەدەکرد بیدەم بە قوتابخانە. سەرمەستی ئەوەی فێری خویندن دەبم، چووم بۆ لای پورە مارویم و پێم وت، کە دەمەوێ بچم بۆ قوتابخانە. دەمەوێت فێری خوێندن، نووسین و قسەکردنی زمانی ئینگلیزی بم.

هەرچەند لە لەندەن دەژیام، بەلاّم لە ماڵەوە بە سۆماڵی قسەمان دەکرد و هیچ پەیوەندییەکم نەبوو بە جیهانی دەرەوەی خێزانەکە، لەبەرئەوە تەنیا چەند وشەیەکی ئینگلیزم دەزانی. پورم وتی، 'باشە، ڕیگام بدە با بیری لێکەمەوە.' بەلاّم کە باسی کردبوو لەگەڵ خاڵمدا، ئەو وتبوو نا. گوشارم بۆ پورم هێنا، بەلاّم ئەو نەی دەویست دژی خاڵم بووەستێتەوە. لەکۆتاییدا بڕیارم دا بێ مۆڵەتی ئەوان بچم. قوتابخانە سێ شەو بوو لە هەفتەیەکدا، لە کاتژمێری نۆوە بۆ یانزە. خاڵە عەبدولاّ ڕازی بوو، بۆ یەکەم جار بم بات و پیشانم بدات چۆن بچم بۆ قوتابخانە. لەو کاتەدا تەمەنم پانزە ساڵ بوو، یەکەم جارم بوو پۆل بە خۆمەوە ببینم. پۆلەکە پڕی بوو لە خەڵکی تەمەنی جۆراوجۆر، لەسەرتاسەری جیهانەوە. لەپاش یەکەم شەوەوە، پیاوێکی پیری ئیتالیایی منی دەبرد، پاش ئەوەی خۆم لە ماڵەوە دەدزییەوە و دوای تەواو بوونی قوتابخانە منی دەهێنایەوە. بۆ فێربوون ئەوەندە بە شوروشەوق بووم،

کە مامۆستاکەم پێی وتم، 'واریس تۆ زۆر باشی، بەڵام تۆزێک ئارام بەرەوە.' فێری ئەلف و بێ بووبووم، سەرەتای بناغەی ئینگلیزی، کە خاڵم پێیزانی، شەو بە دزییەوە دەچمە دەرەوە. شێت بوو کە بێگوێیی ئەوم کردوە و کۆتایی بە خوێندنەکەم هێنا. پاش ئەوەی تەنیا دوو هەفتە درێژەی کێشابوو.

•

لەگەڵ ئەوەی ئیتر مۆڵەتی قوتابخانەیان پێنەدام،بەڵام کتێبەکانی پورزاکەمم قەرز دەکرد و هەوڵم دەدا خۆم فێری خوێندن بکەم. ڕێگام پێنەدەدرا لەگەڵ خێزانەکە تەماشای تەلەفیزیۆن بکەم، بەڵام هەندێک جار لەلای دەرگاکەوە خۆم دەخلافاند و گوێم بۆ زمانی ئینگلیزی ڕادەگرت، هەوڵم دەدا گوێی خۆم ڕابهێنم بۆ زمانەکە. هەموو شتێک ئاسایی دەچووە پێشەوە تا ڕۆژێک پورە مارویم بانگی کردم، کاتێک خەریکی پاککردنەوە بووم. 'واریس، وەرە خواردوە، کاتێک پێپلیکەکانت تەواو کرد، شتێک هەیە پێت دەڵێم.' خەریکی چاککردنی جێگاکان بوو، کاتێک کە هەموویم تەواو کرد چوومە خوارەوە بۆ ژووری دانیشتن، کە پورم لەلای ئاگردانەکەوە ڕاوەستابوو.

'بەڵێ؟'

'ئیمرۆ تەلەفونێکم بۆهات لە ماڵەوە. ئێ.... برا بچوکەکەت ناوی چییە؟'

'عەلی؟'

'نا، هەرە بچوکەکەیان، ئەو بچوکەیان کە سەری ماشوبرنجە.'

'پیرە پیاو؟ مەبەستت پیرە پیاوە؟'

'بەڵێ. پیرە پیاو و خوشکە گەورەکەت، ئامان. زۆر بەداخم. هەر دووکیان مردون.' ئەم دەتوانی ئەوەی دەیبیستم، باوەڕ بکەم. چاوم لە دەموچاوی پورم بڕی، بیرم دەکردەوە، دەبێت گاڵتە بکات - یان لەوانەیە تووڕە بووبێت لە شتێکی من و بە وتنی چیرۆکێکی وەها جەرگبڕ، هەوڵ بدات سزام بدات. بەڵام بەیانی هیچ هێمایەک

لەمانەی لە دەموچاویدا نەبوو. دەبێت بە ڕاستی بێت، ئەگینا بۆچی ئەمە دەڵێت؟ بەڵام چۆن ئەمە ڕاست بێت؟ لە شوێنی خۆم سڕبووم و نەم دەتوانی بجوڵێم، تا هەستم کرد قاچم لە ژێرمدا لوول بوو و بۆ خولەکێك لەسەر مۆبیلە بەرگ سپییەکە دانیشتم. هەتا بە بیرمدا نەدەهات پرسیار بکەم چۆن ڕوویداوە. لەوانەیە پورم قسەی کردبێت، ئەم ڕووداوە دڵتەزێنەی بۆ ڕۆشن کردبێتمەوە، بەڵام هەمووی ئەوەی دەم بیست خرەخڕ بوو. ڕەق وەك مردوو بەسەر دنیاوە، چوومە ژوورەکەم لە نهۆمی چوارەم.

باقی ئەو ڕۆژە بە خوڕپەوە لە ناو جێگادا کەوتم لە ژوورە بچوکەکەی هەورەبان، کە من و پورزا بچوکەکەمی تیادا بووین. پیرە پیاو و ئامان هەردوکیان مردوون! ئەمە چۆن دەبێت؟ ماڵەوەم جێهێشت، ئەو هەلەم لەدەست چوو کە لەگەڵ برا و خوشکەکەم بم و ئێستا نیتر بۆ هەتا هەتایە هیچ کامیان نابینمەوە. ئامان کە هەمیشە بەهێزترینمان بوو، پیرە پیاو کە هەمیشە ژیرترینمان بوو. وا دەردەکەوت سەخت بێت مردبن - وە ئەگەر مردبن، بە واتای چی دێت بۆ باقی خێزانەکە - بۆ نیمەیەك بە تواناییەکی کەمترەوە.

ئەو ئێوارەیە بڕیارم دا نیتر لەوە زیاتر ئازاری خۆم نەدەم. لەو بەیانییەوەی کە لە دەست باوکم هەڵهاتبووم، هەرچی شتێکی باش کە ئاواتم پێدەخواست نەهاتبووە ڕێم. ئێستا پاش دوو ساڵ ، زۆر بە خراپی نزیکایەتی خێزانەکەمم لەدەست دابوو، وە زانینی ئەوەی کە دووانیان بۆ هەتا هەتایە ڕۆیشتن، شتێك بوو نەم دەتوانی بەرگەی بگرم. بە پێپلیکەکاندا هاتمەخوارەوە بۆ چێشتخانەکە، چەکمەجەکەم کردەوە و چەقۆیەکی گەورەم هەڵگرت. بە چەقۆکەوە چوومەوە ژوورەکەی خۆم لە سەرەوە. بەڵام کاتێك کە لە جێگادا پاڵکەوتبووم و هەوڵم دەدا غیرەت بدەمە خۆم و خۆم بکوژم، بەردەوام بیرم لە دایکم دەکردەوە. دایکە داماوەکەم، هەر لەم هەفتەیەدا دووانی لە دەستداوە، دەبێت بە سێ. زوڵمێکی تەواو زۆر دەبێت بۆی، لەبەرئەوە

چەقۆکەم لەسەر مێزی تەنیشت جێگاکەم دانا و چاوم لە بنمیچەکە بڕی. چەقۆکەم لە بیرچووبووەوە کە باسمەی ئامۆزام هاتبووە ژوورەوە بۆ دڵنیابوون لە من. بە پەشۆکاوییەوە تەماشای کرد. ' ئەوە چییە لەوێدا! چی دەکەیت بەو چەقۆیە؟' نەمویست وەڵامی بدەمەوە، دیسانەوە چاوم لە بنمیچەکە بڕییەوە. باسمە چەقۆکەی برد و ڕۆیشت.

پاش چەند ڕۆژێك پورم دیسان هاواری لێکردم، 'واریس! وەرە خوارەوە.' لەوێ پاڵکەوتبووم، وا خۆم نیشان دەدا کە گوێم لێ نییە. 'واریس! وەرە خوارەوە!' هاتمە خوارەوە و بینیم، ڕاوەستاوە و چاوەڕوانمە. 'خێراکە! تەلەفون!' ئەمە جێگای سەرسامیم بوو، هەرگیز تەلەفون بۆ من نەکراوە. لە ڕاستیدا، هەرگیز لە تەلەفوندا قسەم نەکردووە.

'بۆ من؟'

'بەڵێ، بەڵێ.' هێمای بۆ تەلەفونەکە کرد لەسەر مێزەکە. 'ئەمەتا، هەڵیگرە - تەلەفونەکە هەڵگرە!'

دەستم دایە، تەماشای ئەم ئامێرە نامۆیەم کرد وەك ئەوەی بییەوێ گازم لێبگرێت. بەدووری پێیەك لە دەممەوە، چرپەیەکم کرد، بەڵێ؟'

پورە مارویم چاوی چووە پشتی سەری. 'قسەبکە! قسەبکە - بۆ تەلەفونەکە قسەبکە!' تەلەفونەکەی هەڵگێڕایەوە و نای بە گوێمەوە.

'هەلاو؟' پاشان گوێم لە دەنگێکی سەرنجڕاکیش بوو: دەنگی دایکم بوو. 'دایە! دایە! ئەوە بەڕاستی تۆیت؟' زەردەخەنەیەك کەوتە سەر دەموچاوم، لەو چەند ڕۆژەدا ئەوە یەکەم جار بوو. 'دایە، باشی؟'

'نا، لەژێر داردا ژیانم بردەسەر.' پێی وتم کە لەپاش مردنی ئامان و پیرە پیاو، شێت بووە. کاتێك کە گوێم لە بەسەرهاتی دایکم بووم، مەمنون بووم بەوەی کە دەستم لە بیرۆکەی زیادکردنی پەژارەی هێنابوو بە لەناوبردنی خۆم. دایکم دابوویە

ئەو بیابانە، نەیویستبوو لەگەڵ کەسدا بێت، کەس ببینێت و قسە بۆ کەس بکات. پاشان ئیتر بە تەنیا چووبوو بۆ مەقادیشۆ بۆ سەردانی کەسوکاری. هێشتا لەگەڵیاندا بوو، لە ماڵی پورە ساهرەوەوە تەلەفونی دەکرد.

دایکم هەوڵیدا ڕووداوەکەم بۆ باس بکات، بەڵام هێشتا هیچ شتێك ڕۆشن نەبوو. پیرە پیاو نەخۆش کەوتووە. کە ئەمە نموونەیەکی ئاسایی ژیانی کۆچەریمان بوو لە ئەفریقادا، نە خزمەتگوزاریی دەرمانی هەبوو، نە کەس دەیزانی نەخۆشییەکە چییە، نە کەس هیچی لەدەستدەهات. لەو کۆمەڵگایەدا تەنیا دوو ڕێگا هەبوو: ژیان کردن یا مردن. هیچ شتێك لە نێوانیاندا نەبوو. تا کەسەکە لە ژیاندا بوو، هەموو شتێك لە جێگای خۆیدا بوو. زۆر گوێمان نەدەدا بە نەخۆشی، چونکو بەبێ پزیشك و دەرمان، هیچ شتێکمان لە دەستنەدەهات بیکەین. کاتێك کە کەسێك دەمرد، ئەوەش شتێکی ئاسایی بوو، چونکو ئەوانەی لە ژیاندا مابوون بەردەوام دەبوون. ژیان درێژەی هەبوو. هەردەم فەلسەفەی ئینشائەڵا بڕیاردەری ژیانمان بوو: 'ئەگەر خوا بییەوێت.' ئینسان ژیانی وەك دیارییەك قبولکردووە و مردنیش وەك بڕیارێکی بێ ئەم لاو ئەو لای خوا.

کاتێك پیرە پیاو نەخۆش دەکەوێت، دایك و باوکم زۆر دەترسن، چونکو منداڵێکی تایبەت بوو. دایکم - هیچ شتێکی تری لە دەست نایەت - پەیامێك بۆ ئامان دەنێرێت لە مەقادیشۆ، داوای یارمەتی لێدەکات. ئامان کە هەمیشە بەهێزترینمان بووە، دەیزانی چی بکات. لە مەقادیشۆوە بە پێ دەکەوێتە ڕێ بۆئەوەی پیرە پیاو بگەیەنەتە لای پزیشك. ئیتر ئەوەی خێزانەکەمان لە کوێ دەواریان هەڵداوە و چەند دووربوون لە مەقادیشۆوە، بۆم ڕۆشن نەبووەوە. بەڵام کە دایکم داوای یارمەتی کردووە، ئاگاداری ئەوە نەبووە، ئامان سکی هەشت مانگە. کاتێك خوشکەکەم پیرە پیاو دەبات بۆ نەخۆشخانە، بە باوەشییەوە دەمرێت. ئامان تووشی شۆك دەبێت، لەپاش چەند ڕۆژی تر بە منداڵەکەیەوە گیانی دەردەچێت. هەرگیز بۆم ڕۆشن

نەبووەوە، کەی و لە کوێ مردون، بەڵام دایکم، کە هەمیشە کەسێکی مەنگی بەهێز بوو، کە ئەمەی زانیبوو، یەکسەر دارمابوو. وە چونکو دایکم کەسێك بوو شیرازەی خێزانەکەی ڕاگرتبوو، بۆم پرسیار بوو کە ژیان چۆن دەبێت بۆ باقییەکەمان، کاتێك بیرم لەمە دەکردەوە پەکم دەکەوت. زیاتر لە جاران، هەستم بە پەرێشانییەکی زیاتر دەکرد، کە گیرم کردووە لە لەندەن و دەستم بە دایکم ناگات کە زۆر پێویستی بە یارمەتی منە.

هەرچی بوو بوو، ژیان بۆ ئێمە لە جوڵە نەکەوت و هەوڵمدا ئەو پەڕی لەزەت لە لەندەن ببینم. دەستم کردەوە بە کاری ناومالّ و کەوتمە گاڵتە کردن لەگەڵ پورزا و هاوڕێکانیان کە دەهاتن بۆ سەردانمان.

شەوێکیان داوام لە باسمە کرد، یارمەتیم بدات بۆ یەکەمین جاری پیشەی جلوبەرگ پیشاندان. لەوەتەی هاتبوومە لەندەن حەزم بۆ جلوبەرگ لە گەشەکردندا بوو بەڵام مەبەستم نەبوو بەدەستیان بهێنم، وەك شتێك حەزم دەکرد تاقیان بکەمەوە. حەزم لە یاری بوو: پێم خۆش بوو، خۆم وا پیشان بدەم کە یەکێکی ترم. کاتێك خێزانەکە بەدیار تەلەفزیونەوە دانیشتبوون، چوومە ژوورەکەی خالّە محەمەد و دەرگاکەم لە سەرخۆم داخست. دەرگای کەنتۆری جلەکانیم کردەوە و باشترین قاتیم دەرهێنا، کە یەکێکی خوری شینی خەت خەت بوو. لەسەر قەردوێڵەکەی دامنا لەگەڵ کراسێکی سپی، بۆینباخێکی ئاوریشمی، جوتێ گۆرەوی ڕەش، جوتێ پێڵاوی ڕەشی ئینگلیزی و شەپقەیەکی لبادی. هەموویانم لەبەرکرد و هەوڵمدا بۆینباخەکە ببەستم بەو شێوەیەی کە لە خالّم دیبووم. پاشان شەپقەکەم کردە سەرم و هێنامە خواردوە. کاتێك تەواو خۆم پۆشی چووم بۆ لای باسمە. باسمە دایە قاقای پێکەنین.

"بچۆ بە باوکت بڵێ، پیاوێك هاتووە دەیەوێت بتبینێ."

'ئەوانە جلەکانی ئەوە؟ نۆی، دەیکات بە هەرا لێت -'

لە دەرەوەی ڕاڕەوی هۆڵەکە وەستام و گوێم بۆ پورزاکەم ڕاگرت، چاوەڕوانی هەلێکی دروست بووم، خۆم بکەم بە ژووردا. 'باوکە،' گوێم لە باسمە بوو دەیوت، 'پیاوێك هاتووە دەیەوێت بتبینێ.'

'پیاوێك لەم کاتەدا، لە شەودا؟' خاڵە محەمەد بە دەنگێدا لەوە نەدەچوو خۆشحاڵ بێت. 'کێیە؟ چی دەوێت؟ لەوەوپێش هەرگیز بینیوتە؟'

باسمە دەنگی تێکەڵ و پێکەڵ بوو، 'من، نۆی، نازانم، لەو باوەڕەدام، ئا، لەو باوەڕەدام تۆ دەی ناسی.'

'باشە، پێی بڵێ....'

'بۆچی خۆت نایبینی،' باسمە بە خێرایی وتی. 'هەر لەودیو دەرگاکەوەیە.'

'باشە،' خاڵم هیلاك و ماندوو ڕازی بوو. ئیتر ئەوە نیشانەیەك بوو بۆ من. شەپقەکەم هێنایە سەر چاوم کە بە ئاستەم بەرپێی خۆمم دەبینی، دەستم خستە گیرفانمەوە و بە فیزەوە خۆم کرد بە ژووردا.

'ئەی، تۆ منت بیرنایەت؟' بە دەنگێکی ئینگلیزییانەوە وتم. خاڵم چاوی زەقکردەوە و خۆی دانەواند بۆئەوەی لەژێر شەپقەکەوە بمبینێ. کاتێك زانی کێم، دایە قاقای پێکەنین. پورم و باقی خێزانەکە لە خۆشیدا هاواریان لێهەڵسا.

خاڵە محەمەد پەنجەی لێ بەرزکردمەوە.

'ئینجا ئێستا، ئایا من مۆڵەتم بە تۆ داوە بۆ.....'

'خاڵە تەنها من تاقیم کردنەوە. لەو باوەڕەدا نیت پێکەنیناوییە؟'

'بەرەوەلا.'

ئەمەم بۆ چەند جاری تر دووبارە کردەوە، تا ئیتر خاڵم لە توانایدا نەما. پاشان پێی وتم، 'واریس، ئێستا ئیتر بەسە. لەوە زیاتر جلوبەرگی من تاقی مەکەرەوە، باشە؟ دەستیان بۆ مەبە.' ئیتر منیش دەمزانی بە ڕاستێتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا

لەو باوەڕەدا بوو کە پێکەنیناوییە. پاشان بیستم کە پێکەنیوە و بە هاوڕێکانی وتووە. 'ئەم کچە دەچێتە ژوورەکەم و جلەکانم لەبەردەکات. پاشان باسمە دێت و دەڵێت، "باوکە، پیاوێك هاتووە و دەیەوێت بتبینێت." پاشان دێتە ژوورەوە، سەرتاپای جلوبەرگی منی لەبەردایە. دەیبینن....'

پورم باسی کرد کە هاوڕێکانی پێشنیاری ئەوەیان کردووە، کە هەوڵبدەم کاری مانیکان بەدەستبهێنم. بەڵام وەڵامی پورم ئەوە بووە، 'ئێمە ئەم جۆرە کارە ناکەین. دەزانیت کە ئێمە لە سۆماڵەوە هاتوین و موسڵمانین.' بەڵام هەرچی چۆنێك بوو لەوە نەدەچوو پورم هەرگیز ناڕازی بووبێت بەوەی کە ئیمان، کچە گەورەکەی هاورێکەی، پیشەی مانیکان بکات. پورم دایکی ئیمانی لەمێژەوە دەناسی و هەرکامێکیان بهاتنایە بۆ لەندەن، زۆری لێدەکردن کە لە ماڵی ئێمە بمێننەوە. بۆ یەکەم جار، لە ڕێگای قسەوباسی ئیمانەوە ئاشنا بووم بە بیرۆکەی مانیکان. چەند وێنەیەکم لە گۆڤارەکانی پورزاکەم بڕیبوو و هەڵم واسیبوون بە دیواری ژوورە بچوکەکەمەوە. وەڵامی من ئەوە بوو، ئەگەر ئەو ژنێکی سۆماڵی بێت و بتوانێت ئەو کارە بکات، ئەی بۆچی من ناتوانم بیکەم؟

کاتێك کە ئیمان دەهات بۆ ماڵی ئێمە، هەردەم بەدوای هەلێکەوە بووم کە قسەی لەگەڵدا بکەم. دەمویست پرسیاری لێبکەم، 'چۆن ببم بە مانیکان؟' هەر ئەم دەزانی ئەو جۆرە شتانە هەیە، گومانی تیادا نەبوو، لە خەیاڵی ئەوەدا نەبووم کارێکی وا بکەم. بەڵام هەرکات سەردانی بکردینایە، ئەو شەوەی بە قسەکردن لەگەڵ گەورەکاندا دەبردەسەر. لەوەش ئاگادار بووم کە پورم و خاڵم هەرگیز ڕازی نابن، قسەوباسیان پێ ببڕم بۆ شتێکی وا بێلەزەتی وەك شوروشەوقی من بۆ مانیکان. لە کۆتاییدا شەوێکیان هەلێکم بۆ هەڵکەوت. ئیمان لە ژوورەکەی خۆی دەیخوێندەوە، چووم لە دەرگاکەیم دا. 'شتێکت بۆ بهێنم پێشئەوەی بچیتە ناو جێگاوە؟'

'بەڵێ، حەزم لە کوپێك چای حێلاوییە.' چوومە خوارەوە بۆ چێشتخانە و بە سینییەکەوە گەڕامەوە. لەسەر مێزی تەنیشت قەرەوێڵەکەی دامنا و دەستم بە قسەکردن کرد. 'دەزانیت، لە ژوورەکەمدا چەند وێنەی تۆم هەیە.' چرکە چرکی کاتژمێری سەر مێزەکە هاتە گوێم، خۆمم وا دەهاتە بەرچاو کە زۆر گەلحۆم. 'لە ڕاستیدا منیش حەز دەکەم کاری مانیکان بکەم. لەو باوەڕەدای قورسە... تۆ چۆنی دەکەیت... هەرچی چۆنێك بێت، چۆن دەستت پێکرد؟'

نەم دەزانی چاوەڕوانی چ قسەیەکی لێبکەم ، ئاواتەخواز بووم، ئەگەر بیتوانیایە، دارێکی جادوویيم پیابکێشێت و بمکات بە سێندریلا. بەڵام ئاواتی بوون بە مانیکان تەنیا خەیاڵ بوو، تەواوی بیرۆکەکە لەوە دەچوو زۆر دووردەست بێت، لەبەرنەوە کاتێکی زۆرم پێوە نەکوشت بیری لێکەمەوە. لەجیاتی ئەوە، پاش ئەو شەوە، بەردەوام بووم لەسەر کاری ڕۆژانەی خۆم، جەختم کردە سەر ئامادەکردنی ڕۆژ بە ڕۆژی نانی بەیانیان، نیوەڕوان، قاپشتن و گسکدان.

لەو کاتەدا تەمەنم نزیك شانزە ساڵ بوو و دوو ساڵ بوو لە لەندەن دەژیام. لە ڕاستیدا بە هەلومەرجەکە نەوەندە ڕاهاتبووم کە ئاگاداری ڕۆژمێری ڕۆژئاوایی ببم و بزانم چ ساڵێکە: 1983.

هاوینی ئەو ساڵە، خوشکەکەی خاڵە محەممەد لە ئاڵمانیا مرد، کچێکی لەپاش خۆی جێهێشت. کچەکە کە ناوی سۆفیا بوو، هات بۆ ماڵی ئیمە و خاڵم لە قوتابخانەی ئۆل سولس چێرچ* ناونووسی کرد. کاری ڕۆتینی بەیانیانم، بردنی سۆفیا بۆ قوتابخانەشی چووەسەر، کە دەکەوتە چەند بلۆك خانووی نەولای ماڵەکەمانەوە.

لە یەکێك لە بەیانییەکانی سەرەتادا بوو، کاتێك من و سۆفیا دەچووین بۆ قوتابخانەی کۆنی خشتی، پیاوێکی نامۆم بینی تەماشای دەکردم. پیاوێکی سپی پێستی تەمەن نزیك چل ساڵ بوو، قژی لەدواوە کردبوو بە پرچ. وە لەڕاستیدا هیچ شەرمێکی نەبوو لەوەی کە بە ئاشکرا تەماشام بکات، بەڵکو زۆر بێڕوش بوو. کە

سـۆفیام لەبـەردەم دەرگاکـە جێهێـشت، پیاوەکـە بـۆ لام هـات و لەگەڵمـدا کەوتـە قسەکردن. بەڵام ئاشکرا بوو مـن لـە ئینگلیـزی تێنەدەگەیـشتم، لەبەرئـەوە نـەمزانی چی وت. ترسام، رووم وەرگێڕا و بەرەو ماڵەوە ڕام کرد. ئەمـە هـەروا بـەردەوام بـوو: سۆفیام دادەنا، پیاوەکە چاوەڕوانی دەکرد، هەوڵی دەدا قسەم لەگەڵدا بکات و منـیش ڕام دەکرد.

پاش نیوەڕوان، کاتێك دەچووم سۆفیام دەهێنایەوە، بەدەم ڕێگاوە زۆر جـار سـۆفیا باسی هاوڕێیەکی تازەی خۆی دەکرد، کە کچێکی بچوك بـوو لـە پۆلەکەیانـدا. منـیش بەبێ ئەوەی جێگای سەرنجم بێت دەم وت، 'ئەها، باشـە.' ڕۆژێکیـان تۆزێـك درەنـگ کـەوتم بـۆ هێنانـەوەی سـۆفیا. کـە گەیـشتم، لـە دەرەوەی قوتابخانـە، لەگـەڵ کـچێکی بچکۆلەدا یـاری دەکـرد. 'ئـەوەتا، واریـس ئەمـە هاوڕێکەمـە،' سـۆفیا بـە شـانازییەوە وتی. لەبەرامبەر ئەم دوو کچەدا پیاوە پرچدارەکە وەستابوو، کە بۆ ماوەی نزیك بـە ساڵێك دەچوو ڕێگەی پێدەگرتم.

'باشە، با بـڕۆین،' بـە تورەییەکـەوە وتم، هاوکـات لـە ژێـرەوە تەماشـای پیاوەکـەم دەکرد. بەڵام ئەو ڕووی لە سۆفیا کـرد، کـە ئینگلیـزی، ئاڵمـانی و سـۆماڵی دەزانـی، و شتێکی پێوت. 'خێراکە سۆفیا. لەو پیاوە دوورکەوەرەوە،' ئاگادارم کردەوە و دەستیم گرت.

سۆفیا بە خۆشییەوە ڕووی لە من کـرد و وتـی، 'دەیـەوێت بزانێـت، تـۆ ئینگلیـزی دەزانیت.' ڕوو بە پیاوەکە سۆفیا سەری بادا. شـتێکی تـری بـە سـۆفیا وت و ئـەویش وەریگێڕا بۆ من، 'دەیەوێت شتێکت لێبپرسێت.'

'پێـی بڵـێ مـن بـۆ ئـەو قـسە ناکـەم،' لووتبەرزانـە وتم و ڕووم وەرگێـڕا. 'تـەنیا دەتوانێت ڕێگای خۆی بگرێت. تەنیا دەتوانێت....' بڕیارم دا قـسەکەم تـەواو نەکـەم، چونکو کچەکەی گوێی دەگـرت و سـۆفیاش یەکـسەر وەری دەگێـڕا. 'لـە بـیری خـۆتی بەرەوە، با بڕۆین،' دەستیم گرت و لەگەڵ خۆمدا کێشم کرد.

پاش ماوەیەكی كورت لەم ڕووبەڕوو بوونەوەیە، بەیانییەكیان ئاسایی سۆفیام دانا. پاشان كە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و چوومە نهۆمەكانی سەرەوە بۆ پاككردنەوە، زەنگی دەرگا لێدرا. لە هاتنە خوارەوەدا بووم، پورە مارویم فریا كەوت دەرگای كردەوە. لە محاجەرەی پێپلیكانەكانەوە تەماشام كرد، باوەڕم بە چاوی خۆم نەدەكرد، كابرای پرچ بەسەر بوو. دەبوو دوای من كەوتبێت بۆ ماڵەوە. یەكسەر بۆ ئەوە چووم، كە چەند قسەیەكم بۆ هەڵدەبەستێت و بە پورم دەڵێت - پێی دەڵێت، كە من كارێكی هەڵەم كردووە. شتێكی درۆ، وەك ئەوەی دەستبازیم لەگەڵدا كردووە، لەگەڵیدا چوومەتە جێگاوە یان منی بینیوە، دزیم كردووە. پورم بە ئینگلیزییە ڕەوانەكەی وتی، 'تۆ كێی؟'

'ناوم مالكۆلم فیەچایلد. داوای لێبوردن دەكەم كە بێزارت دەكەم - بەڵام ئایا دەتوانم قسەت لەگەڵدا بكەم؟'

'دەتەوێت لەبارەی چییەوە لەگەڵ مندا قسە بكەیت؟' پەشۆكاوییەكی زۆر بە پورمەوە دیاربوو.

كە گەڕامەوە سەرێ، هەناوم لەبەر بڕابوو، بۆم پرسیار بوو كە چی دەڵێت، بەڵام دوو چركەی نەبرد، گوێم لێبوو دەرگاكە بە یەكدا داخرایەوە. ڕامكرد بۆ ژووری دانیشتن كاتێك كە پورم بەرەو چێشتخانەكە گەڕایەوە.

'پورێ، ئەوە كێ بوو؟'

'نازانم - پیاوێك بوو دوای تۆ كەوتبوو، دەیویست قسە لەگەڵ تۆدا بكات، هەروا دەیویست وێنەی تۆ بگرێت.' پورێ بە مۆنییەكەوە تەماشای دەكردم.

'پورێ، من داوام لێنەكردووە ئەوە بكات. من هیچ شتێكم پێنەوتووە.'

'من ئەوە دەزانم! هەر لەبەرئەوەش هاتبوو بۆ ئێرە!' جێی هێشتم و وتی. 'بڕۆ خەریكی كاری خۆت بە - گوێی مەدەرێ. من دەچمە سەروكاری.' بەڵام پورم ئەوەی ڕەتكردەوە، ڕوونی بكاتەوە قسەوباسەكە چی بووە و هەروەها ئەوەی كە زۆر تووڕە و

نیگەران دیاربوو، وای لێکردم بکەومە ئەو باوەڕەوەی، کە ئەو کابرایە دەیەوێت، جۆرێك لە وێنەی سێکسی لە من بگرێت. زۆر ترسارم و هەرگیز لەو بەیانییەوە خۆم لە قەرەی ئەوە نەدا چی ڕوویداوە.

پاش ئەوە، هەر کات ئەو کابرایەم لە ڕێگای قوتابخانە ببینیایە، قسەی لەگەڵدا نەدەکردم. ئاسایی بەڕێزانە زەردەخەنەیەك دەیگرت و ڕێگای خۆی دەگرت. تا ڕۆژێکیان کاتێك چووم بە شوێن سۆفیادا، لەپڕ لێم هاتەپێشەوە و کارتێکی دایە دەستم. چاوم لێ غافڵ نەکرد، کارتەکەم لێوەرگرت و خستمە گیرفانمەوە. بە وردییەوە سەرنجم دا، کە گەڕایەوە و ڕێگای خۆی گرت، پاشان بە سۆماڵی کەوتمە جنێودانی. "پیس، بەرازی حیز، لێم دوورکەوەرەوە!"

کە گەیشتمە ماڵەوە، ڕام کردە سەرەوە، هەموو منداڵەکان خەوتبوون، ئەم نهۆمەی سەرەوە پەناگای ئێمە بوو لەدەست گەورەکان. چووم بۆ لای پورزاکەم لە ژوورەکەی و ئاسایی کتێب خوێندنەوەکەیم پچڕی. "باسمە، تەماشای ئەمە بکە،" کارتەکەم لە گیرفانم دەرهێنا و دامە دەستی. "ئەمە هینی ئەو پیاوەیە، بیرت دێت ئەو پیاوەی لەبارەیەوە دوام، کە زوو زوو هەراسانم دەکات، هەتا جارێکیان دوام کەوتبوو؟ ئیمڕۆ ئەم کارتەی دامێ. چی تیادا نووسراوە؟"

"نووسراوە کە وێنەگرە."

"چ جۆرە وێنەیەك؟"

"وێنە دەگرێ."

"باشە، بەڵام چ جۆرە وێنەیەك؟"

"دەڵێت، "وێنەی جلوبەرگ""

"وێنەی جلوبەرگ،" وشەکانم بە هێواشی دووبارە کردەوە. "مەبەستتە کە وێنەی جلوبەرگ دەگرێت؟ دەیەوێت وێنەی من بگرێت بە جلوبەرگەوە؟"

'نازانم، واریس' بە هەناسە هەڵکێشانەوە وتی. 'لە ڕاستیدا نازانم.' دەمزانی هەراسانم کردووە، دمیەوێت بگەڕێتەوە سەر کتێب خوێندنەوەکەی خۆی. لەسەر جێگاکەی هەڵسام، کارتەکەم هەڵگرت و بەجێم هێشت. بەڵام کارتی کابرای وێنەگری جلوبەرگم لە ژوورەکەمدا هەڵگرت. دڵم خەبەری دامێ کە هەڵیگرم.

باسمەی پورزام تەنیا ئامۆژگاری من بوو، هەردەم دەستی یارمەتی بۆ من ئاواڵەبوو، بە تایبەتی جارێکیان کە چووم بۆ لای بۆ ڕێنوێنی لەسەر حاجی برای، وە لەم پەیوەندەدا زۆر مەمنونی بووم.

حاجی تەمەنی بیست و چوار ساڵ بوو، دووەم کوڕی گەورەی خاڵم بوو. زۆر بە زیرەك چاویان لێدەکرد، ئەویش وەك خاڵە عەبدوڵا، لە زانکۆی لەندەن دەیخوێند. لەو ڕۆژەوەی گەیشتبوومە لەندەن، هەردەم دۆستانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردم. کاتێك نهۆمەکانی سەرەوەم پاکدەکردەوە، پێی دەوتم، 'ئەرێ واریس، لە پاککردنەوەی حەمامەکە بوویتەوە؟'

'نا' وەڵامم دەدایەوە، 'بەڵام ئەگەر پێویستت پێیەتی، بڕۆ من لە دوای تۆ پاکی دەکەمەوە.'

'دەی، نا.... تەنیا دەم ویست بزانم، پێویستیت بە یارمەتی نییە.' یان دەی وت، 'دەچم شتێك دەهێنم بۆ خواردنەوە، حەزت لە شتێك هەیە؟' هەمیشە خۆشحاڵ بووم بەوەی کە پورزاکەم چاوێکی لە منەوەیە. جاروبار پێکەوە قسە و شۆخیمان دەکرد.

هەندێك جار، کە لە حەمامەکە دەهاتمە دەرەوە، حاجی ڕێك لەبەردەمی دەرگاکەدا ڕادەوەستا و ڕێگای نەدەدا دەرچم. کە هەوڵم دەدا خۆم لادەم، لەگەڵمدا دەجوڵا. کاتێك پاڵم پێوە دەنا و هاوارم لێدەکرد، 'لاچۆ لەبەر لووتمدا، تەمەڵی تەوەزەل،' دەیدایە قاقای پێکەنین. ئەم وردە یاریانە بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەوەی هەوڵم دەدا، وەك گاڵتە و گەپێکی کەرانە وەریگرم، بەڵام جێگای نیگەرانیم بوو.

شتێك لە ژێر ئەم هەڵسوكەوتەدا هەبوو، كە تورەی دەكردم. بە چاوێكی نامۆ، خەواڵودوە تەماشای دەكردم یان زۆر لێم نزیك دەبوووەوە. كاتێك ئەو هەستە نامۆیەم كرد، هەوڵم دا بەری پێبگرم و بە خۆمدا بێمەوە، *نا، واریس وا نا، حاجی ودك برات وایە. ئەم خەیاڵە قۆرانە چیە.*

تا ڕۆژێكیان، سەتڵ و پەڕۆی سرینم بە دەستەوە بوو، كە دەرگای حەمامەكەم كردەوە لەوێدا ڕاوەستابوو. قۆڵی گرتم و خۆی پێوە نووساندم، دەموچاومان موویەكی بەین بوو. "نیازت چییە؟" لە تورەیدا دەستم كرد بە پێكەنین.

"ئۆی - نا، هیچ نییە." یەكسەر دەستی لێبەردام. دەستم دایە سەتڵەكە و چووم بۆ ژوورێكی تر. زۆر ئاسایی ودك ئەوەی هیچ شتێك ڕووی نەدابێت. بەڵام مێشكم كەوتە خۆی و لەو ساتەوە ئیتر هیچ دوودڵییەكم نەما، كە شتێك لە ئارادایە. تێگەیشتم كە لەم نێوەدا شتێك ناجۆرە.

شەوی دوایی لە ژووری نووستنی خۆم بووم لەگەڵ شوكری پورزام، خوشكە بچكۆلەكەی باسمە، ئەو لە جێگای خۆی خەوتبوو. من كە خەوم زۆر سوكە، نزیك كاتژمێری سێی شەو بوو، گوێم لە یەكێك بوو، بە پێپلیكانەكاندا دەهاتە سەرەوە، زانیم دەبێت حاجی بێت، چونكو ڕاڕەوی ژوورەكەی بەلای ئێمەدا دەڕۆیشت. ئێستا گەڕابوووەوەماڵەوە و بە زرموكوتی ڕۆیشتنەكەیدا بە ناو ڕاڕەوەكەدا، دەمتوانی بڵێم سەرخۆش بوو. ئەم جۆرە هەڵسوكەوتە لە ماڵی خاڵمدا ناپەسەند بوو - بێگومان كەس لەم كاتەی شەودا نەدەهاتە ماڵەوە بە سەرخۆشی. موسڵمانێكی تەواو بوون و خواردنەوەی هەر جۆرە كحولێك بە تەواوی قەدەغە بوو. بەڵام دەمزانی حاجی ئەوەندە خۆی بە گەورە دەزانێت، كە لەسەر پێی خۆی بێت و هەوڵی وەها بدات.

دەرگای ژوورەكەم بە هێواشی كرایەوە، هەرچی دەماری لەشم بوو گرژبوو. هەر دوو جێگاكە، بەدووری دوو هەنگاو لە دەرگاكەوە بوون، لە یەك ڕیزدا بە بەرزییەوە. دەمتوانی حاجی ببینم، لە سەر نووكی پێ دەڕۆیشت، بەسەر پەیژەكەدا سەردەكەوت

بۆ جێگاکان، لە هەوڵێشدا بوو پورزا بچوکەکەم خەبەر نەکاتەوە، کە ئەو نزیکتر بوو لە دەرگاکە. بەڵام پێیەکی لە پلەیەك ترازا، کەوت. پاشان خۆی خشاند بۆ لای من. بەهۆی ڕووناکی لە پەنجەرەکەوە لە پشتیەوە، دەمبینی چۆن ملی درێژ کردووە بۆ بینینی دەموچاوم لە تاریکاییەکەدا. 'چۆنی، واریس،' چرپاندی. 'واریس....' بۆنی هەناسەکەی، نیشانەی ڕاستی گومانەکەی من بوو کە خواردبوویەوە. بەڵام من لە تاریکییەکەدا جوڵەم لە خۆم بڕی بوو، وا خۆم پیشان دەدا کە خەوتووم. دەستی هێنا بەسەر سەرینەکەمدا بۆ دۆزینەوەی دەموچاوم. لەبەرخۆمەوە وتم، *ئەی خوایە، داوات لێدەکەم ڕێگا مەدە ئەمە ڕووبدات.* 'ئم م م م،' خۆم خستە سەر شان، هەوڵمدا پرخە لە خۆم بهێنم تا شوکری بەخەبەر بهێنم. لەم کاتەدا ئەقڵی وەبەرخۆی هاتەوە و بە ئەسپایی گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی.

بۆ ڕۆژی دوای چوومە لای باسمە لە ژوورەکەی. 'گوێگرە، پێویستە قسەت لەگەڵدا بکەم.' گرژی لە دەموچاومدا بینی و زانی هاتنی ئەم جارەم ئاسایی بۆ کات کوشتن نییە.

'وەرە ژووری، دەرگاکە داخە.'

'ئەم جارە لەبارەی براکەتەوەیە،' وتم و هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا. نەمدەزانی ئەمەی چۆنی پێبڵێم، ناواتەخواز بووم، بڕوام پێبکات.

'چییە لە بارەیەوە؟' ئێستا ئیتر پەرۆشی لەخۆی پیشان دا.

'دوێنێ شەو هاتبووە ژوورەکەی من. کاتژمێری سێی بەیانی بوو، دنیا تەواو تاریك بوو.'

'چی کرد؟'

'هەوڵی دا دەست بۆ دەموچاوم بەرێت. بە ئەسپایی ناوی منی هێنا.'

'ئۆی، نا، دڵنیای لە خۆت؟ خەوت نەبینیوە؟'

"نا، دەزانم بە چ شێوەیەك تەماشام دەكات، بە چ شێوەیەك تەماشام دەكات كە بە تەنیا دەبم لەگەڵیدا. نازانم چی بكەم."

"نەعلەتی ـ ئەی نەعلەت! تێلایەك بەرە و بیخەرە ژێر جێگاكەتەوە. یان گسكێك. نا تیرۆكێك بەرە لە چێشتخانە. بیخەرە ژێر جێگاكەتەوە و هەر كە بەشەو هاتە ژوورەكەتەوە، لە سەریدا بیشكێنە! ئیتر باقییەكەی دەزانی چی دەكەیت؟" هەروەها وتی. "بقیژێنە. پڕ بە دەنگت بقیژێنە تا هەموو گوێیان لێبێت." خۆشحاڵ بووم، كە ئەم كچە بەڕاستی لایەنگری منە.

تەواوی ئەو ڕۆژە پاڕامەوە، "تكایە وام لێمەكە ئەو كارە خراپە بكەم، تكایە مەیەڵە ئەو كارە بكات." نەمدەویست كێشە بنێمەوە. نیگەرانی ئەوە بووم چ درۆیەكم بۆ هەڵدەبەستێت لەلای دایك و باوكی بۆ پاكانەی خۆی، پاشانیش دایك و باوكی دەرمبكەنە دەرەوە. تەنیا دەمویست ئەو دەستهەڵگرێت ـ ئیتر یاریم لەگەڵدا نەكات، چیتر شەو نیوە شەو سەردانم نەكات، چیتر نەیەتە سەر ڕێگام ـ چونكو هەستێكی زۆر ناخۆشم هەبوو كە سەرئەنجامی ئەمانە دەگەنە كوێ. بەڵام دڵم خەبەری دابوومێ، كە خۆم ئامادەكەم بۆ ئەم شەڕە ئەگەر دوعاكانم گیرا نەبوون.

ئەو شەوە چوومە چێشتخانە، بە دزییەوە تیرۆكێكم هەڵگرت و بردمە ژوورەكەم و لەژێر جێگاكەمدا شاردمەوە. پاشان، كە پورزاكەم نووست، دەرم هێنا و لە تەنیشت خۆمەوە دامنا و هەرگیز دەستم لێبەرنەدا. هەر وەك شەوی ڕابوردوو، هەمان بەزم ڕوویدایەوە، حاجی نزیك سێی بەیانی گەڕایەوە. لەناو دەرگاكەدا هەڵوێستەیەكی كرد. ڕووناكیم لە ڕاڕەوەكەوە دەبینی لەناو عەینەكەكەیدا شەوقی دەدایەوە. لە شوێنی خۆم پاڵكەوتبووم، چاوێكم كردبووەوە و تەماشام دەكرد. بەدزییەوە گەیشتە لای سەرمەوە، دەستی كرد بە دەستهێنان بە قۆڵمدا. بۆگەنی ویسكی لێدەهات كە ئەوەندە ناخۆش بوو، دەمویست دەمی خۆم بگرم، بەڵام من فرزەم لە خۆم بڕیبوو. پاشان كەوتە سەر ئەژنۆ و دەستی برد تا قەراخی خوارەوەی لێفەكەی دۆزییەوە و

بەرزی کردەوە و دەستی برد بۆ لاقم. دەستی هێنا بە ڕانمدا و زیاتر بۆ سەرەوە تا دەرپێکەم.

لە دڵی خۆمدا وتم، *دەبێت عەینەکەکەی بشکێنم تا وەك بەڵگەیەك پیشانی بدەم، کە لە ژوورەکەدا بووە.* قایم دەستم دایە تیرۆکەکە و بەو پەڕی هێزمەوە دام بە دەموچاویدا. یەکسەر ناڵەیەکی قایمی لێ بەرزبۆوە، پاشان هاوارم کرد، 'لەم ژوورە نەعلەتییە بڕۆ دەرەوە، نەعلەتی' —'

شکوری بە گریانەوە لە جێگای خۆی هەستا، 'ئەوە چی ڕوودەدا؟' لە چەند چرکەدا تەپوهۆڕ، هەموو خێزانەکە هاتن.حاجی ئیتر نەیتوانی بەرپێی خۆی ببینێ چونکو عەینەکەکەیم شکاندبوو، بە گاگۆڵکێ بەرەو ژوورەکەی خۆی هەڵهات. بە هەموو جلوبەرگەکانیەوە چووبووە جێگاوە، خۆی وا نیشان دابوو کە خەوتووە.

باسمە هاتە ژوورەوە و گڵۆپەکەی هەڵکرد. بێگومان ئاگای لە هەموو شتێك بوو، بەڵام خۆی وا پیشان دا، کە ئاگای لە هیچ نییە. 'ئەوە چی ڕوودەدا لێرە؟'

شکوری بۆی باسکرد، 'حاجی لێرە بوو، بە گاگۆڵکێ بەناو ژوورەکەدا ڕۆیشت!'

کاتێك پورە مارویم بە ڕۆبی شەوەوە هاتە ژوورێ، دەنگم لێبەرزکردەوە، 'پورێ هاتبووە ژوورێ، هاتبووە ژوورێ، دوێنێش هاتبوو! منیش لێم دا!' هێمام بۆ عەینەکە پارچە پارچەکراوەکەی کرد بەرامبەر بە جێگاکەم.

'ششششش،' بە مۆنییەکەوە وتی. 'نامەوێت ئەمە ببیستم - ئێستا نا. هەرکەس بچێتەوە ژووری خۆی. بۆ ناو جێگای خۆی.'

1. پانکەیك، جۆرێکە لە کێك کە لە تاوەدا دروست دەکرێت، لە جیاتی قاڵب.

All Souls Church School ★

## بەشی دەیەم

## لە کۆتاییدا سەرفەرازی

پاش ئەو شەوەی کە تیرۆکەکەم دا بە دەموچاوی حاجیدا، هیچ کەسێك لە ماڵەکەدا ناماژەی بەم ڕووداوە نەکرد. ئیتر ئەم دیدارە شەوانەیە وەك خەوێکی ناخۆش دەهاتە بەرچاوم، بەڵام لەگەڵ گۆڕانێکی گەورەدا. هەر کاتێك حاجیم ببینیایە، بە شوروشەوقەوە تەماشای نەدەکردم. ئەم نیگایە بوو بە ڕق و کینەیەکی ئاشکرا. وەك ئەوەی دوعام بۆ کردبوو، سوپاسگوزار بووم بەوەی ئەم لاپەڕەیە لە ژیانمدا هەڵدرایەوە و کۆتایی هات. بەڵام لاپەڕەیەکی تازە لە نیگەرانی جێگای گرتەوە.

خاڵە محەمەد ڕایگەیاند، کە لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا خێزانەکە دەگەڕێتەوە بۆ سۆماڵ. دەورەی چوار ساڵ کاری باڵوێزی سۆماڵ کۆتایی هات و دەگەڕێنەوە بۆ وڵات. چوار ساڵ تەمەنێك بوو بۆ من، کە یەکەم جار گەیشتم، بەڵام ئێستا ناتوانم باوەڕ بکەم کە تەواو بووە. بە داخەوە گەڕانەوەم بۆ سۆماڵ مایەی خۆشحاڵیم نەبوو. دەمویست بە سامان و دەستکەوتەوە بگەڕێمەوە ماڵەوە، وەك ئاواتی هەر ئەفریقییەك لە گەڕانەوەی لە وڵاتێکی دەوڵەمەندی وەکو بەریتانیا. لە وڵاتێکی هەژاری وەك سۆماڵ، خەڵك هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە دەستی گیربێت لە عەرەبستانی سعودییە یان ئەوروپا یان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ پارە پەیداکردن تا یارمەتی خێزانە بێبەشەکانیان بدەن.

ئێستا ئیتر کاتی ئەوە هات پاش چوار ساڵ بگەڕێمەوە - بەدەستی بەتاڵ. دەتوانم بڵێم چیم بەدەستهێناوە کە دەگەڕێمەوە؟ بە دایکم بڵێم، فێری لێنانی مەعکەرۆنی بووم؟ بگەڕێمەوە لای حوشترەکانم، لەوانەیە مەعکەرۆنی هەر نەبینمەوە. بە باوکم بڵێم، فێری پاککردنەوەی توالێت بووم؟ 'چی؟ توالێت چییە؟' باوکم وا دەڵێت. ئا، بەڵام پارە، *پارەی نەخت*، شتێکە دەتوانێت لێی تێبگات - زمانێکی گشتییە. شتێکە کە خێزانەکەمان هەرگیز بە تەواوەتی نەیان بووە.

لەو کاتەدا کە خاڵ و پورم ئامادەی گەڕانەوە بوون بۆ سۆماڵ، پارەیەکی کەمم لە کرێی کارەکەری کۆکردبۆوە، کرێیە کە زۆر بێبەزەییانە بوو. هەرچۆنێك بوو ئاواتم ئەوە بوو، پارەیەکی باش پێکەوە بنێم بۆ کڕینی خانوویەك بۆ دایکم - جێگایەك کە بتوانێت تیایدا بژی، بێئەوەی ناچار بێت بەردەوام لە کۆچکردندا بێت و زۆر لە هەوڵدابێت بۆئەوەی نەمرێت. وەك دەردەکەوت ئەمەش شتێك بوو زۆر دووردەست نەبوو، چونکو بە ڕێژەی گۆڕینەوەی پارە، دەمتوانی بە دوو هەزار دۆلار خانوویەك لە سۆماڵ بکڕم. بۆ ئەم مەبەستە، لەوەتەی هاتبوومە لەندەن لەو خەیاڵەدا بووم بمێنمەوە و ئەو پارەیە بەدەست بهێنم، چونکو دەمزانی هەر لێرە بڕۆم بێگومان ئیتر ناتوانم بگەڕێمەوە. چۆن ئەمە بکەم، نەمدەزانی. بەڵام لەو باوەڕەدا بووم، کە ئەمە خۆی دەچێتە پێشەوە بە ڕزگاربوون لە کاری کۆیلانەی پور و خاڵم. بە هەر هۆیەك بوو، ئەوان ڕازی نەدەبوون. 'باشە تۆ چیی دەکەیت لێرە؟' پورم وتی. 'کچێکی هەژدە ساڵە، نە شوێنێك هەیە تیایدا بمێنێتەوە، نە پارەیەك، نە کارێك، نە مۆڵەتی کارکردنێك و نە زمانی ئینگلیزییەك؟ قسەیەکی پوچ دەکەیت! تۆ لەگەڵماندا دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە.'

پێش گەڕانەوە بە ماوەیەکی زۆر، خاڵە محەممەد هەمووومانی لە دوو شت ئاگادارکردەوە: ڕۆژی سەفەرەکەمان و دڵنیایی لە پاسپۆرتەکانمان کە بزانین تەواوە. منیش هەر ئەوەم کرد. یەکسەر بەپاسپۆرتەکەوە چوومە چێشتخانە و لە زەرفێکی پلاستیکیەوە پێچام، پاشان لە باخەکەماندا خستمە ژێر زەوییەوە.

چاوەڕوان بووم تا ڕۆژێك پێش گەڕانەوەمان بۆ مەقادیشۆ، ئینجا ڕام گەیاند کە پاسپۆرتەکەمم بۆ نادۆزرێتەوە. پیلانەکەم تەواو سادە بوو: ئەگەر پاسپۆرتم پێنەبێت، ناتوانن بمبەنەوە. خاڵە محەممەد دەیزانی موویەك لەم ماستەدا هەیە و کەوتە پرسیارکردن، 'باشە واریس، لەوانەیە پاسپۆرتەکەت لە کوێدا بێت؟ لە کوێدا

بوویت، لەوانەیە هەر لە وێدا جێت هێشتبێت؟ٚ ڕۆشن بوو دەیزانی وەڵامی ئەو پرسیارە چییە، چونکو بە دەگمەن لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا لە ماڵەوە نەبوو‌بێتم.

ٚنازانم ـ لەوانەیە لە ماڵ پاککردنەوەدا بە ڕێکەوت فڕێم دابێت.ٚ بە سەرێکی بەرزەوە وەڵامم دایەوە. خاڵم هێشتا باڵوێز بوو، دەیتوانی یارمەتیم بدات ئەگەر بیویستایە. ئاواتەخوازبووم، خاڵم بەوەی بزانیایە، کە چەند بێچارانە دەمەوێت بمێنمەوە، نەیبردمایەوە بۆ ماڵەوە و لە جیاتی ئەوە یارمەتی بدامایە و ڤیزەیەکی بۆ دەربهێنامایە.

ٚدەی باشە، ئێستا ئێمە دەتوانین چی بکەین، واریس؟ هیچمان لە دەست نایەت تەنیا لێرە جێت دەهێڵین!ٚ خاڵم زۆر زویربووبوو لەوەی خستومەتە ئەو هەلومەرجەوە. لەو شەو و ڕۆژەدا جەنگێکی دەرونیمان دەست پێکرد، بۆئەوەی بزانین کێ پاشەکشێ دەکات. من پێم داگرت لەسەرئەوەی پاسپۆرتەکەم ونبووە، ئەویش سووربوو لەسەرئەوەی کە هیچ شتێك ناکات بۆ یارمەتی دانی من.

پورە مارویم بۆچوونی خۆی هەبوو، ٚباشە، چوار پەلت دەبەستین، دەتخەینە ناو باوەڵێکەوە و بەدزییەوە دەتبەینە ناو فڕۆکەکەوە! ئاسایی خەڵك وا دەکات.ٚ

ئەم هەڕەشەیە جێگای سەرنجم بوو. ٚئەگەر ئەوەم لەگەڵدا بکەیت،ٚ بە هێواشی وتم ٚهیچ کات لێت نابوورم. پورێ تەماشاکە، بەس دەستم لێهەڵگرن، من باش دەبم.ٚ

ٚنا، نا، تۆ باش دەبیت،ٚ بە گاڵتە پێکردنەوە وەڵامی دەدامەوە. ٚنا، تۆ هیچ باش نابیت.ٚ نیگەرانییەکی زۆرم لە دەموچاویدا بەدیدەکرد، بەڵام ئایا ئەوەندە نیگەران بوو یارمەتی من بدات؟ هاوڕێی زۆری هەبوو لە لەندەندا ، خاڵم پەیوەندییەکی باشی هەبوو لە باڵوێزخانەدا. تەنیا تەلەفون کردنێك، دەیتوانی بەردە بازێك بێت بۆئەوەی بکەومە سەر پێی خۆم، بەڵام دەمزانی، ئەگەر بۆ یەك سات بیان زانیایە

دەتوانن بم خڵەتێنن و بمبەنەوە بۆ سۆماڵ، لە تەلەفون کردنێکی وەها درێخیان نەدەکرد.

بۆ سبەینێ بەیانی شڵەژاندن کەوتبووە تەواوی ئەم خانووە چوار نهۆمییەوە، هەموو کەوتبوونە شت کۆکردنەوە، تەلەفون بەردەوام لێی دەدا و خەڵك لە ڕاکەڕاکە دابوو بۆ ناوەوە و دەرەوەی خانووکە. منیش لە سەرەوە، لە ژوورە بچوکە هەورەبانییەکەم، خەریکی خۆ ئامادەکردن بووم، ئەو تۆزە کەلوپەلەی، کە لە ماوەی مانەوەم لە لەندەن بەدەستم هێنابوو، کەوتمە کۆکردنەوەیان. لە کۆتاییدا تەواوی ئەو جلوبەرگانەی  کە بۆم مابۆوە، فڕێم دایە زبڵدانەکەوە، چونکو زۆر پێم ناشرین بوون و بۆ من مۆدێلەکەی کۆن بوو. بۆ خۆم بار بکەم لەم پاشەڕۆیە؟ هێشتا من کۆچەریم، دەبێت بارم سوك بێت.

لە کاتژمێری یانزەدا، هەموو لە ژووری دانیشتن کۆبوونەوە، لە کاتێکدا شۆفێرەکە خەریکی بارکردنی باوەڵەکان بوو بۆ ناو ئوتومبیلەکە. بۆ ساتێك ڕاوەستام و کەوتمە بیری ئەو ڕۆژەی کە چەند ساڵ لەوەو پێش هاتبوومە ئێرە - شۆفێرەکە، ئوتومبیلەکە، هاتنە ناو ئەم ژوورەوە، بینینی مۆبیلە سپییەکە، موغەیریەکە و بینینی پورم بۆ یەکەم جار. ئەو بەیانییە تەماوییەی کە بۆ یەکەم جار چاوم بە بەفر کەوت. هەموو شتێکی ئەم وڵاتە نامۆ دەهاتە بەرچاوم. لەگەڵ پورە پەرێشانەکەم چووم بۆ لای ئوتومبیلەکە و پێی وتم، 'من چی بە دایکت بڵێم؟

'پێی بڵێ باشم و زوو پەیوەندی پێوە دەکەم.' سەری بادا و چووە ناو ئوتومبیلەکەوە. لەسەر شۆستەکە ڕاوەستام و دەستم بۆ ماڵئاوایی لە هەریەکیان بەرزکردەوە، پاشان چوومە سەر جادەکە و تەماشای ئوتومبیلەکەم کرد تا لە چاو ونبوو.

نامەوێ درۆ بکەم ترسم لێنیشت. تا ئەو ساتە باوەڕم نەدەکرد، هەر ئاوا بە تەنیا جێم دەهێڵن. بەڵام دروست ئەو کاتەی لە ناوەڕاستی جادەی هارلیدا وەستابووم تەواو - تاك و تەنیا بووم. هەستێکی وەهام بۆ پور و خاڵم نەبوو، سەرەڕای ئەوەی کە خزممان بوون. هەلێکیان بۆ ڕەخساندم و منیان هێنا بۆ لەندەن، لەم پەیوەندەدا تا ماوم سوپاسیان دەکەم. کاتێك ڕۆیشتن، دەم هێنایە بەرچاوی خۆم چۆن بیردەکەنەوە، 'باشە دەتویست بمێنیتەوە - ئاوا بۆت هەڵکەوت. بڕۆ ئینجا - جیت دەوێت بیکە. بەڵام ئێمە دەست بە باڵتەوە ناگرین، چونکو وا بۆی چووبووین، کە دەبوو لەگەڵماندا بگەڕێیتەوە.' دڵنیام لەوەی، کە هەستی شەرمەزارییان دەکرد بۆ کچێکی گەنج لە بەریتانیا، بەتەنیا و بێچاودێریکەر بمێنێتەوە. هەرچی چۆنێك بوو، لە کۆتاییدا بڕیاری خۆم بوو، چونکو خۆم هەڵم بژاردبوو بمێنمەوە، دەبوو خۆم بەرپرسی چارەنووسی خۆم بم.

بە ترسێکەوە کە هەموو گیانمی داگرتبوو، چوومە ژوورەوە. دەرگای پێشەوەم داخست و چوومە ناو چێشتخانەکەوە بۆ قسەکردن لەگەڵ تەنیا کەسێك کە مابۆوە - چێشتکەری کۆنە برادەرم. سڵاوی لێکردم 'باشە، دەزانیت، دەزانیت هەر ئیمرۆ دەبێت بڕۆی. من تەنیا کەسێکم کە دەمێنمەوە - نەك تۆ. تۆ دەبێت بڕۆی.' ئاماژەی بۆ دەرگای دەرەوە کرد. دەی باشە، خولەکێك بوو خاڵم ڕۆشتبوو، کەچی ئامادە نەبوو ئەم خولەکە لەسەرم ڕاوەستێ. نیگای لەخۆباییبوون لە دەموچاوی نادۆستانەیدا دەباری، ئەوەی نیشان دەدا، کە چێژ فەرماندان دەبینێت بەسەر مندا. ڕاوەستام و پاڵم دا بە چوارچێوەی دەرگاکەوە، بیرم دەکردەوە، کە چۆن بە ڕۆیشتنی هەموویان، ئێستا ماڵەکە کشومات دیارە. 'واریس، تۆ دەبێت بڕۆی هەر ئێستا. من دەمەوێ بڕۆیتە دەرەوە...'

'نای، دەمت داخە.' ئەم پیاوە لە سەگێکی هاری قاچگر دەچوو. 'من دەڕۆم، باشە؟ تەنیا بۆئەوە هاتووم جانتاکەم بەرم.'

'هەرئێستا بیبە - خێراکە. خێراکە. زووکە، چونکە من دەبێت -' لەو کاتەدا بەسەر پێپلیکەکاندا سەردەکەوتم، هات و هاواریم بۆ گرنگ نەبوو. ئاغا ڕۆیشتبوو چێشتکەر لێمان بووبوو بە ئاغا بۆ ئەو ماوە کورتەی تا ئاغای باڵوێزی تازە دەگات. بە ناو ژووره بەتاڵەکاندا ڕۆیشتم، بیرم لەو هەموو کاتە خۆش و ناخۆشانە دەکردەوە، بۆم پرسیاربوو، هەواری تازەم لە کوێ دەبێت.

جانتا بچکۆلەکەمم لە جێگاکەم هەڵگرت، دام بە شانمدا، بە هەر چوار ڕیز پێپلیکانەکاندا هاتمە خوارەوە و بە دەرگای پێشەوەدا هاتمە دەرەوە. ڕۆژەکەی وەك ڕۆژی گەیشتنم ناخۆش نەبوو، ڕۆژێکی هەتاوی هەوا خۆش بوو، ئاسمان ساف وەك کاتی بەهار. لە باخچەکەدا بەردێکم بەکارهێنا بۆ هەڵکەندنی زەوییەکە، پاسپۆرتەکەم لە زەرفە پلاستیکییەکە دەرهێنا و خستمە ناو جانتاکەمەوە. دەستم لە گڵەکە پاککردەوە و ڕووم لە جادە کرد. نەمتوانی زەردەخەنە نەم گرێت، کاتێك بەسەر  شۆستەکەدا کەوتمە ڕێ - لە کۆتاییدا سەرفەرازبووم. تەواوی ژیانی خۆمم گرتەپێش، بەبێ ئەوەی شوێنێکم هەبێت بۆی بچم، بەبێ ئەوەی بەرپرس بم بەرامبەر بە یەکێ. دەشم زانی، هەرچی چۆنێك بێت، شتەکان بۆ خۆیان دەچنە پێشەوە.

یەکەم جێگای وەستانم باڵوێزخانەی سۆماڵ بوو لە نزیك ماڵی خاڵم. لە دەرگام دا. پاسەوانێك وەڵامی دامەوە کە زۆر باش خێزانەکەی دەناسی، هەتا هەندێك جار شۆفێری بۆ خاڵم کردبوو. 'چۆنی خانم. لێرە چی دەکەیت؟ ئایا بەڕێز فاراح هێشتا لێرەیە؟'

'نا، ڕۆیشتووە. دەمەوێت ئاننا ببینم، بزانم کارێك هەیە من بتوانم لە باڵوێزخانەدا بیکەم.' کابرا پێکەنی. گەڕایەوە بۆ لای کورسییەکەی و دانیشت. دەستی خستە پشت سەرییەوە و پاڵی دایەوە بە دیوارەکەوە. لە ناوەڕاستی ڕاڕەوەکەدا ڕاوەستا بووم، ئەویش هیچ جوڵەیەکی لە خۆ نیشان نەدەدا. ئەم

هەڵسوکەوتەی نیگەرانی کردم، چونکە ئەم کابرایە هەمیشە بەڕێز بوو بەرامبەر بە من. ئینجا زانیم کە هەڵسوکەوتی - وەك چێشتکەرەکە - گۆڕاوە لەگەڵ گۆڕانکاری ئەو بەیانییەدا. خاڵم ڕۆیشتووە و منیش بێ خاڵم هیچ نیم. وە من لە هیچ کەمترم و ئەم گوێرەکانە پێیان خۆش بوو ئاغایەتی بکەن بەسەرمدا.

'ئۆی، ئاننا ئەوەندە سەرقاڵە، کاتی بینینی تۆی هەر نییە.' پاسەوانەکە بە زەردەخەنەوە وتی. 'تەماشاکە،' بە قایمی وتم، 'پێویستیم پێیەتی ببینم.' ئاننا سکرتێری خاڵم بوو، هەمیشە دڵسۆز بوو بەرامبەرم. خۆشبەختانە دەنگە دەنگی ئێمەی لە ڕاڕەوەکەدا بیست و لە نووسینگەکەی هاتە دەرەوە بۆئەوەی بزانێت چی ڕوویداوە.

'واریس! ئەوە لێرە چی دەکەیت؟'

'تۆ دەزانیت. لە ڕاستیدا نەمویست لەگەڵ خاڵم بگەڕێمەوە بۆ سۆماڵ،' بۆم باسکرد. 'ئیتر من نامەوەێ بگەڕێمەوە. ئیتر من - من لەو ماڵە ئیتر نامێنمەوە، تۆ دەزانیت. پرسیارم ئەوەیە، لەوانەیە تۆ کەسێك بناسی - هەرکەسێ بێت کە من بتوانم کاری بۆ بکەم - هەر کارێك - بۆم گرنگ نییە هەرچی کارێك بێت. هەموو شتێك دەکەم.'

'باشە، گوڵەکەم' بڕۆکانی بەرزکردەوە - 'پاش چەند سەرنجێکی کورت. لە کوێ دەمێنیتەوە؟'

'ئۆی، نازانم. نیگەرانی ئەوە مەبە.'

'باشە، دەتوانی ژمارەی تەلەفونی ئەو شوێنەم بدەیتێ تا بتوانم بتدۆزمەوە؟'

'نا، چونکو نازانم لە کوێ دەمێنمەوە. بۆ ئیمشەو هوتێلێکی هەرزان دەدۆزمەوە.' دەمزانی میواننداری دەکردم، ئەگەر ماڵەکەی زۆر بچوك نەبوایە. 'بەڵام پاشان دەتوانم بگەڕێمەوە و ژمارەیەکی تەلەفونت بدەمێ، هەروەها بزانم چیت بۆ کردوم.'

'زۆر چاکە، واریس. گوێگرە، ئاگاداری خۆت بە  لە خۆت دڵنیای کە باش دەبیت.'

'بەڵێ، باش دەبم.' بە لایەکی چاویش هەروا تەماشای پاسەوانەکەم دەکرد، کە بەردەوام وەك کەسێکی گەوج، زەردەخەنە دەیگرت.

'زۆر باشە، سوپاس - بزانە، دێم سەرت دەدەم.'

بە دڵێکی ئاسودەوە گەڕامەوە بەر هەتاوەکە و بڕیارم دا بچم بۆ شت کڕین. هەموو ئەوەی کە پێی دەژیام، تا دەستم لە کارێك گیر دەبوو، پارەیەك بوو کە لە کرێی کارەکەرێتی لام دابوو. بەڵام ئێستا ئیتر ژنێك بووم دەچوومە ناو خەڵکەوە، پێویستم بەوە بوو شتی جوان بکڕم و لەبەری بکەم، جلێکی جوان کە باری دەرونیم بەرزکاتەوە. لە باڵوێزخانەوە کەوتمە ڕێ بۆ بازارێکی گەورە لە دووڕیانی ئوکسفۆرد[1]. لەوەوپێش لەگەڵ باسمە لەوێ بووبووم، کاتێك کە گەیشتمە لەندەن. پورە مارویم ئێمەی ناردبوو بۆ کڕینی چەند شت بۆ من، چونکو لەوەتەی گەیشتبوومە ئێرە جلوبەرگی زستانەم نەبوو. لە ڕاستیدا هێچ جلێکم نەبوو تەنیا ئەوانە نەبێت کە بۆ ناو فڕۆکەکە لەبەرم کرد لەگەڵ لنگە پێڵاوە هاوینیە چەرمییەکە.

بەناو ڕەفەکانی سێلفریجسدا گەڕام، کە پڕیبوو لە جلوبەرگی جۆراوجۆری زۆر، ئینسانی سەرمەست دەکرد. لە دڵی خۆمدا وتم، تا دەتوانم دەمێنمەوە و هەموویان تاقی دەکەمەوە - ئەم هەموو ڕەنگە، شێوازە، بە ئەندازەی جیاواز و جیاواز - ئینسانی سەرخۆش دەکرد. ئەوەی کە بۆ یەکەم جار لە هەموو ژیانمدا خۆم بەرپرسی ژیانی خۆم بووم، مایەی سەرمەستیم بوو - ئیتر کەس نەبوو هاوارم لێبکات، بزنەکان بدۆشم، نان بدەم بە منداڵان، چا دروستکەم، ئەرز بسڕم، تواڵێت پاکەمەوە.

بۆ چەند کاژێر، لە ژووری خۆگۆڕین بە یارمەتی دوو فرۆشیار، خەریکی جل تاقیکردنەوە بووم. بە دەست جوولاندن و چەند وشەی ئینگلیزی کەوتمە قسەکردن لەگەڵیاندا، کە من، جلێکم دەوێت درێژتر، کورتتر، تەسکتر، کراوەتر بێت. لە کۆتاییدا هێنان و بردنی تاقیکردنەوەی جل تەواو بوو، کاتێك کە چەند دەرزەن قاتە جل هەروا لە دەرەوەی ژووری خۆگۆڕینەکە بەسەریەکدا کەڵەکە بووبوو، یەکێك لە فرۆشیارەکان زەردەخەنە گرتی و وتی، "باشە، گوڵەکەم، تۆ بڕیارت داوە چی بکڕیت؟"

مەودای گەورەی ئەو هەموو هەڵبژاردنە دڵخۆشی کردم، بەڵام لەو کاتەدا وا هات بە خەیاڵمدا، کە لەوبەر جادەکەوە بەرامبەر بەم کۆگایە، لەوانەیە شتێکی باشتر بدۆزمەوە. دەبێت ئەویش بگەڕێم، پێشئەوەی دەست بەرم بۆ پاوەندە بەهادارەکانم. "نیازم نییە ئیمڕۆ شتێك بکڕم،" دۆستانە وتم، "بەڵام سوپاستان دەکەم." فرۆشیارە داماوەکان، بە باوەشە جلوبەرگەوە، هەروا بێباوەڕانە سەیریان دەکردم، پاشان بە بێزارییەوە تەماشای یەکتریان کرد. بەلایاندا فڕکەم کرد و بەردەوام بووم لەسەر بەزمی خۆم: بۆ پشکنینی ئینج بە ئینجی جادەی ئۆکسفۆرد.

پاش چەند شوێن گەڕان، هێشتا هیچ شتێکم نەکڕیبوو، بەڵام وەك هەمیشە، ئاسایی خۆشیم دەبینی لەوەی شت تاقیکەمەوە. کاتێك لە بازاڕێکەوە دەچووم بۆ بازاڕێکی تر، هاتمەوە سەرخۆ کە هەوای ڕۆژی وەك بەهار کز دەبێت و ئێوارەی زستان جێگای دەگرێتەوە و هێشتا شوێنی مانەوەی شەوم دیار نییە. هەر بەو خەیاڵەوە خۆم کرد بە بازاڕێکی تردا و ژنێکی ئەفریقی سەرنجڕاکێشەری باڵا بەرزم بینی، کە لەلای مێزێکەوە خەریکی تاقیکردنەوەی بلوزێك بوو. لە سۆماڵی دەچوو، دیقەتم لێدا، بیرم لێکردەوە، چۆن لەگەڵیدا بکەومە گفتگۆ. بلوزێکم هەڵگرت، بەرەو ڕووی زەردەخەنەیەکم کرد و بە سۆماڵی پێم وت، "لە هەوڵدام شتێك بکڕم، بەڵام

ناتوانم بڕیار بدەم چی بکرم. کچێ، باوەڕم پێبکە، ئیمرۆ جلوبەرگێکی زۆرم بینیوە.'

دەستمان بە قسە کرد و ژنەکە ناوی خۆی وت، حالو. تەواو دۆستانە بوو زۆر پێدەکەنی. 'لە کوێ دەژی، واریس؟ چی دەکەیت؟'

'ئۆی، پێکەنینت دێت. دڵنیام لەوەی دەکەویتە ئەو باوەڕەوە کە من شێتم، بەڵام لە هیچ شوێنێك نازیم، هیچ شوێنێکم نییە تیایدا بژیم، چونکو ئیمرۆ خێزانەکەمان منیان جێهێشت و گەڕانەوە بۆ سۆماڵ.' بینیم لە چاوانیدا سۆز دەبارێت، پاشان زانیم، کە ئەم ژنە خاوەنی ئەزمونێکی زۆرە.

'ئەتویست بگەڕێیتەوە بۆ سۆماڵ، ها؟' بەبێ ئەوەی بیڵیم، هەردووکمان تێگەیشتین کە: وڵات و خێزانەکانمان لە دەستداوە. بەڵام ئێمە لەوێ چ هەلێکمان هەیە؟ بمان فرۆشن بە حوشتر؟ ببین بە موڵکی پیاوێك؟ هەموو ڕۆژێکمان گیان کێشانێکبێت بۆئەوەی بژین؟

'نا، بەڵام لێرەش شتێکمان نییە،' وتم. 'خاڵم بالۆێز بوو، بەڵام ڕۆیشت و پیاوێکی تر دێت. لەبەرئەوە ئەم بەیانییە هەر بە شەق منیان کردە دەرەوە و تا ئەم ساتە نازانم ڕوو لە کوێ بکەم.' بە پێکەنینەوە وتم.

حالو دەستێکی بادا بۆ دەمکوت کردنی من، وەك ئەوەی بیەوێ گسکێك لەهەموو گرفتەکانی من بدات. 'تەماشاکە، من لە پشت ئەو گۆشەیەوە دەژیم لە واینێمسینەی[2]. جێگایەکی گەورەم نییە، بەڵام دەتوانی بێیت و ئیمشەو لەلای من بمێنیتەوە. تەنیا ژوورێکم هەیە، لەبەرئەوە ئەگەر ویستت چێشت لێنێیت، دەبێت بچی بۆ نهۆمێکی تر تا خواردنێك دروست بکەیت.'

'ئۆی، کە ئەوە باشە، بەڵام دڵنیای لە خۆت؟'

'بەڵێ، دڵنیام. بە ڕاستیمە، دەی وەرە. ئەگەر وەها نەبێت، دەچیت بۆ کوێ؟'

پێکەوە چووین بۆ ژوورەکەی لە واینێمسینەی - بەشی ناخۆیی قوتابیان، کە خانویەکی گەورەی خشتی تازە بوو. ژوورەکەی پێکهاتبوو لە سیسەمێکی دوو نەفەری، جێگایەك بۆ کتێب و تەلەفیزیونێکی جوانی گەورە. خۆم کردەوە و هاوارم کرد 'ئۆی! دەتوانم تەماشای تەلەفیزیون بکەم؟'

ژنەکە تەماشایەکی منی کرد، وەك ئەوەی لە جیهانێکی ترەوە هاتبم. 'ئەی چۆن بێگومان. دایگیرسێنە.' لەسەر ئەرزەکە لەبەرامبەر تەلەفیزیونەکەدا دانیشتم و بە پەرۆشەوە کەوتمە تەماشاکردنی. پاش چوار ساڵ توانیم تەماشای بکەم بەبێ ئەوەی هیچ کەس، وەك پشیلەی ونبوو، لە ژوورەکە ڕاومبنێت. 'هەرگیز لە ماڵی خاڵت تەماشای تەلەفیزیونت کردوە؟' بە کونجکاوییەوە پرسیاری کرد.

'گاڵتە دەکەیت؟ هەندێك جار بەدزییەوە تەماشام دەکرد، بەڵام هەمیشە دەگیرام. "دیسانەوە تیّ ڤیّ، واریس" لاسایی دەنگە لوتبەرزیەکەی پورم دەکردەوە لەگەڵ پەنجە هەڕەشەکردنەکەی. "بگەڕێرەوە سەر کاری خۆت، هەر ئێستا، دەی خێراکە، ئێمە تۆمان نەهێناوە بۆ تەماشاکردنی تەلەفیزیون."'

شارەزایی ڕاستەقینەم لەسەر ژیان لە لەندەن، لەگەڵ حالودا دەستی پێکرد، هەر دووکمان بووین بە دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی. ئەو شەوەم لەوێ بردەسەر، پاشان شەوێکی تر و شەوێکی تر. تا پێشنیاری کرد، 'بۆچی ژووری بەکرێ ناگریت لێرە؟'

'باشە، لە پێش هەموو شتێکدا ناتوانم بە دەستی بهێنم و پێویستە بچم بۆ قوتابخانە، ئەمەش بە واتای ئەوەدێت، کە ئیتر کاتم نابێت بۆ ئیشکردن.' بەشەرمەوە پرسیارم لێکرد، 'خوێندنەوە و نووسین دەزانێت؟'

'بەڵێ.'

'هەروەها ئینگلیزی قسەدەکەیت؟'

'بەڵێ.'

'تەماشاکە، من هیچ یەك لەمانە نازانم و پێویستم بەوەیە فێریان ببم. ئەمانە لە پێش هەموو شتێکەوەیە بۆ من. ئەگەر دەستکەمەوە بە کار، ئەوسا کاتم نابێ.'

'چاکە، ئەی بۆ نیوکات ناخوێنیت و نیوکات کار ناکەیت؟ بۆت گرنگ نەبێت چ کارێك - هەر کارێکت دەستکەوێت بیکە تا فێری ئینگلیزی دەبیت.'

'تۆ یارمەتیم دەدەیت؟'

'بێگومان، یارمەتیت دەدەم.'

هەوڵمدا ژوورێك بەدەستبهێنم لە واینێمسینەی، بەڵام خەڵکێکی زۆر لە سەرەدا بوون. هەموو کەسێکی گەنج هەوڵیدەدا لەوێ بێت چونکو زۆر هەرزان و خۆمانە بوو، سالۆنی وەرزش و هۆڵی مەلەکردن، بە بارستایی شوێنی مەلەیەکی ئولۆمپی، تیادا بوو. خۆم ناونووس کرد لە سەرەدا، بەڵام دەمزانی هاوکات دەبێت شتێك بکەم، چونکو نەدەکرا لایەك لە ماڵەکەی حالوی داماو داگیر بکەم. دروست لە بەرامبەر واینێمسینەیدا، وایدەبلیوسینی هەبوو، کە پڕی بوو لە کەسانی پیر و تا ئاستێك شوێنێکی دڵتەنگ بوو، بەڵام ژوورێکم بۆ ماوەیەك گرت و کەوتمە گەڕان بە دوای کاردا. هاوڕێکەم ژیرانە پێشنیار کرد، 'بۆچی هەر لێرە دەست ناکەیت بە کار؟'

'مەبەستت چییە؟ هەر لێرە؟'

'هەر لێرە. هەر لێرە،' ئەمەی وت و ئاماژەی کرد بە مەکدۆناڵدێك لەو بەرەوە.

'ناتوانم لەوێ کار بکەم - شانسێکم نییە لەوێ خزمەتی خەڵك بکەم. لەبیرت نەچێ، من نە دەتوانم بە ئینگلیزی بدوێم نە دەتوانم بخوێنمەوە. سەرەڕای ئەوەش، مۆڵەتی کارکردنم نییە.' بەڵام حالو فێڵەکەی دەزانی و دوای پێشنیارەکانی کەوتم و داوای کاری پاککردنەوەی چێشتخانەم کرد، وەك ئیشی ڕەش.

کە دەستم کرد بە کار بۆ مەکدۆناڵد، بۆم دەرکەوت کە قسەکانی حالو چەند دروست لە ئاو دەرهات. بینیم کە چەند کارێکی قورس دەکەم لە بەرامبەر کرێیەکی کەمدا و هەر لەبەرئەمە بوو خاوەنکار کەڵکی وەردەگرت لە هەلومەرجی نایاسایی

بوونی من. تا ئەو کاتەی کاری زۆریان بۆ بکەی، خاوەنکار لە هەلومەرجی تۆ ناپرسێتەوە.

هەرچی شارەزاییەك کە بەدەستم هێنابوو لە کارەکەرێتیمدا بە کارم هێنا بۆ کارکردنم وەك یاریدەدەری چێشتخانە لە مەکدۆناڵددا: قاپم شت، مێزی کارکردنم وشك کردەوە، تاوەی برژاندنم کڕاند و ئەرزم سڕی، بەردەوام خەریکی لابردنی چەوری هەمبەرگر بووم. شەو کە دەگەڕامەوە، چینێك چەوریم پێوە بوو، بۆنی چەوریم لێدەهات. هەمیشە لە چێشتخانە کرێکارمان کەم بوو، بەڵام نەمدەوێرا نارەزایەتی دەرببڕم. هیچ شتێك لەوانەم بۆ گرنگ نەبوو، چونکو بەلایەنی کەمەوە دەمتوانی خۆمی پێبژێەنم. سوپاسگوزار بووم بەوەی کارم هەیە، سەرەڕای ئەوەش دەمزانی زۆر درێژە ناکێشێت. هاوکات دەشم توانی هەرکارێکی تر بکەم، بۆئەوەی بژیم.

بەشێك لە کاتی بەیانیانم تەرخان کرد بۆ خوێندنی زمان، بۆ باشکردنی زمانە ئینگلیزییەکەم تا فێری خوێندن و نووسین ببم. لە ماوەی چەند ساڵدا، ئەوە یەکەم جارم بوو هەموو ژیانم تەنیا ئیشکردن نەبوو. هەندێك جار حالو منی دەبرد بۆ یانە شەوانە، کە لەوە دەچوو هەموو خەڵك لەوێ بیناسن. قسەی دەکرد، پێدەکەنی و لەڕادەبەدەر هەزەلی بوو - تەواوی ئەو وەختە شاد بوو کە هەموو کەس حەزی دەکرد لەگەڵیدا بێت. شەوێکیان لە یانەیەك بووین و پێکەوە بۆ چەند کاژێرێك سەمامان کرد، لەپڕ بە خۆم زانی کە لەلایەن کوڕانەوە دەور دراوین.
"کچەکە!" چرپاندم بە گوێی حالودا. "هەموو ئەم کوڕانە حەزیان لە ئێمەیە؟"

حالو پێکەنی. "ئەی چۆن. هەر هەموویان حەزیان لە ئێمەیە." ئەم سەرنجەی سەرسامی کردم. لە دەموچاوی کوڕەکان ورد بوومەوە و ئینجا بۆم دەرکەوت کە ڕاست دەکات. هەرگیز هاوڕێی کوڕم نەبووە، هەتا جێگای سەرنجی هیچ کوڕیکی تر نەبووم بێجگە لە کەسێکی نائاسایی وەك حاجی پورزام - کە جێگای حەزی من

نەبوو. لەو چوار ساڵەدا، ئاسایی وا چاوم لێدەکرا، کە خاتو تەڕەماش - کارەکەرە. ئێستا لێرە کوڕان لە ڕیزدا وەستاون بۆ سەماکردن لەگەڵماندا. لە دڵی خۆمدا وتم، لێدە واریس، لە کۆتاییدا پێی گەیشتی!

شتێکی سەیر بوو، ئەوانەی دەوروخولی منیان دابوو زیاتر کوڕانی سپی پێست بوون، هەرچەند من حەزم لە کوڕانی ڕەش پێست بوو. هەوڵمدا کۆت و بەندی ئەفریقا، کە تیایدا گەورە بووبووم، بپچڕێنم و زۆر بۆ خۆم بهێنم، بکەومە قسەکردن لەگەڵ هەموو کەسێك - ڕەش، سپی، نێرینە، مێینە. خۆمم ڕازیکرد بەوەی، کە ئەگەر من خۆم بەرپرسی خۆمم، بۆ ئەوەی بژیم دەبێت شارەزای ئەم جیهانە تازەیە ببم، کە زۆر جیاوازترە لە جیهانی بیابان کە تیایدا گەورە بووبووم. لێرە دەبێت خۆم فێری زمانی ئینگلیزی بکەم و لەگەڵ هەموو جۆرە خەڵکێکدا گفتوگۆ بکەم. زانیاریم سەبارەت بە حوشتر و بزن، بە هانامەوە نەدەهات بۆئەوەی لە لەندەندا بژیم.

لە ڕۆژی دواییدا، حالو چالاکی یانەکانی شەوی تەواو دەکرد بە کۆمەڵێك وانەی ئامۆژگاری. دەکەوتە باسکردنی کەسە جۆراوجۆرەکانی شەوی پێشوو کە بینیبوومان، بە چ نیازێك هاتبوون، کەسایەتیان بە تایبەتی وانە بنەڕەتییەکانی سروشتی ئینسان . لەبارەی سێکسەوە، ئەم کوڕانە بە دوای چییەوەن، دەبێت ئاگاداری چی بیین و بەتایبەتی دەبێت تا ئاستێکی زۆر ئاگاداری گرفتی تایبەتی ژنانی ئەفریقی وەك ئێمە بین. لە ژیانمدا هیچ کەسێك باسی ئەم بابەتانەی لەگەڵمدا نەکردبوو. 'کاتێکی خۆش بە قسەکردن، پێکەنین و سەماکردن لەگەڵ ئەم کوڕانە بەرەسەر، واریس، پاشان یەکسەر بۆ ماڵەوە. ڕێگای ئەمانە نەدەی بتخەنە داوی قسەوباسی ئەوەی سێکسیان لەگەڵدا بکەیت. نازانن، تۆ جیاوازی لە ژنی ئینگلیزی، ئەوان تێناگەن کە تۆ خەتەنەکراوی.'

پاش چەند مانگ چاوەڕوانی بۆ ژوور لە وایئمسیئەی، ئاگاداربوومەوە کە ژنێك دەیەوێ بەشێك لە ژوورەکەی بدات بەکرێ. قوتابییە و ناتوانێت کرێی هەموو ژوورەکە بدات. ئەمە بۆ من زۆر باش بوو، چونکو منیش توانام نەبوو، هەروەها ژوورەکەش ئەوەندە گەورە بوو بەشی دوو کەسی وەك ئێمە بکات. حالو هاوڕێیەکی چاك بوو، لەگەڵ ئەوەشدا چەند هاوڕێی ترم پەیدا کرد، چونکە ئەو شوێنە پڕی بوو لە خەڵکی گەنج. بەردەوام دەمخوێند و وردە وردە ئنگلیزییەکەم باش بوو، لە مەکدۆناڵد کارم دەکرد. ژیانم ئاسایی و بەردەوام دەچووە پێشەوە، بەڵام نەمدەزانی لە سەرەتای گۆڕانکارییەکی گەورەدایە.

پاش نیوەڕۆیەك، لە مەکدۆناڵد کارم تەواو بوو، هێشا هەموو گیانم هەر چەوری بوو، بڕیارم دا لە دەرگای پێشەوە، بە بەردەمی کاونتەرەکەوە بچمە دەرەوە، شوێنێك کە کڕیار ڕادەوەستێ و داوای شت دەکات. لەوێدا پیاوی بەردەم قوتابخانەکەی سۆفیا، لەگەڵ کچە بچکۆلەکەیدا، ڕاوەستابوو. `چۆنی،` وتم و بەلایاندا ڕۆیشتم.

`چۆنی، ئەوە تۆی!` گومانی تیادا نەبوو، هەرگیز چاوەڕوانی بینینی منی نەدەکرد لە مەکدۆناڵد. `خۆت چۆنی؟` بە شوروشەوقەوە وتی.

`باشم، باشم.` ڕووم لە هاوڕێکەی سۆفیا کرد و وتم، `ئەی تۆ چۆنی؟` حەزم دەکرد پیشانی بدەم کە منیش ئینگلیزی دەزانم.

`باشە،` باوکی وەڵامی دایەوە.

`زوو گەورە بووە، وا نییە؟ چاکە، من دەبێت بڕۆم. لای تۆم خۆش.`

`ڕاوەستە - لە کوێ دەژیت؟`

`لای تۆم خۆش،` بە زەردەخەنەوە وتم. نەمدەویست چی تر ئەو پیاوە ببینم، چونکو هێشتا متمانەم پێنەدەکرد. دەمزانی دوایی دێتە بەر دەرگایماڵەوە.

کاتێك چوومە ماڵەوە، بڕیارم دا گرفتی ئەم پیاوە ئاڵۆزە، لەگەڵ حالوی هاوڕێی سەر لە هەموو شتێك دەرچوو باس بکەم. پاسپۆرتەکەم لە دۆڵابەکە دەرهێنا و پەڕە پەڕە هەڵمدایەوە و کارتی سەردانی مالکۆلم فایرچایەلدم دەرهێنا، کە ئەو ڕۆژەی خستبوومە ناوی و لەگەڵ پاسپۆرتەکەدا لەناو زەرفێکی پلاستیکیدا خستبوومە ژێر ئەرزەوە لەناو باخچەکەی ماڵی خاڵمدا.

بە پێپلیکانەکاندا چوومە خوارەوە بۆ ژوورەکەی حالو، پێم وت، 'ئەم کارتەم ماوەیەکی زۆرە هەڵگرتووە، شتێکم لەبارەیەوە پێبڵێ. ئەم پیاوە چییە؟ دەزانم دەڵێت وێنەگری مۆدێلە، بەڵام مەبەستی چییە؟

هاوڕێکەم کارتەکەی لەدەست وەرگرتم. 'دەڵێت، کەسێك دەیەوێت جلوبەرگت لەبەرکات و وێنەت بگرێت.'

'خۆت دەزانی، بەڕاستی حەزم لەوەیە بیکەم.'

'ئەم پیاوە کێیە؟ ئەم کارتەت لە کوێ دەستکەوتووە؟'

'ئۆی، ئەمە ئەو پیاوەیە کە بینیومە، بەڵام لە ڕاستیدا متمانەی پێناکەم. ئەو ئەم کارتەی داوە بە من، پاشان ڕۆژێکیان دوام کەوت بۆ ماڵەوە و لەگەڵ پوورم هەندێك قسەوباسی کرد. پوورم خراپ تووڕە بوو و پیایدا هەڵشاخا. بەڵام هەرگیز حاڵی نەبووم ئەم پیاوە چی دەوێت؟'

'چاکە، بۆچی تەلەفونی بۆ ناکەیت و پرسیاری لێ بکە؟'

'بە ڕاستە؟' وتم و تەماشایەکم کرد. 'من پرسیاری لێبکەم؟ ئەی تۆ ناتوانی لەگەڵمدا بێیت و قسەی لەگەڵدا بکەی - بزانی ئەمە چییە. ئینگلیزییەکەم هێشتا زۆر باش نییە.'

'باشە، دەچین تەلەفونی بۆ دەکەین.'

ڕۆژێکی کێشا تا تەواو هێزم دایە خۆ. کاتێك من و حالو پێکەوە دەچووینە خوارەوە بۆ تەلەفونکردن، دەنگی تەپە تەپی دڵم دەهاتە گوێم. پارەیەکی ئاسنی

خستە ناو تەلەفونکەوە و گوێی لە تەقەکەی گرت. کارتەکەی بە دەستێکیەوە گرت، لەبەر ڕۆشنایی کزی دالانە تاریکەکەدا، لێی ورد دەبۆوە، کاتێك دەستی بە ژمارە لێدانکرد. ئینجا وچانێك. 'بەڵێ، دەتوانم لەگەڵ مالکۆلم فایرچایەلددا قسە بکەم.' پاش گفتوگۆیەکی کورت، دروست چووە ناو باسەکەوە: 'ئێوە کەسێکی بەرەلا نیین یان شتێکی تر، وا نییە؟ ئێوە کەسانێك نیین لە هەوڵی کوشتنی هاوڕێکەمدا بن؟ .... بەڵێ، بەلام ئەوەی مەبەستی منە، ئێمە هیچ شتێك لە بارەی ئێوەوە نازانیین - لەکوێ دەژین یان شتێکی.... ئۆی ئۆی ... باشە.' حالو شتێکی نووسی لەسەر پارچەیەك کاغەز. خۆم دا بەسەر شانیدا بۆئەوەی ببینم.

'چیی دەڵێت؟' چرپاندم بە گوێیدا. ئاماژەی بۆ کردم، بێدەنگ بم.

'باشە. تا ئاستێك گونجاوە.... ئێمە ئەوە دەکەین.'

حالو تەلەفونەکەی دانایەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. 'چاکە، پرسیار دەکات: "بۆچی هەردووکتان نایەن بۆ ستودیۆکەم و تەماشا بکەن لە کوێ کار دەکەم، ئەگەر متمانەم پێناکەن؟ ئەگەر ناتانەوێت - چاکە، ئەوەش هەر باشە."'

بە هەردوو مستم دەمی خۆمم گرت. 'بەڵێ. لەگەڵ؟ پێکەوە بچین؟'

'ئەی چۆن، کچێ. باش دەبێت لە پێشدا بزانیین ئەم کابرایە کێیە وا دەوروخولی تۆی داوە.'

1.Oxford Circus
2.YMCA: Young Men's Christian Association.
3. YWCA: Young Women's Christian Association.

## بەشی پانزەیەم

## مۆدێل

ڕۆژی دوایی من و حالو چووین بۆ بینینی شوێنی ستودیۆی مالکۆلم فایرچایەلد. نەمدەزانی چاوەڕوانی بینینی چی دەکەم، بەڵام کاتێك دەرگامان کردەوە، کەوتینە ناو جیهانێکی ترەوە. بە هەموو شوێنێکدا پۆستەری گەورە و وێنەی ژنانی جوان هەڵواسرابوون. 'ئۆی...' بە هێواشی وتم، بەناو ژوورەکەدا گەڕام، تەماشای ئەو دەموچاوە جوانانەم کرد. دەمزانی ئەمە ئەوەیە کە من دەمەوێ، دەمزانی وەك ئەو ڕۆژەی کە بۆ یەکەم جار بیستم، خاڵە محەمەد بە پورە ساهروی دەوت، کە پێویستی بە کچێکە بیبات بۆ لەندەن. ئەمە هەلی منە - من سەر بەم شوێنەم - ئەمە ئەو شتەیە کە من دەمەوێت بیکەم.

مالکۆلم هاتە دەرەوە، چاکوچۆنی لەگەڵ کردین و پێیوتین کە هێور بینەوە و چای بۆ هێناین. کاتێك دانیشت، بە حالوی وت، 'دەمەوێت تەنیا ئەوە بزانیت، تەواوی ئەوەی من دەمەوێت، وێنەی ئەمە بگرم.' ئاماژەیەکی بە من کرد. 'دوو ساڵ بە دوای ئەم کچە بچکۆلەیەوە بووم، هەرگیز ئەوەندە سەختیم نەکێشاوە بۆ وێنە گرتنێك.'

بە دەمی داچەقیوەوە لێی ورد بوومەوە. 'بۆ ئەوە؟ بۆ ئەوە - تەنیا دەتەوێ وێنەم بگری - وێنەیەکی وەك ئەوە؟' ئاماژەم بە پۆستەرەکان کرد.

'بەڵێ.' بە دڵنیاییەوە سەری لەقاند. 'باوەڕم پێبکە. هەر بۆ ئەوەیە.' بە دەستی خەتێکی کێشایە خوارەوە بە ناوەڕاستی لووتیدا. 'تەنیا نیوەی دەموچاوتم دەوێ' ڕووی لە حالو کردەوە -'چونکو جوانترین لاتەنیشتی هەیە.'

لە شوێنی خۆم سست بووم، بیرم دەکردەوە: ئەو هەموو کاتە بە فیرۆ ڕۆیشت! دوو ساڵ بە دوامەوە بوو، کەچی دوو خولەکی برد، تەنیا بۆئەوەی پێم بڵێت، دەمەوێت

وێنەت بگرم. `چاکە، ئامادەم بۆ ئەوە.` بەڵام لەپڕ سڵەمیمەوە، بیری هەندێك لە ئەزمونەکانی خۆمم کەوتەوە لەگەڵ پیاواندا. `بەڵام ئەمیش دێت بۆ ئێرە!` دەستم خستە سەر قۆڵی هاوڕێکەم و ئەویش سەری بۆ لەقاند. `ئەویش با بێت بۆ ئێرە، کاتێك وێنەت لێدەگرم.`

بە پەرێشانییەوە تەماشای کردم. `ئا، باشە. دەتوانێت ئەویش بێت ...` ئیتر لەو کاتەدا ئەوەندە خۆشحاڵ بووم، فنگم لەسەر کورسییەکە تویتکەی نەدەخوارد. `دوو سبەی کاتژمێری دە، وەرنەوە و منیش کەسێك ئامادە دەکەم بۆ ئارایشت کردنت.`

دوو ڕۆژ دواتر گەڕاینەوە بۆ ستودیۆ. ژنێکی ئارایشتکەر منی لەسەر کورسیەك دانا و خۆشی کەوتە کار بە لۆکە، فڵچە، ئسفنج، کرێم، ڕەنگ، بۆدرە، بە پەنجە سواندی بە دەموچاومدا و پێستەکەمی ڕاکێشا. هیچ بیرۆکەیەکم نەبوو چی دەکات، بەڵام تەواوی ئەو کاتە بەبێ دەنگی دانیشتم، تەماشای ئەنجامدانی ئەم کارەم دەکرد بەم شتە پڕ سەیر و سەمەرانە. حالو لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، تەواو پاڵی دابۆوە و زەردەخەنە دەیگرت. جاروبار تەماشام دەکرد و شانم هەڵدەتەکاند یان چاوم لێ دادەگرت. `مەجولێ.` ژنە مکیاجکەرەکە هاواری لێبەرزبۆوە.

`ئێستا،` هەنگاوێك چووە دواوە و دەستێکی خستە سەر سمتی و بە ڕەزامەندییەوە تەماشای کردم. ` لە ئاوێنەدا تەماشای خۆت بکە.` هەستامە سەر پێ و تەماشای ئاوێنەم کرد: لایەك لە دەموچاوم بە مکیاج گۆڕابوو بۆ ڕەنگێکی زیوی ساف بریقەداری کراوە. لاکەی تری واریسە کۆنەکەی جاران بوو.

`واو! تەماشام بکەن! بەڵام بۆچی یەك لا؟` بە سوکە ترسێکەوە وتم.

`چونکو دەیەوێت وێنەی لایەك لە دەموچاوت بگرێت.`

`ئۆی...`

منی برد بۆ ژووری ستودیۆ، لەوێ مالکۆلم منی لەسەر تەپڵەکێکی بچوك دانا. بە دەوری خۆمدا چاوم گێڕا، تەماشای ژوورە تاریکەکەم کرد، پڕی بوو لە شتومەکی وا، کە هەرگیز لەوەوپێش نەم بینیبوو: کامێرا، لایت، باتری، وایەر، کە وەك مار بە هەموو شوێنێکدا شۆڕبووبۆوە. لەبەردەمی کامێرەکەدا منی چاککرد تا گۆشەیەکی نەوەد پلەیی پێدروست کردم لەگەڵ زوومی کامێرەکەدا. 'واریس باشە. دەمت داخە و ڕێك بۆ پێشەوە تەماشاکە. چەناگەت بەرز ڕاگرە. نە ناوا... جوانە -' پاشان گوێم لە چرکەیەك بوو، ئینجا تەقینەوەیەك، کە ڕایچڵەکاندم. فلاشەکان تیشکیان دایە دەرەوە، لایتەکان بۆ چرکەیەك داگیرسان. بریسەکەی لایتەکان وای لێکردم هەست بکەم کەسێکی ترم: لەپڕ، بۆ ساتێك خۆمم هاتە پێشچاو، وەك یەکێك لە ئەستێرەکانی سینەما، کە لە تەلەفیزیوندا بینیبووم، لە کاتی کردنەوەی بۆنەیەکدا، بەرەو ڕووی کامێرەکان زەردەخە دەیگرێت کاتێك لە ئوتومبیلە لیمۆزینەکەی دێتە خوارەوە. پاشان پارچەیەك کاغەزی لە کامێرەکە دەرهێنا و تەماشای کاتژمێرەکەی خۆیی کرد.

'ئەوە چی دەکەیت؟' پرسیارم کرد.

'کات دەگرم.' مالکۆلم ئاماژەی بۆ کردم، بچمە بەر ڕۆشناییەکە و توێژێکی بەسەر کاغەزەکەوە لێکردەوە. کە تەماشام کرد، وردە وردە ژنێك لە ناو جامی وێنەکەدا دەرکەوت وەك ئەوەی کارێکی جادوگەرانە بێت. کاتێك وێنەیەکی نمونەی[1] پیشاندام، بەئاستەم خۆمم ناسییەوە، وێنەکە لای ڕاستی دەموچاوم بوو، بەڵام لە جیاتی ئەوەی لە واریسی کارەکەر بچێت، لە واریسی مۆدێل دەچوو. منیان گۆڕیبوو بە زیندەوەرێکی دڵفڕێن، وەك یەکێك لەوانەی کە لە دالانی ستودیۆ مالکۆلم فایرچایەلد هەڵواسرابوو.

لە کۆتایی ئەو هەفتەیەدا، پاشئەوەی مالکۆلم فیلیمەکەی شتەوە، سەرئەنجامی کارەکەی خۆیی پیشان دام. وێنە سلایدییەکانی[2] دایە بەر سندوقێکی لایتی، زۆر

حەزم لێکردن. پرسیارم لێکرد کە دەتوانێت وێنەی زیاترم لێبگرێت. وتی زۆر گرانە، بەداخەوە لە توانایدا نەبوو. بەڵام ئەوەی مابوو بیکات، چاپکردنی وێنەکان بوو.

ڕۆژێکیان، پاش دوو مانگ لە وێنەگرتنەکە، مالکۆلم تەلەفونی بۆ کردم بۆ وای[3].

"تەماشاکە، نازانم تۆ ئەگەر حەزت لە کاری مانیکان بێت، بەڵام هەندێك خەڵك هەیە دەیانەوێت بتبینن. یەکێك لە ئاژانسە مانیکانەکان وێنەکەی تۆیان لە کتێبەکەی مندا بینیوە و داوایان کردووە کە تۆ تەلەفونیان بۆ بکەی. ئەگەر پێتخۆشە، دەتوانی لەگەڵ کۆمپانییەکیان ڕێکەویت و کاریان بۆ بکەیت."

"چاکە ... بەڵام تۆ دەبێت من بەریت بۆ ئەوێ ... چونکو دەزانیت، هەست بە نارامی ناکەم بە تەنیا بڕۆم. دەمبەی بۆ ئەوێ و بمناسێنی؟"

"نا، ناتوانم ئەوە بکەم، بەڵام ناونیشانەکەت دەدەمێ."

بە وریاییەوە، دەستێك جلم هەڵبژارد بۆ ڕۆژی کۆبونەوە لەگەڵ ئاژانسی مانیکانی کراوفۆرد. چونکو کاتی هاوین بوو، کراسێکی سووری یەخە حەوتی قۆڵ کورتم لەبەرکرد. کراسەکە نە کورت بوو نە درێژ. بەڵام دەگەیشتە ناوەڕاستی پوزم و تەواو حەشری دەکرد.

بە کراسی سووری هەرزان و کالەوە خۆم کرد بە ئاژانسدا و بیرم دەکردەوە: *ئەمە خۆیەتی. لە ڕاستیدا ڕوودەدا!* لە ڕاستیدا خۆمم زۆر بە ناشیرین دەزانی. هەرکاتێك بیر لەو ڕۆژە دەکەمەوە، هەست بە ئازارێکی زۆر دەکەم، بەڵام تا ئاستێك شانسم هەبوو کە پێم نەدەزانی هەڵەکە لە چی دایە، چونکو من جوانترین جلی خۆمم لەبەردابوو. گومانیشی تیادا نەبوو کە پارەم نەبوو بچمە دەرێ و دەستێك جلی تازە بکڕم.

کە گەیشتم، فەرمانبەری پێشوازیکەر پرسیاری لێکردم، کە وێنەم پێیە و منیش وتم، دانەیەك. منی ناساند بە ژنێکی جوانی جل ڕێکوپێك بە ناوی ڤێرۆنیکا.

ڤێرۆنیکا بانگی کردم بۆ نووسینگەکەی خۆی و ئاماژەی بۆ کردم، لەسەر کورسییەك بەرامبەر بە خۆی لەو سەری مێزەکە دانیشم. 'واریس تەمەنت چەندە؟'

'من گەنجم!' ئەمانە کۆمەڵێك وشە بوون هاتنە سەر زمانم و منیش دامە دەرەوە. 'لە ڕاستیدا - من گەنجم. ئەو چرچانە' - ئاماژەم بۆ چاوم کرد - 'بەوانەوە لەدایکبووم.'

زەردەخەنەیەك گرتی. 'زۆر چاکە.' ڤێرۆنیکا وەڵامەکانی منی لە فۆرمێکدا دەنووسی. 'لەکوێ دەژی؟'

'نۆ، لە وای دەژیم.'

'چی، ئێستا ...' ناوچەوانی گرژ کرد. 'لەکوێ دەژی؟'

'لە واینمسینەی دەژیم.'

'کار دەکەیت؟'

'بەڵێ.'

'کارت چییە؟'

'مەکدۆناڵد'

'چاکە ... لەبارەی مانیکانەوە هیچ دەزانی؟'

'بەڵێ.'

'چی دەزانی لەبارەیەوە - زۆر شت دەزانی؟'

'نا، دەزانم دەمەوێت بیکەم.' ئەم ڕستەیەی دواییم چەند جار دووبارە کردەوە بۆ دڵنیایی.

'باشە. ئەلبومت هەیە - وێنەت هەیە؟'

'نا.'

'خێزانت لە کوێیە؟'

'ئەفریقا.'

'تۆش لە وێوە هاتووی؟'

'بەڵێ، لە سۆماڵەوە.'

'باشە، کەست لێرە هەیە؟'

'نا، هیچ کەسێکم لێرە نییە.'

'چاکە. هەرئێستا نواندنێك هەیە و دەبێت بچیت بۆ ئەوێ.'

هەوڵمدا تێبگەم و ماوەیەك وەستام تا لێکی بدەمەوە، واتای ڕستەی کۆتایی چی بوو. 'ببورە، تێنەگەیشتم.'

'ن و ا ن د ن.' وشەکەی بە هێواشی وت.

'نواندن چییە؟'

'دەزانیت، چاوپێکەوتنێك هەیە کاتێك داوای کارێك دەکەیت، چاوپێکەوتنت لەگەڵدا دەکەن؟ باشە؟ چاوپێکەوتن؟ تێگەیشتی؟'

'ئا، ئا.' درۆم کرد. هیچ تێنەگەیشتم لەوەی وتی. ناونیشانی دامێ و پێی وتم، یەکسەر بچم بۆ ئەوێ.

'تەلەفونیان بۆ دەکەم و پێیان دەڵێم، تۆ بە ڕێگاوەیت. پارەت پێیە بۆ تەکسی؟'

'نا، دەتوانم بە پێ بڕۆم.'

'نا، نا شوێنەکە زۆر دوورە. *زۆر دوورە*. دەبێت تەکسی بگریت. *تەکسی*.باشە؟ تەماشاکە ئەمە دە پاوەند. کە تەواو بوویت، تەلەفونم بۆ بکە. باشە؟'

کاتێك بەناو شاردا بە تەکسی دەڕۆیشتم، خۆشی هەموو گیانمی داگرتبوو. *ئۆ، ئۆ، ئۆ. ئێستا ئیتر لەسەر ڕێگای خۆمم*. دەچم دەبم بە مانیکان. پاشان پێم زانی کە شتێکم بیرچووە: پرسیارم لێنەکرد، کارەکە چییە. دەی باشە، ئەمە گرنگ نییە. باش دەڕوا چونکو تەواو جوانم!

کاتێك گەیشتمە شوێنی نواندنەکە، چوومە ناو ستودیۆیەکی تری فۆتۆگرافییەوە. دەرگای شوێنێکی ترم کردەوە، جمەی دەهات بە ژنانی مانیکان - ژوور لە پاش ژوور پڕی بوو لە ژنانی لاق درێژ. بەو ناوەدا لەنجەولاریان بوو، لە گەلە شێر دەچوون، کاتێك دەوروخولی نێچیەرەکەیان دەدا، لەبەردەمی ئاوێنەدا پۆزیان لێدەدا، دەنوشتانەوە و قژیان بادەدا، قاچوقولیان چەور دەکرد بۆئەوەی تاریك بنوێنن. لە سەر کورسییەك دانیشتم و سڵاوم لە کچێك کرد، کە لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، پرسیارم لێکرد، ‘ئەرێ کارەکە چییە؟’

‘ڕۆژژمێری پیرێلی.’

‘ئمممم.’ سەرم بۆ لەقاند، وەك ئەوەی لەوسەری هاتبێتمەوە. ‘ڕۆژژمێری پیرێلی. سوپاست دەکەم.’ *ئەی هاوار ئەوە چییە - ڕۆژژمێری پیرێلی؟* تەواو پەرێشانی دایگرتم، نەمدەتوانی بە ئارامی دانیشم، لاقەکانم ئارامیان لەبەر هەڵگیرابوو، بە دەوری خۆمدا هەر چاوەچاوم بوو تا یاریدەدەرێك هاتە دەرەوە و پێی وتم نۆبەی منە. بۆ ساتێك گیانم گرژ بوو.

لام لە کچەکەی تەنیشتم کردەوە، ڕوو بە یاریدەدەرکە، پێم وت، ‘تۆ بچۆ. من چاوەڕوانی هاوڕێکەم دەکەم.’ هەر کاتێك یاریدەدەر بۆ لای من دەهات، ئەمەم لێ دووبارە دەکردەوە تا ژنی تر لە شوێنەکەدا نەما.

هەموو چوونە ژوورەوە.

لە کۆتاییدا ژنەکە هاتە دەرەوە، هیلاك و ماندوو پاڵی دا بە دیوارەکەوە و وتی، ‘وەرە. ئێستا دەتوانی بچی.’ بۆ ساتێك تەماشایەکم کرد و لە دڵی خۆمدا وتم، *ئیتر بەسە، واریس. دەتەوێ ئەم شتە بکەیت یان نا؟ خێراکە، هەستە، با بڕۆین.*

دوای ژنەکە کەوتم بۆ ناو ستودیۆکە و پیاوێك کە سەری نووساندبوو بە پشتی کامێرەیەکەوە، هاواری لێکردم، ‘سەر ئەوێ. نیشانەیەك هەیە.’ ئاماژەی بۆ کردم.

‘نیشانەکە.’

`ئاوا، لەسەر نیشانەکە ڕاوەستە.`

`چاکە. سەرەوەت داکەنە.`

لە دڵی خۆمدا وتم، گومانی تیادا نییە من لەم کابرایە حاڵی نابم، بەڵام ئیتر لەو کاتەدا خەریك بوو دەڕشامەوە. `سەرەوەم، مەبەستت کراسەکەمە.`

کابرا سەری لە پشتی کامێرەکە دەرهێنا و چاوی تێبڕیم، وەك ئەوەی کەسێکی نەفام بم. بە پەرێشانییەکی زۆرەوە وتی، `نا، نا، کراسەکەت داکەنە، دەزانت، ئەی تۆ بۆ هاتووی بۆ ئێرە؟`

`بەڵام ستیانم لەبەردا نییە.`

`مەبەست هەر ئەوەیە، تا بتوانین مەمکەکانت ببینین.`

`نا!` *ئەم قسە قۆرە چییە - مەمکەکانم!* سەرەڕای ئەوە من کراسم لەبەردا نەبوو. *هەموو ئەوەی لەبەرمدا بوو کراسە سوورەکەم بوو. ئەم گەوجە بە تەمایە چی بۆ بکەم، لەو باوەڕەدایە. کراسەکەم دادەکەنم و دەچم لەوێدا دەوەستم بە دەرپێیەکی قۆڕ و کاڵەیەکەوە؟*

`نا، نا؟ هەموو کەس گیانی دەردەچێت بۆ ئەوەی بگات بەم نواندنە و تۆش هاتووی پێم دەڵێی نا؟`

`نا، نا، داوای لێبوردن دەکەم. هەڵەیە. هەڵەیە. هەڵەم کردووە،` و بە هەڵەداوان بەرەو دەرگاکە چووم. کاتێك کە بەلای کۆمەڵێك وێنەدا، کە لەسەر عەرزەکە بڵاوکرابۆوە، ڕۆیشتم، نووشتامەوە بۆ بینینیان.

وێنەگرەکە بە دەمی داچەقیوەوە بۆ چەند ساتێك تەماشای کردم. پاشان ئاوڕی دایەوە و هاواری کرد، `ئەی هاوار، شتێکمان بۆ هاتۆتە پێش! تێرێنس، تۆزێك گرفتمان بۆ هاتۆتە پێش.`

پیـاوێکی کەتـەی بـەهێزی قـژ ماشـوبرنجی پـڕی ڕوومـەت سـوور لـە ژوورێـك هاتەدەرەوە و بە کونجکاوییەوە سەیری کردم. بەناستەم زەردەخەنەیەك کەوتە سـەر لێوانی. 'بەڵێ. هیچ بووە؟'

خۆم ڕاست کردەوە و فرمێسك پەڕییە چاوانم. 'نـا. ئـەوە شـتێکە نـاتوانم بیکـەم. من ئەوە ناکەم.' ئاماژەم بـۆ وێنـەی ژنێـك کـرد، کە لـە ناوقـەد بـەرەوژووری ڕووت بوو. سەرەتا تەواو دڵم شکا. شوروشەوق و ئاواتی بوون بـە مانیکان ڕۆیـشت. یەکـەم کارم وەرگرت و دەیانەوەێ جل بەبەر خۆمەوە نەهێڵم! ئینجا تـوڕە بـووم - کەڵلـەیی بووم - و بە سۆماڵی کەوتمە جنێودانیان. 'ئێوە پیاوانی پیسن! گەوجینە! بەرازینـە! کاری نەعلەتی خۆتان بۆ خۆتان!'

'ئەوە دەڵێی چی؟ تەماشـاکە، ئەوەنـدە سـەرقاڵم کـاتی ئـەوەم نییـە -' بـەڵام لـەو کاتەدا لەناو دەرگاکەدا بووم، بە پەلە دەچوومە دەرەوە، وا دەرگاکەم قایم دایـەوە بـە یەکدا خەریك بوو لە گرێژەنە بێتەدەرەوە. لە تەواوی ڕێگا بـەرەو وایـم، گریـام، بـە خـۆمم دەوت، دەزانم شـتێك بـوو غـەمناك، تـەواو نـاخۆش، ئەمـە لـە تـەواوی کـاری مانیکاندا هەیە.

ئەو ئێوارەیە لە جێگادا کەوتبووم، بە داخـەوە دەتلامـەوە، کە هاوژوورەکـەم پـێی ڕاگەیاندم، 'واریس، تەلەفون بانگت دەکات.'

ڤێرۆنیکا بوو لە ئاژانسی مۆدێلەوە. 'ئەوە تـۆی!' هـاوارم کـرد. 'نامـەوێت لەگـەڵ خـەڵکانێکی وەك ئێـوە قسە بکـەم! ئێـوە - ئێـوە شـەر - ئێـوە شـەرمە -' هـەوڵم دەدا بڵێم، *شەرمەزارم دەکەن* بەڵام چـەند کۆشـشم کـرد وشـەکەم بـۆ نەهاتـە سـەر زمـان. 'سامناك بوو. زۆر خراپ بوو. من نامەوێ ئەوە بکەم. من نامەوێ لەوە زیاتر لەگەڵ ئێوە بم!'

'باشە، ئێستا ئارام بگرە، واریس. دەزانی ئەو پیاوەی ئێمڕۆ کێ بوو، وێنەگرەکە؟

"نا."

"دەزانی تێرێنس دۆنۆڤان کێیە؟"

"نا."

"چاکە، هاوڕێت هەیە ئینگلیزی قسە بکات؟"

"بەڵێ."

"چاکە، هەرکەسێك ئینگلیزی قسە بکات دەزانێت ئەو پیاوە کێیە. کاتێك تەلەفونەکەمان تەواو کرد، پرسیاریان لێبکە. ئەو وێنەی خێزانی پاشا، شازادە دی[9] و هەموو مانیکانە بەناوبانگەکان دەگرێ. هەرچی چۆنێك بێت، ئەو دەیەوێت دیسانەوە بتبینێتەوە، پێیخۆشە وێنەی تۆ بگرێت."

"داوای لێکردم جلەکانم داکەنم! تۆ ئەوەت پێنەوتم پێش ئەوەی بڕۆم!"

"دەزانم  دروستە، ئێمە زۆر بە پەلە بووین، تەنیا بیرم لەوە کردەوە، کە ئەو کارە قابیلی تۆیە. بۆم باسکرد کە تۆ ئینگلیزی نازانی و ئەو جۆرە شتانە دژ بە کەلتوری تۆیە. بەڵام ئەمە بۆ ڕۆژژمێری پیریلیە و پاش تەواوبوونی ئەم کارە، ئیشی زیاترت پێدەدرێ. هەرگیز گۆڤاری مۆدێلی وەك ڤۆگیو و ئلێت کڕیوە؟"

"نا، لە توانامدا نییە بیکڕم. بەڵام لە دوکانی ڕۆژنامە فرۆشی سەر جادەکان تەماشایان دەکەم، هەردەم دەیان خەمەوە جێگاکانی خۆیان."

"چاکە، بەڵام تۆ بینیوتن؟ ئەو جۆرە کارەیە کە پێی هەڵدەستی. تێرێنس دۆنۆڤان لە هەموویان باشترە. ئەگەر دەتەوێ کاری مانیکان بکەی، پێویستە ئەو کارە بکەی. لە پاش ئەوە پارەیەکی زۆر بەدەستدەهێنی و هەرچیت پێخۆش بێت دەیکەیت."

"من سەرەوەی کراسەکەم داناکەنم."

گوێم لە ئاه هەڵکێشانی بوو "واریس، وتت لە کوێ ئیش دەکەم؟"

"مەکدۆناڵد"

'چەند وەردەگری؟
وەڵامم دایەوە.
'چاکە، ئەو هەزار و پێنج سەد پاوەندت پێدەدا بۆ یەك ڕۆژ.'
'هەمووی بۆ من؟ هەمووی بۆ خۆم دەبێت.'
'بەڵێ و هەروەها بەم لا و ئەو لاشدا دەتبەن. ئەم کارە دووبارە دەکرێتەوە لە گەرماو. من نازانم تۆ لەوێ بوویت، بەڵام شوێنێکی زۆر خۆشە. لە هوتێلی ڕۆیالتۆن دەمێنیتەوە،' لەم قسانەی کرد، وەك ئەوەی من لێی تێبگەم. 'تەماشاکە، دەتەوێ ئەو کارە بکەیت یان نا؟'
ئیتر لەو کاتەدا ڕازی کردم. بە پێکەوەنانی پارەیەکی وا، بەسە بۆ ئەوەی خێرا یارمەتی دایکمی پێبدەم. 'باشە، باشە! کەی دەتوانم بچمەوە بۆ لای ئەو پیاوە؟'
'سبەینێ بەیانیت پێ چۆنە؟'
'تەنیا سەرەوە دادەکەنم - هەر ئەوە؟ ئەوەی مەبەستمە، تۆ دڵنیایی لەوەی کە ئەو هەزار و پێنج سەد پاوەندە بۆ ئەوە نییە من دەبێت لەگەڵ ئەو پیاوە بچمە جێگاوە؟'
'نا، نا. ئەمە داو نانەوە نییە. هیچ شتێکی وەها وەك ئەمە لە ئارادا نییە.'
'یان ... تۆ دەزانی، ئەو ئەوەی دەوێ من لاقمی بۆ بلاوکەمەوە یان شتی قۆڕی تر؟ ئەگەر وایە، ئێستا پێم بڵێ.'
'تەنیا سەرەوە داکەنە. بەڵام لە بیرت نەچێت، تەنیا سبەینێ سلاید دروست دەکات، پاشان پێت دەڵێت، تۆ کار وەردەگری یان نا. لەبەرئەوە ڕێکوپێك بە....'

بۆ سبەینێ بەیانی کە گەیشتمە ئەوی، تێرێنس دۆنۆڤان تەماشای کردم و دەستی کرد بە پێکەنین. 'ئۆی، ئەوە تۆی دووبارە. وەرە بۆ ئێرە. ناوت چییە؟' ئیتر لەو ساتەوە، زۆر ئارام بوو لەگەڵمدا. تێرێنس باوك بوو، زانی کە من منداڵێکی چواردە

ساڵم و پێویستیم بە یارمەتی هەیە. چای بۆ هێنام و هەموو کارەکانی، وێنەی ئەو کچە زۆر جوانانەی لە جیهاندا کە گرتبووی، نیشاندام. 'چاکە. کۆمەڵێك وێنەی تریشت پیشان دەدەم. وەرە لەگەڵمدا.' بردمی بۆ ژوورێکی تر، کە پڕ بوو لە ڕەفە و چەکمەجە و ڕۆژژمێرێك لەسەر مێزێك کەوتووبوو. پەڕە پەڕە هەڵیدایەوە و لە ناو هەر پەڕەیەکدا وێنەی کچێکی جوانی دڵفڕێنی تیادابوو. 'ئەمە دەبینی؟ ڕۆژژمێری پیرێلی کۆتایی ساڵە. هەموو ساڵێك دەیکەم. بەڵام ئیمساڵ جیاواز دەبێت - تەنیا ژنانی ئەفریقی دەبن. هەندێکیان بە جلەوە دەبن و هەندێکیان جلیان لەبەردا نابێت.' هەموو شتێکی پیشان دام، بۆی ڕۆشن کردمەوە کارەکە چۆن دەچێتە پێشەوە. ئیتر لەو کاتەدا ئاسودە بووم کە ئەم کەسە پیاوێکی پیری خراپی تەڵەکەباز نییە. ئینجا پێی وتم، 'چاکە، ئێستا ئێمە نیازمان هەیە سلاید بگرین. ئایا ئامادەی؟'

هەر لەو کاتەوەی کە ڤیرۆنیکا پێی ڕاگەیاندم چی دەکەم، من ئامادەبووم، بەڵام ئێستا تەواو ئاسودەبووم. 'بەڵێ، من ئامادەم.' ئیتر لەو ساتەوە پیشەگەرێکی تەواو بووم. لە سەر زەویەکە ڕاوەستام - بەبێ بەشی سەرەوە - و بە متمانەوە تەماشای کامیرەکەم دەکرد. جوانە! کاتێك کە سلایدەکەی نیشان دام، ئەفریقای بیرخستمەوە کە لەوێ دەژیام. کلیپەکە ڕەش و سپی بوو، ئاسایی و ڕاستەقینە - نە ڤێزهێنەر بوو نە هەست بریندارکەر، نە پەیوەندییەکی بە پۆرنۆگرافییەوە هەبوو. بەڵکو ئەو واریسە بوو کە لە بیابان گەورە بووبوو، هەر وەك کچێکی منداڵ وابوو، لەبەر گەرمادا مەمکە بچکۆلەکانی دیار بوو.

شەو کە گەیشتمە ماڵەوە، لەلایەن ئاژانسەکەوە پەیامێکم پێگەیشت کە پێی ڕاگەیاندم، کارەکەم وەرگرتووە و هەفتەی داهاتوو دەچم بۆ گەرماوەکە. ڤیرۆنیکا ژمارەی تەلەفونی ماڵەوەیانی بۆ بەجێهشتبووم. تەلەفونم بۆ کرد بۆم باسکرد، کە لە مەکدۆناڵد کار دەکەم و ناتوانم دەستی لێهەڵبگرم، چونکو بۆم ڕۆشن نییە، پارەی

کاری مانیکان کەی وەردەگرم. بەڵام ڕزگاری کردم بەوەی کە پێی وتم، دەتوانم لەپێشدا پارەکە وەرگرم.

لەو ڕۆژەوە ئیتر پێم نەخستەوە ناو مەکدۆناڵد. هەر کە لە قسەکردن بوومەوە لەگەڵ ڤێرۆنیکا، کەوتمە گەڕان بە ناو وایئمسینەیدا، نەك هەر بۆ هاوڕێکانم بەڵکو بۆ هەر کەسێکی بێگانە کە گوێ بیستی قسەکانی من بوو، باسی پڕۆژە تازەکەی خۆمم بۆ کردن. حالو وتی، 'هەر ئەم بەزمەت کەم بوو، دەی تەواوی کە، بەڕاستی مەمکەکانت پیشان دەدەی؟'

'ئەی چۆن، بۆ هەزار و پێنج سەد پاوەند!'

'بۆ ئەو شتە بچوکانە؟ کچێ شەرم بکە،' بە پێکەنینەوە دەیوت.

'بەڵام ئەمە ئەوە نییە کە تۆ مەبەستتە. ئەمە بەڕاستی شتێکی جوانە. شتێکی ڤێزهێنەر نییە ... و دەچین بۆ گەرماو و لە هوتێلێکی گەورە دەمێنینەوە.'

'باشە، ئیتر نامەوێ گوێم لەمە بێت - تەواو بەسە، ئیتر هەموو کەس تێمەگەیەنە لە بیناکەدا، تێگەیشتی؟'

شەوی پێش سەفەرەکەم خەو نەچووە چاوم، حەزم دەکرد زوو بەیانی بێت، کۆڵەپشتییەکم ئامادە کردبوو لەبەردەم دەرگاکەدا دامنابوو. هێشتا نەمدەتوانی باوەڕ بەمە بکەم - هەرگیز بۆ هیچ شوێنێك نەچووبووم ئێستا ئەم خەڵکە پارەم پێدەدا بۆئەوەی بچم! تێرێنس دۆنۆڤان لیمۆزینێك دەنێرێ و لێرە هەڵمدەگرێ و دەمبات بۆ ئێستگای ڤیکتۆریا. لەوێ گروپی - وێنەگران، یارمەتیدەران، بەڕێوەبەری هونەری، چوار مانیکان، مکیاجکەرێك، قژ چاکەرێ و من - کۆدەبینەوە و سواری شەمەندەفەر دەبین بۆ گەرماو. من یەکەم کەس بووم کە گەیشتمە ئەوێ، چونکە زۆر نیگەرانی ئەوە بووم شەمەندەفەرەکە لە دەستبدەم. دووەم کەس کە گەیشت ناوی کامپبێل بوو.

کە گەیشتینە گەرماوەکە، لە هۆتێلی رۆیالتۆن تۆماریان کردین، کە لە کۆشك دەچوو. سەرسام بووم بەوەی کە ژوورێکی گەورەیان تەنیا بە خۆم دابوو. بەڵام یەکەم شەو ناۆمی هات بۆ ژوورەکەم و داوای لێکردم، کە دەتوانێت لەگەڵ مندا بنوێت. کچێکی زۆر گەنج و جوان بوو، تەمەنی شانزە یان حەڤدە ساڵ بوو، دەترسا بە تەنیا بێت. پێم وت، بێگومان چونکو پێم خۆش بوو یەکێکم لەگەڵدا بێت. `پێیان مەڵێ، باشە؟ چونکو شێت دەبن ئەگەر بزانن بە خۆڕایی پارە دەدەن بە ژوورێك و کەسی تیادا نانوێ.`

`نیگەران مەبە لە ژووری من بە.` پاش چەندەها ساڵ ئەزمون، ئاسایی بوو دەوری دایکایەتی ببینم. لە ڕاستیدا هاورێکانم بە دایە بانگیان دەکردم، چونکو هەردەم ویستوومە دایکی هەموو کەس بم. `من هیچ شتێك ناڵێم، ناۆمی.`

بۆ بەیانی کە دەستبەکار بووین، لەپێشدا دوو کچمان چوو بۆ مکیاج و قژ چاکردن. پاشان، ئەمانە وێنەیان لێگیرا هاوکات دوو کچی تر بران بۆ ئامادەکردن، تا هەموو کۆتاییان هات. یەکەم بەیانی کە قژ چاکەرەکە کەوتە قژ چاکردنی من پێم وت، کە تەواو قژم کورت کاتەوە. لەو کاتەدا هەوڵی بوون بە مانیکانم زۆر تیادا بەهێزبوو. گۆشتی چەوری مەکدۆناڵد کاری تێکردبووم. لەبەرئەوە دەمویست قژم زۆر کورت بێت تا زیاتر وەك مۆدێرن و نوێ بنوێنم. قژچاکەر کەوتە برینی قژم تا زۆر کەمی پێوە مایەوە نزیکی ئینجێك لە هەموو لایەکی قژمەوە مایەوە. هەموو بێیان وتم، `ئۆییی، زۆر گۆڕاوی.` بەڵام لە ڕاستیدا بڕیارم دابوو، خەڵك سەرسام بکەم و بە قژچاکەرەکەم وت، `دەزانی من چیم دەوێت؟ دەمەوێ ڕەنگی قژم کاڵ بێت.`

`نۆی نا! نیازم نییە ئەوە بکەم. وەك کەسێکی بەدخو دەردەچیت - شێت!`

ناۆمی کامپبێل پێکەنی و وتی، 'واریس دەزانی؟ ڕۆژێك دێت ناوبانگ پەیدا دەکەیت. وە تۆ نابێت منت لەبیربچێت، باشە؟' بێگومان بە پێچەوانەوە دەرچوو، ئەو ناوبانگی زیاتر دەرکرد.

بۆ ماوەی شەش ڕۆژ بەم شێوەیە کارمان کرد و باوەڕم نەدەکرد، لەبەرامبەر ئەمەدا پارەمان پێدەدەن. هەر کە ئێواران کارمان تەواو دەبوو، کۆمەڵەکە پرسیاریان لێدەکردم، دەمەوێت چی بکەم، هەردەم وەڵامم یەکێك بوو: دەچم بۆ شت کڕین. لیمۆزین و شۆفێرەکەیان پێدەدام، لەهەر کوێیەك بمویستایە دایدەبەزانم، پاشان دەهاتەوە هەڵی دەگرتم. کاتێك کارەکە تەواو بوو، وێنەیەکی من هەڵبژێردرا بۆ سەر بەرگەکەی، کە مایەی سەرسامی و جێگای شانازیم بوو، وە بەمە وێنەی من زیاتر بڵاوبۆوە.

بە شەمەندەفەر گەڕاینەوە بۆ لەندەن، هەر کە گەیشتم یەکسەر سواری لیمۆزین بووم و شۆفێرەکە لێی پرسیم لە کوێ دات بەزێنم. پێم وت لە ئاژانس. هەرکە پێم نایە دەرگاکەوە پێیان وتم، 'بیخەملێنە چی هەیە؟ بۆ تۆ نمایشێکی تر هەیە و هەرئێستا لە سوچی ئەوسەرەوە. بەڵام خێراکە - دەبێت هەر ئێستا بڕۆی.'

لەسەر ئەمە نارەزایەتیم دەربڕی، چونکو هیلاك بووم. 'سبەینێ دەچم،' پێم وتن.

'نا، نا. سبەینێ زۆر درەنگە، لەسەرو ئێرەوەیە. بەدوای کچەکانی بۆندا دەگەڕێن بۆ فیلمی تازەی جێمس بۆند[4]، زە لیڤین دەیلایتس[5]، لەگەڵ تیمۆسی دالتۆن[6]. جانتاکەت لێرە جێهێڵە و با بڕۆین. لەگەڵت دێین تا ئەوێ و شوێنەکەت پیشان دەدەین.'

پیاوێك لە ئاژانسەکە منی بە دەوری سوچەکەدا برد و ئامآژەی بە خانوویەك کرد. 'ئەو دەرگایە دەبینی، کە ئەو خەڵکە دەچنە ژوورێ؟ ئەوە شوێنەکەیە.'

چوومە ژووری و بینیم دووبارەکردنەوەی ئەو ڕۆژە بوو، کە چووم بۆ ستودیۆی تێرانس دۆنۆڤان، بەڵام خراپتر. سوپایەك لە کچ ڕاوەستابوون، پاڵیان بە دیوارەوە دابوو، دانیشتبوون، قسەیان دەکرد و پۆزیان لێدەدا.

یاریدەدەرێك پێی وتم، "داوا لە هەموو کەسێك دەکەین چەند وشە بڵێ." ئەم هەواڵە وەك شتێکی شووم هاتە بەرچاوم، بەڵام کەوتمە پرسیار کردن لەخۆم، هەر ئێستا من پیشەگەرێکی مۆدێلم؟ من کارم کردووە بۆ تێرێنس دۆنۆڤان بۆ ڕۆژژمێری پیرێلی. ئەمە هیچ نییە تا نەتوانم دەستی بۆ بەرم. کاتێك نۆبە هاتە سەر من، پێشانیاندام بچمە ناو ستودیۆوەکەوە و لەسەر نیشانەیك ڕایان وەستاندم.

پێموتن، "کوڕینە دەمەوێ ئەودتان پێبڵێم کە من ئینگلیزییەکی زۆر باش قسە ناکەم."

کارتی ئاگادارکردنەوەیان بەرز کردە و وتیان، "ئەوە قەیناکات، تەنها ئەمە بخوێنەرەوە." *ئەی خوایە ئێستا چی؟ دەبێت پێیان بڵێم کە ناتوانم بیخوێنمەوە؟ نا، ئەمە زۆر دەبێت. ئەمە زۆر حەیابەرەیە، ناتوانم ئەمە بکەم.*

لەجیاتی ئەوە وتم، "لێم ببوورن. دەبێت بڕۆم - هەرئێستا دەگەڕێمەوە." لە بیناکە هاتمە دەرەوە و چووم بۆ ئاژانس بۆ هەڵگرتنی جانتاکەم. خوا دەیزانی، چەند خۆپیشاندەر چاوەڕوانی منیان کردووە تا یەکێك ئاگادار دەبێتەوە، کە من ناگەڕێمەوە؟ لە ئاژانسیش بە خەڵکەکەم وت، هێشتا سەرەم نەهاتووە، تەنیا بۆ ئەوە هاتووم جانتاکەم بەرم، چونکو لەوە دەچێت سەرەیەکی دوورودرێژ بێت. ئەمە نزیکەی یەك و دووی پاش نیوەڕۆ بوو، بەڵام من گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و جانتاکەم دانا. پاشان چووم بۆ لای قژچاکەر. نزیك وایئمسیئەی خۆم کرد بە دوکانێکدا و پیاوێکی بەڕێز پرسیاری لێکردم، چی دەتوانێت بکات بۆم.

"ڕەنگی قژم کاڵ بکە." وەڵامم دایەوە

قژچاکەرەکە برۆکانی بەرزکردەوە. 'چاکە، دەزانیت ئێمە ئەو کارە دەکەین، بەڵام کاتی زۆر دەوێت و ئێمە کاتژمێری هەشت ناړایشتگا دادەخەین.'

'چاکە. تا هەشت کاتمان هەیە.'

'وایە، بەڵام خەڵکی تر لەپێشتەوەیە.' لێی پاڕامەوە تا لە دوایدا ڕازی بوو. پیرۆکسایدی[7] ی ڕژاند بەسەرمدا، یەکسەر پەشیمان بوومەوە، لەوەی کە لێی پاڕاومەتەوە بۆم بکات. قژم کورت بوو، کەرەسە کیمیاوییەکە سەری دەسوتاندم و هەستم دەکرد پێستێك لەسەرم دەبێتەوە. بەڵام دانم بەخۆدا گرت تا تەواو بوو. کاتێك قژچاکەرەکە قژی شتم، ڕەنگی قژم بووبوو بە پرتەقاڵی. لەبەرئەوەی دەبوو جارێکی تر پیرۆکسایدەکە بەکاربهێنێتەوە، بۆئەوەی ماوەیەکی درێژتر بمێنێتەوە بۆ لابردنی ڕەنگی قژم. دووەم جار بوو بە زەرد. سێیەم جار ڕەنگی کاڵەکەی هێنا.

پێمخۆش بوو، بەڵام کاتێك لە ڕێگادا بووم بەرەو میترۆ، منداڵانی بچوك دەستی دایکیان دەگرت و هاواریان دەکرد، 'دایە، دایە، دایە، ئەو شتە چییە؟ ئەوە پیاوە یان ژنە؟' بیرم دەکردەوە، *نەفرەتم لێدەکەن، لەوانەیە هەڵەم کردبێت؟ منداڵان دەترسێنم.* بەڵام کاتێك گەیشتمە وای، بڕیارم دا پشتگوێی بخەم، چونکو قژم ئەوە نەبوو جێگای سەرنجی منداڵان بێت. قژ کاڵبوون شتێك بوو دەمویست تاقیبکەمەوە و لەو باوەڕەدا بووم زۆر زۆر جوان بێت.

کاتێك گەیشتمە ماڵەوە، پەیام لەسەر پەیام بۆم هاتبوو لە ئاژانسەوە: *لە کوێی؟ هەمووکەس لە شوێنی نمایشەکە چاوەڕوانت دەکات. دەگەڕێیتەوە؟ هێشتا دەیانەوێ بتبینن. هێشتا چاوەڕوانن...* بەڵام ئاژانس داخرابوو، لەبەرئەوە تەلەفونم بۆ فێرۆنیکا کرد لە ماڵەوە. 'واریس، ئەوە چووی بۆ کوێ؟ لەو باوەڕەدا بوون چووی بۆ حەمام! پەیمانم پێبدە بەیانی دەگەڕێیتەوە؟' ڕازی کردم سبەینێ بەیانی بگەڕێمەوە.

بێگومان، ئەوەم بە ڤێرۆنیکا نەوت، نمایشکەرەکان یەکسەر سەرنجیان دا: دوێنێ ژنێکی ڕەشی ئاسایی بووم، ئیمڕۆ سۆماڵییەك بە قژێکی کاڵەوە. هەموو لە کار وەستان بۆ تەماشاکردنی من. 'واو! چەند سەرسوڕهێنەرە - دوێنێ شەو ئەمەت کرد؟'

'بەڵێ'

'ئۆی، جوانە. حەزم لێیەتی جارێکی تر نەیگۆڕیت، باشە؟'

پێم وتن، 'باوەڕم پێبکەن، بەم زووانە خۆم تووشی ئەم ئەشکەنجەیە ناکەمەوە. ئێستا ئیتر بێخی قژیشم کاڵە.'

دوێنێ لەکوێدا وەستابووین، دەستمان پێکردەوە. 'ئیگەرانی زمانە ئینگلیزیەکەتی ئەوە گرفتەکەیە؟'

'بەڵێ.' هێشتا نەمدەتوانی دان بەوەدا بنێم، کە ناتوانم بخوێنمەوە.

'باشە. تەنیا لەوێدا ڕاوەستا، تەماشای ڕاست بکە، تەماشای چەپ بکە. ناوی خۆت بڵێ. لەکوێوە هاتووی، لەگەڵ چ ئاژانسێکدا کار دەکەیت و ئەوە هەموویەتی.' هەر ئەوەم دەتوانی.

پاش ئەوە، چونکو لەوناوە بووم، لە کراوفۆرد، بڕیارم دا، ناخۆش نابێت سەرێکی ئاژانس بدەم و قژی خۆمیان پیشان بدەم. هەموو تێکچوون. 'چ بەزمێکت بە قژی خۆت کردووە!؟'

'جوانە، وا نییە؟'

'نا ئەی هاوار، جوان نییە! ناتوانین ناونووست بکەین بۆ کاری تر! دەبوایە لەگەڵ ئێمە قسەت بکردایە، پێش ئەوەی شتێکی وەك ئەمە بەسەر خۆت بهێنی، واریس. کڕیار دەبێت بزانێت چی بەدەست دەهێنێ - ئەوە ئیتر تەنیا قژی خۆت نییە، چیت پێخۆش بێت بەسەری بهێنی.'

هەرچی چۆنێك بوو، نمایشکەرەکان قژی منیان پێ جوان بوو و کارەکەم وەرگـرت وەك کچی بۆنـد. بـەڵام لـەو ڕۆژە بـەدواوە، خـەڵکی ئـاژانس نازنـاوی: جینـێس[8] یـان لێنام. چونکو خۆم ڕەش بووم بە سەرێکی سپییەوە.

زۆر دڵخۆشـبووم بـەم کـارە تازەیـەی سـینەما، تـا ڕۆژێکیـان چـووم بـۆ ئـاژانس و ڤێرۆنیکا پێی وتم، 'چاکە واریس، هەواڵێکی خۆش. زە لیڤین دەیلایت، لە مەراکیش فیلمەکەی دەگیرێت.

لەشم گرژبوو. 'دەزانیت، دەبێت شتێك بە تۆ بڵێم، بـە داخـەوە لەڕاسـتیدا حـەزم نەدەکرد ناچار بم پێت بڵێم. بیرتان دێت ئەو ڕۆژەی منتان بەکرێ گرت، پرسیارتان لێکردم پاسپۆرتم هەیە؟ بەڵێ هەمە، بەڵام ڤیزەی مانەوەم تەواو بووە، وە ئەگەر لـە بەریتانیا بچمە دەرەوە، ناتوانم بگەڕێمەوە.'

'واریـس، درۆت لەگـەڵ مـن کـردووە! دەبـوو پاسـپۆرتی یاسایـیت هـەبێت تـا کـاری مانیکان بکەیت، ئەگینا تۆ بە کەڵکی ئێمە نایەیت، هەمیشە دەبێت لە سـەفەرکردنـدا بیت. تۆ ناتوانی ئەو کارە بکەیت. ئێمە دەبێت ئەوە هەڵوەشێنینەوە.'

'نا، نا. ئەوە مەکە - بیر لە شتێك دەکەمەوە. شتێك دەکەم.' ڤێرۆنیکا بێباوەڕانـە تەماشای کردم، بەڵام وتی، ئیتر ئەوە پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە. بۆ چـەند ڕۆژ لـە ماڵەوە دانیشتم و بیرم کردەوە و بـیرم کـردەوە و هـیچ شـتێك بـە خـەیاڵمـدا نـەهات. لەگـەڵ هاوڕێکانمـدا کەوتمـە قـسەکردن، بـەڵام ڕێگـا چارەیان تـەنها لـە شـووکردنـدا لەگـەڵ یەکێکـدا دەبینیـەوە، گومـانی تیـادا نـەبوو، کەسـم نـەبوو شـووی پێبکـەم. غەمناکی دایگرتم، نەك هەر لەبەرئەوەی پیشەکەم لە دەستدەدا، بەڵکو لەبەرئـەوەی درۆم لەگەڵ ڤێرۆنیکا کردبوو، هەموو خەڵکی ئاژانسەکەم نیگەران کردبوو.

شەوێکیان لەوپەڕی نیگەرانیمدا بـووم، چـوومە خـوارەوە بـۆ شـوێنی مەلـەی واى. هاوڕێکـەم مـارلین، کـە کـچێکی ڕەش پێـست بـوو لـە لەنـدەن دەژیـا، کـاری مەلـەوانی ڕزگارکەری دەکـرد لـەوێ. یەکـەم جـار کـە هاتمـە واى، دەهـاتم بـۆ شـوێنی مەلەکـە و

تەنها دادەنیشتم و تەماشام دەکرد، چونکو ئاوم خۆشدەویست. لە کۆتاییدا شەوێکیان مارلین لێی پرسیم، کە بۆچی ناچمە ناو ئاوەکەوە، منیش پێم وت کە ناتوانم مەلە بکەم. 'باشە، من دەتوانم فێرت بکەم،' مارلین پێی وتم.

'چاکە.' چوومە سەرحەوزە قووڵەکە، هەناسەیەکی قووڵم وەرگرت و خۆم هەڵدایە ناوی. چونکو ئەو مەلەوانی ڕزگارکەر بوو، لەو باوەڕەدا بووم دەتوانێت ڕزگارم بکات. بەڵام بیخەملێنە چی ڕوویدا؟ لەژێر ئاوەکەدا وەك ماسی کەوتمە مەلەکردن بۆ ئەو سەری حەوزەکە.

بە زەردەخەنەیەکی گەورەوە هاتمە سەر ئاوەکە. 'کردم! ناتوانم باوەڕ بکەم، کردم!'

بەڵام ئەو تووڕە بوو. 'بۆچی پێم دەڵێیت نازانم مەلە بکەم؟'

'لە ژیانمدا مەلەم نەکردووە!' لەپاش ئەو بەزمە، بووین بە هاوڕێیەکی باشی یەکتری. لەگەڵ دایکی دەژیا لەوپەڕی شار، هەندێك جار، کە شەو درەنگ کاری تەواو دەبوو، ئەگەر بگەڕایەتەوە ماڵەوە، زۆر هیلاك دەبوو، لەبەرئەوە لەلای من دەمایەوە.

مارلین کەسێکی چاك و بەخشندە بوو، ئێوارەیەکیان کە لەوێ مەلەم دەکرد و هەوڵم دەدا گرفتی پاسپۆرت لە بیر خۆم بەرمەوە، ڕێگا چارەیەکم بۆ هات. هاتمە دەردوە و عەینەکە مەلەوانییەکەمم بەرز کردەوە. 'مارلین،' هەناسەیەکم دا، 'پێویستم بە پاسپۆرتەکەی تۆ هەیە.'

'چی؟ لەبارەی چییەوە قسە دەکەیت؟' گرفتەکەی خۆمم بۆ باس کرد. 'ئەوە تۆ نەقلی خۆتت لە دەستداوە، واریس! دەزانی چ بەزمێکمان بەسەر دەهێنی؟ تۆ دەگرن، بۆ هەتا هەتایە دیپۆرتت دەکەنەوە، منیش ڕەوانەی بەندیخانە دەکەن. ئەم هەموو بەزمە لەبەر خاتری چی؟ بۆ ئەوەی لە فیلمێکی کەرانەی جێمس بۆندا بیت؟ لەو باوەڕدا نییم.'

'دەی مارلین. خۆشە، سەرکێشییەکە - ئەم هەنگاوە بنێ. دەچین بۆ نووسینگەی پۆست، داوای پاسپۆرت دەکەم بە ناوی تۆوە، ئیمزای تۆیان پێدەدەم لەگەڵ وێنەی خۆم. من کاتم زۆر نییە، بەڵام دەتوانم پاسپۆرتێکی کاتی، تەنیا لە دوو ڕۆژدا دەربهێنم. *تکات لێدەکەم مارلین!* هەلێکی گەورەیە بۆئەوەی لەو فیلمەدا بەشداری بکەم.'

لە کۆتاییدا پاش چەندەها کاژێر داوا و پاڕانەوە، ڕۆژێك پێش فڕینم بۆ مەراکیش، ڕازی بوو. پاش ئەوەی وێنەیەکەم گرت، پێکەوە چووین بۆ نووسینەگەی پۆست، لە ماوەی یەك کاژێردا بووم بە خاوەنی پاسپۆرتی بەریتانی. بەڵام لە تەواوی ڕێگا تا ماڵەوە، مارلین تەواو نیگەران بوو. بەردەوام پێم دەوت، 'دەی مارلین، گوێمەدەرێ، باش دەبێت. دەبێت باوەڕت هەبێت کە دەکرێت.'

'باوەڕم بە چی هەبێت. لەو باوەڕەدام بەزمێکی وا کەرانە دەتوانێت هەموو ژیانم تێکبدات.' ئەو شەوە، هەردووکمان چووین بۆ ماڵی دایکی بۆئەوەی پێکەوە بین. پێشنیارم کرد، فیلمێکی ڤیدۆیی بەکرێ بێنین، خواردنێکی چینی لەگەڵ خۆمان بەرینە ماڵەوە و ئاسایی وەریگرین. بەڵام کاتێك چووینە ماڵەوە، مارلین وتی، 'واریس. من ناتوانم ئەوە بکەم. زۆر مەترسیدارە. پاسپۆرتەکەم بەرەوە.' بەداخێکی زۆرەوە دامەوە دەستی، خەیاڵی پێشەگەری سینەما وەك دوکەڵ چوو بە ئاسماندا.

'تۆ لێرە دەمێنیتەوە - من دەچم دەیشارمەوە. چوو بۆ ژوورەکەی خۆی لەسەرەوە.

پێم وت، 'کچێ باشە. ئەگەر وا هەست دەکەیت، پێویست ناکات ئازاری خۆت بدەیت. ئەگەر لەو باوەڕەدای شتێك بە هەڵە دەچێتە پێشەوە، پێویست ناکات بیکەین.' بەڵام ئەو شەوە، هەر کە مارلین چاوی چووە خەو، دەستم کرد بە گەڕان بەناو ژوورەکەیدا. بە سەدان کتێبی هەبوو، زانیم لەکوێدا شاردویەتیەوە، یەك بە یەك کتێبەکانیم کردەوە و ڕام وەشاند. بەیانی ئوتومبیل دەهات بۆ ئێرە بە شوێنمدا، بۆئەوەی بمگەیەنێتە فڕۆکەخانە، لەبەرئەوە خێرا کەوتمە خۆ. لەپڕ

پاسپۆرتەکە کەوتەخواردەوە بۆ بەر پێم. بێدەنگ هەڵمگرتەوە و خستمە ناو کۆڵەپشتەکەمەوە، پاشان چوومە ناو جێگاوە. بەیانی هەستام، بە دزییەوە چوومە خواردەوە، پێش ئەوەی شۆفێر بگاتە سەرم و لە جەرەسی دەرگا بدا، خەڵك خەبەر کاتەوە. دەرەوە سارد بوو، بەڵام لە لای جادەکە وەستام، لە سەرماندا هەڵدەلەرزیم تا شۆفێرەکە لە کاتژمێر حەوتدا گەیشت، پاشان چووم بۆ هێسرۆ.

چوونە دەرەوەم لە بەریتانیا بێ گرفت بوو. لە مەراکیش بەشداریم لە دوو دیمەنی فیلمەکەدا کرد، کە یەکێکیان، وەك ئەوەی لە تێکستەکەدا نووسرابوو، من "کچە جوانەکە لەلای حەوزەکە پاڵکەوتووە"بوو. لە ئەوی تریاندا، هەموومان لە ناو خانوویەکی جواندا لە کاسابلانکا، دانیشتوین و چا دەخۆینەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ژنەکان لەبەر چەند هۆیەك ڕووتن. جێمس بۆند بەناو بنمیچەکەدا دەفڕێت و ئێمەش دەست بەرزدەکەینەوە و دەموچاوی خۆمان دەگرین و هاوار دەکەین، "ئاه، ئەی هاوار!" بەڵام من لە دڵی خۆمدا وتم، *چاکە، من هیچ سکاڵایەك ناکەم، چونکو من هیچ دەورێك لە قسەکردندا نابینم، مەبەستم ئەوەیە، نابێت خۆم سەرزەنشت بکەم لەبارەی ئەوەی ناتوانم بخوێنمەوە.*

باقی کاتەکان خۆمان دەدایە بەر هەتاو، لە تەنیشت حەوزەکە دادەنیشتین و هەر دەمان خوارد بەبێ ئەوەی هیچ کارێك بکەین. تەواوی کاتەکە خۆم دەدایە بەر هەتاو، زۆر چێژم لێدەبینی دووبارە بیبینمەوە، پاش ئەوەی لە لەندەنی پڕ تەمومژدا ژیابووم. لەبەرئەوەی نەمدەزانی چۆن هەڵسوکەوت بکەم لەگەڵ ئەوانەی بۆ فیلمەکە هاتبوون، زۆربەی کات بە تەنیا بووم، ئەوان زۆر جوان و دڵفڕێن بوون، ئینگلیزییەکی تەواویان دەزانی و لەوە دەچوو یەکتری بناسن - لەبارەی شتی جۆراوجۆرەوە قسەیان دەکرد. من هەر لە شوروشەوقی ئەوەدا بووم بگەڕێمەوە بۆ ئەفریقا، لە ئێوارانда بچمە دەرەوە و دانیشم لەگەڵ دایکان کە خەریکی ئامادەکردنی

چێشتی جۆراوجۆرن بۆ خێزانەکانیان. نەمدەتوانی بە زمانەکەیان قسە بکەم، بەڵام زەردەخە دەیگرتین و من وشەیەکم بە عەرەبی دەوت و ئەوان وشەیەکیان بە ئینگلیزی دەوت و هەموومان پێدەکەنین.

ڕۆژێکیان گروپی فیلمەکە هاتن بۆ لامان و وتیان، 'پێشبڕکێی حوشتر سواری هەیە، کێ دەیەوێت بچێت؟ با بێت، ئێمە کۆیان دەکەینەوە.' پاش ئەوەی ڕاوەستاین و بۆ ماوەیەك تەماشای پێشبڕکێکەمان کرد، لە یەکێك لە سوارچاکە عەرەبەکانم پرسی، کە منیش دەتوانم سوار بم. بە تێکەڵەیەك عەرەبی و ئینگلیزی کەوتینە قسەکردن، پێی ڕاگەیاندم، کە نا ژنان بۆیان نییە سواری حوشتر بن.

'با بیکەینە گرەو، لێت دەبەمەوە،' پێم وت. 'زوو کە، پیشانت دەدەم - ترست لە من هەیە سوار بم، چونکو لێت دەبەمەوە!' ئەمە ئەوی کەللەیی کرد - ئەو کچە بچکۆلەیە بەرامبەرکێ لەگەڵ مندا دەکات - پاش ئەوە ئیتر بڕیاری دا بەشداری پێشبڕکێکە بکەم. لەناو گروپی فیلمەکەدا هەواڵەکە بڵاوبۆوە، پێشبڕکێی داهاتوو واریس بەشداری دەکات، هەموو لێم کۆبوونەوە و هەندێك کەس هەوڵیان دا پەشیمانم بکەنەوە. هەموویانم ئاگادارکردەوە، کە پارەکانیان بهێنن و لەسەر واریس گرەوو بکەن، چونکو دەرسی هەموو سوارچاکە مەراکیشییەکان دادەدەم. لەگەڵ مندا، نزیکەی دە عەرب سواری حوشترەکانیان بووبوون لەسەر هێڵی دەست پێکردن. کە پێشبڕکێکە دەستی پێکرد، بۆی دەرچووین. چونکو ئاشنا نەبووم بەو حوشترەی کە سواری بووبووم، لە ڕاستیشدا نەمدەزانی چۆن نەقیزەی لێبدەم، سوارییەکەم زۆر ترسناك بوو. حوشتر لە کاتی غاردانیدا، ڕێك بۆ پێشەوە ڕاناکات، بەڵکو بەرز و نزم دەبێتەوە و ئەم لا و ئەو لا دەکات، لەبەرئەوە زۆر قایم خۆم ڕاگرت. دەمزانی ئەگەر بکەومە خوارەوە، لە ژێر پێلەقەدا گیانم دەردەچێت.

کاتێك پێشبڕکێکە تەواو بوو، دووەم دەرچووم. خەڵکەکەی جێمس بۆند سەرسام بوون. بەچاوی خۆم بینیم، لە لایان ڕێزم زیاتر بوو، بە تایبەتی کە گرەوەکەیان بردەوە. 'چۆنت زانی ئاوا دەیبەیتەوە؟' کچێکیان پرسیاری لێکردم.

'ئاسانە. کاتێك تۆ بەسەر حوشترەوە لەدایك بوویت، فێر دەبی چۆن سواری بی،' دەستم کرد بە پێکەنین.

هەرچی چۆنێك بوو، پێشبڕکێی حوشتر هیچ ئازایەتییەکی نەدەویست، لەچاو ئەودی کاتی گەڕانەوە، چی چاوەڕوانی دەکردم لە فڕۆکەخانەی هێسرۆ. لە فڕۆکەکە هاتینە خواردوە و سەردمان گرت بەردو کۆنترۆڵ، سەرەکە زۆر هێواش دەچووە پێشەوە، هەرکەس پاسپۆرتەکەی بە دەستەوە گرتبوو. فەرمانبەرەکە هاواری دەکرد، 'یەکێکی تر!'، هەر هاوارێك گیان کێشانێك بوو بۆ من، چونکو هەنگاوێ نزیکتر دەبوومەوە لە گرتن.

فەرمانبەرانی ئینگلیزی هەردەم سەختگیرن لەگەڵ هەرکەسێ کە دێتە ناوەوە، بەڵام ئەگەر کەسەکە ئەفریقی و ڕەش پێست بێت، ئەوا دوو بەرابەر سەختگیرتر دەبن. بە چاوێکی گومانەوە تەماشای پاسپۆرتەکەی دەکەن. لە ترسا خەریك بوو دەبوورامەوە - دەمهێنایە بەرچاوی خۆم، چۆن دەکەومە سەر زەویەکە و دەمرم، چونکو لەمە زیاتر توانای ئازارکێشان نەدەما. دەستم کرد بە دوعا خوێندن، *خوایە یارمەتیم بدە، ئەگەر لەمە ڕزگارم بێت، بەڵێنت دەدەمێ هەرگیز کاری وا کەرانە ناکەمەوە.*

نزیك ئەوێ بووبوومەوە، ئەگەر قاچم لەژێرمدا لوول نەبێت. لەپڕ کوڕێکی دزێوی مۆدێل، بەناوی جیۆفری، پاسپۆرتەکەمی لە دەست سەندم. کەسێکی تەواو خراپ بوو، لە ئازاردانی کەسانی تر خۆشی دەبینی، ئەم جارە لە من پەککەوتەتری نەدۆزییەوە. 'ئۆی، تکات لێدەکەم، تکات لێدەکەم -' هەوڵمدا لە دەستی بسێنمەوە،

بەڵام ئەو زۆر درێژتر بوو لە من و پاسپۆرتەکەمی بەرزکردەوە، کە نەتوانم دەستم پێی بگات.

تەواو ئەو کەسانەی کە لە سەفەرەکەدا لەگەڵمدا بوون بە ناوی واریسەوە بانگیان دەکردم، هەموو دەیان زانی ناوم واریس دیریەیە. جیۆفری پاسپۆرتەکەمی کردەوە و هاواری کرد، 'گوێگرن بۆ ئەمە، هەموو گوێگرن بۆ ئەمە. بیخەمڵێنن ناوی چییە؟ مارلین مۆنرۆ.'

'تکات لێدەکەم بیدەرەوە دەستم -' ئیتر هەموو گیانم کەوتە لەرزین.

بەوناوەدا دەستی کرد بە ڕاکردن و ئەوپەڕی پێکەنین، پاشان کەوتە پیشاندانی پاسپۆرتەکەم بە کۆمەڵەکە. 'ناوی مارلین مۆنرۆیە! ئەمەتا سەیریکە! ئەوە چییە؟ ئەم بەزمە چییە، کچەکە؟ جێی پرسیار نییە کە قژت کاڵ کردۆتەوە!'

هەر ئاگاداری ئەوە نەبووم کە مارلین مۆنرۆیەکی تر هەیە. لای من ئاسایی هاوڕێکەمە، مەلەوانی ڕزگارکەر لە وای. خۆشبەختانە لەم نیگەرانییە بێخەبەر بووم، کە بە پاسپۆرتێکەوە دەسوڕێمەوە، بە وێنەی خۆم و ناوی ئەستێرەیەکی بەناوبانگی سینەماوە. لەو ساتەدا، گەورەترین گرفتم بوو، بەوەی کە پاسپۆرتەکەم دەڵێت ناوم مارلین مۆنرۆیە، لە لەندەن لەدایك بووم، کەچی بەئاستەم ئینگلیزی قسە دەکەم. مردم ... تەواو ... مردم ... تەواو ئەم وشانە بەناو مێشکمدا هاتوچۆی بوو و هەموو گیانم کەوتە سەر ئاو.

هەموو کۆمەڵی جێمس بۆند پەیوەست بوون بەم یارییەوە، 'باشە دەی، ناوی ڕاستەقینەت چییە؟ دەی ئێستا، ڕاستی بڵێ - لەکوێوە هاتووی؟ زانیوتە خەڵکێك لە ناوەڕاستی لەندەندا لەدایك بووبێت و ئینگلیزی قسە نەکات؟' خەریك بوو شێتیان دەکردم. لە کۆتاییدا ئەو جیۆفریە کەرە پاسپۆرتەکەی دامەوە. چوومە دواوەی سەرەکە تا هەموو کۆمەڵەکە لە پێش منەوە بڕۆن، بەو هێوایەی کاتێك سەرە دەگاتە سەر من، ئەوان هەموویان ڕۆیشتبن.

'یەکێکی تر!'

کاتێك کە کۆمەڵی فیلمەکە لە کۆنترۆڵ چوونە دەرەوە، هیچ کەسێکیان نەچوو بە پێی کاری خۆیەوە و ئاسایی لەپاش سەفەرێکی دوور و درێژ سواری ئوتومبیل بن و بڕۆن. نا، هەموو بە کۆمەڵ لە تەنیشت کوشکی کۆنترۆڵەوە وەستان، بۆئەوەی بمبینن چۆن خۆم لەم گرفتە ڕزگار دەکەم.

*دەی خۆت ڕزگارکە، کچێ واریس. تۆ دەتوانی.* چوومە پێشەوە و بە زەردەخەنەیەکی پڕ نازەوە پاسپۆرتەکەمم دایە دەست فەرمانبەرەکە. 'چۆنی!' سلاوم لێکرد، پاشان هەناسەی خۆمم گرت. دەمزانی باشترە لەو وشەیە زیاتر نەڵێم، تا وا بزانێت، ئینگلیزییەکەم هەر زۆر تەواوە.

'ڕۆژێکی خۆشە، وا نییە؟'

'ئممم.' سەرم بۆ لەقاند و زەردەخەنەیەکم بۆ کرد. پاسپۆرتەکەی دایەوە دەستم و بۆی دەرچووم. کۆمەڵی جێمس بۆند لەوێدا ڕاوەستابوون و بەسەرسامییەوە تەماشایان دەکردم. خەریك بوو پەکم دەکەوت، هەناسەم لێدەبڕا و دەکەوتمە سەر زەوی، بەلام بەلایاندا تێم تەقاند، دەمزانی لە مەترسیدام تا لە فڕۆکەخانە دەچمە دەرەوە. *دەی بجوڵێ، واریس. بە زیندوویی لە هیسرۆ بچۆرە دەرەوە.*

---

1. polaroid
2. transparencie
3. Y
4. James Bond
5. The living Daylights
6. Timothy Dalton
7. peroxide
8. Guinness
9. Di

## بەشی دوانزەهەم

## پزیشکەکان

هێشتا لە وایئێمسیئەی دەژیام، نیومرۆیەکیان لە خوارەوە بووم لە هۆڵی مەلەکردنەکە، پاش تەواوبوون، لە ژووری جلگۆڕین خۆمم لەبەرکرد، لە گەڕانەوەم بۆ سەرەوە، گوێم لە یەکێك بوو، لە کافە بچوکەکەی وایەوە، بە ناوی خۆمەوە بانگی دەکردم. کوڕێك بوو دەمناسی کە لە خانووەکە دەژیا. ناوی ولیەم بوو، هێمای بۆ کردم، بچم دانیشم. 'واریس، دانیشە. حەزت لە چییە بیخۆیت؟'

ولیەم سەندویچی پەنیری دەخوارد، پێم وت، 'بەڵێ، دانەیەك لەوەی تۆم دەوێ، بێزەحمەت.' ئینگلیزییەکەم هێشتا هەر هیچ نەبوو، بەڵام بەگشتی دەمتوانی سەردەرکەم لەوەی دەیوت. کاتێك خەریکی خواردن بووین، پرسیاری لێکردم، حەزم لە چوونە سینەمایە. ئەمە یەکەم جار نەبوو، کە داوای چوونە دەرەوەم لێبکات. ولیەم گەنج بوو، قۆز، سپی پێست و هەمیشە بەڕێز. بەڵام کاتێك کە قسەی دەکرد، گوێم نەدا بەوەی دەیڵێت. لەجیاتی ئەوە کەوتمە تەماشاکردنی، لە جوڵانەوەی لێوی وردە بوومەوە و مێشکم وەك کۆمپیوتەر کەوتە کار:

*بچۆ لەگەڵی بۆ سینەما*

*هەر ئەوەندەی بزانێت بە حاڵم*

*ئۆی، بیهێنە بەرچاوی خۆت چی دەبێت ئەگەر هاوڕێیەکی کوڕت هەبێت*

*لەوانەیە خۆش بێت*

*کەسێك بێت قسەی بۆ بکەی*

*کەسێك بێت خۆشی بوێیت*

*بەڵام ئەگەر بچم بۆ سینەما*

*دەیەوێت ماچم بکات*

*پاشان دەیەوێت لەگەڵمدا بێتە جێگاوە*

*وە ئەگەر من ڕازی بم*

*تێدەگات لە کچانی تر ناچم*

*من شێوێندراوم*

*یان ئەگەر ڕازی نەبم*

*لێم تووڕە دەبێت و دەکەوێتە شەڕکردن*

*مەڕۆ*

*ئەوە ناهێنێت دڵت ئازاری پێبگات*

*بڵێ، نا*

*هەر ئەوەندەی بزانێت بە حاڵم، تێدەگات کەڵکی هیچم پێوە نییە.*

زەردەخەنە گرتمی و سەرم بۆ بادا. 'نا، سوپاس. زۆر کارم هەیە، دەبێت بیکەم.' زانیم نیگایەکی ئازاراوییانە دێت، هات و شانم هەڵتەکاند، بە هەردووکمانی ڕاگەیاند: *هیچ شتێك نییە، کردنی لە توانای مندا بێت.*

کاتێك چوومە وای، ئەم گرفتە سەریهەڵدا. کە لەگەڵ خێزانەکەمدا دەژیام، ئاسایی پیاوانی ناناشنای بێگانە هەرگیز بە دەورمەوە نەبوون. ئەو پیاوەی هاتبێت بۆ ماڵی باوکم، یان پورە ساهرو، یان خاڵە محەمەد، بە کەلتوری ئێمە ئاشنا بووە و هیچ هەوڵێکی نەدەدا داوای دیدارم لێبکات، یان لەگەڵ خێزانەکە سەروکاری بووە. بەڵام لەو کاتەوەی ماڵی خاڵم جێهێشت، بە تەنیا بووم. بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا ناچار بووم لەگەڵ هەلومەرجەکەدا خۆم بسازێنم. وای پڕ بوو لە پیاوانی گەنجی زگوردی. چوونە دەرەوەی شەوانە لەگەڵ حالو بۆ یانە، تووشی پیاوانی زیاتر کردم. لە کاری مانیکانیشدا پیاوانی زیاتر.

بەڵام من حەزم لە هیچیان نەبوو. خەیاڵی ئەوەی کە لەگەڵ پیاوێکدا سێکس بکەم، هەرگیز بە مێشکمدا نەدەهات، بەڵام بە داخەوە پاش چەند ئەزمونی تاڵ، ئیتر ئەو خەیاڵە کەوتە سەرمەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە بۆم پرسیار بوو، نەمدەتوانی بیهێنمە بەرچاوی خۆم، ژیانم چۆن دەبوو ئەگەر خەتەنە نەکرامایە. حەزم لە پیاوان بوو، کەسێکی زۆر هەستیار و خۆشەویست بووم. لەو کاتەدا شەش ساڵ بوو لەدەست باوکم هەڵهاتبووم و تەنیایی زۆر سەخت بوو بۆم، بیری خێزانەکەمم دەکرد. هەندێك جاریش ئاواتەخواز بووم هاوسەر و منداڵی خۆمم هەبێت. بەڵام تا بە دوراوەیی بمێنمەوە، دەرگای هەر بیرۆکەیەکی پەیوەندی بە روومدا داخراوە. وەك گرێیەك وابوو، چ فیزیکی و چ هەستی، ڕێگربوون لە چوونە ناوەوەی هەر پیاوێکدا.

گرفتێکی تر کە ڕێگری دەکرد لەبەردەم ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ پیاودا ببەستم، لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کە بۆم دەرکەوت، من جیاوازم لە ژنانی تر، بەتایبەتی ژنانی ئینگلیزی. پاش ئەوەی گەیشتمە لەندەن، وردە وردە تێگەیشتم، ئەوەی بەسەر من هاتووە بەسەر هەموو کچێك نەهاتووە. کاتێك کە لەگەڵ پورزاکانمدا بووم لەماڵی خاڵە محەمەد، هەندێك جار ڕێکدەکەوت، لەگەڵ کچەکاندا لە گەرماودا بم. جێگای سەرسامیم بوو، کە دەمبینین چۆن بە خوڕی و خێرا میزەکەیان دەکەن، کەچی من نزیکەی دە خولەکم پێدەچێت بۆ میزکردنێك. خەتەنەکەر یەك کونی بچوکی بۆ هێشتبوومەوە، هەر جارە ڕێگای دڵۆپێك میز دەدا بێتە دەرەوە. "واریس، بۆچی وا میز دەکەیت - چ گرفتێکت هەیە؟" نەمدەویست پێیان بڵێم، چونکو وام دانابوو، بە گەڕانەوەیان بۆ سۆماڵ، ئەوانیش خەتەنە دەکرێن، لەبەرئەوە هەر پێدەکەنیم.

بەڵام سورِی مانگانەم جێگای پێكەنین نەبوو. هەر زوو لە سەرەتاوە، كاتێك تەمەنم نزیكی یانزە دوانزە ساڵ بوو، ئەم مۆتەكەیە سواری ملم بوو. ڕۆژێكیان بەتەنیا لە دەرەوە بووم، بزن و مەڕەكانم دەلەوەڕاند. گەرمای ئەو ڕۆژە لە ڕادە بەردەربوو، منیش بێهێز لە ژێر دارێكدا دانیشتبووم، هەستم بە نائارامی دەكرد لەبەر ئازاری سكم. بۆم پرسیار بوو، *ئەم ئازارە چییە؟ لەوانەیە سكم هەبێت؟ لەوانەیە منداڵم ببێت؟ بەڵام من لەگەڵ پیاودا نەبووم، باشە چۆن دەبێت سكم پڕ بێت؟* ئازار زیاتر و زیاتر دەبوو، منیش ترسم زیاتر دەبوو. پاش كاژێرێك چووم بۆ میزكردن و خوێنم بینی. لەو باوەڕەدا بووم دەمرم.

ڕانەكەم جێهێشت لەسەر دەوەنەكان بلەوەڕێن، خۆشم ڕامكرد بۆ ماڵەوەو بە گریان و ترسەوە هانام بۆ دایكم برد، 'دەمرم! ئای دایە، من دەمرم!'

'لەبارەی چییەوە قسەدەكەیت؟'

'خوێنم لێدێ، دایە - خەریكە دەمرم!'

بە وردی لێم وردبۆوە. 'نا، تۆ هیچت لێنایە. هیچت نییە. سورِی مانگانەتە.' هەرگیز ئەمەم نەبیستبوو - هیچ شتێكم لەبارەیەوە نەدەزانی.

'تكات لێدەكەم دەتوانی بۆم باس بكەیت - پێم بڵێ لەبارەی چییەوە قسە دەكەیت؟' دایكم بۆی ڕوونكردمەوە، لە كاتێكدا كە بە ئازارەوە لوول بووبووم و دەستم بە سكمەوە گرتبوو. 'بەڵام چۆن لەم ئازارە ڕزگارم بێت؟ چونكو خۆت دەزانی، هەست دەكەم خەریكە دەمرم!'

'واریس، ناتوانی لە دەستی هەڵبێیت. دەبێت وازی لێبهێنی تا دەڕوات. ئارامبە تا خۆی دەڕوات.'

هەرچی چۆنێك بوو، ئامادە نەبووم ئەو ڕێگا چارەیە بگرم. هەوڵمدا بە دوای شتێكەوە بم، ئارامم بكاتەوە. گەڕامەوە بۆ بیابان و كەوتمە هەڵكەندنی چاڵێك لە ژێر دارێكدا. هەستم كرد، جوڵاندن باشە و شتێكی دا بە دەستمەوە، كە ئەوەندە بیر

لە ئازارەكە نەكەمەوە. بە دار كەوتمە هەڵكەندن تا ئەوەندە قووڵ، كە جێگای نیوەی لەشمی تیادا بێتەوە. پاشان چوومە ناوییەوە و خۆڵەكەم بە دەوری خۆمدا پەستەوە، ژێر زەوییەكە فێنكتر بوو، كە وەك جۆرێك لە سەهۆڵ وابوو، وە لە ڕۆژی گەرمادا لەوێدا وچانم دەدا.

هەڵكەندنی چاڵ لە زەویدا، بوو بە ڕێگایەك بۆ سازاندن لەگەڵ سووڕی مانگانەمدا. بۆم سەیر بوو كە دوایی زانیم، ئامانی خوشكم هەمان كاری كردووە. بەڵام ئەم هەوڵە لایەنی خراپیشی بوو. ڕۆژێكیان باوكم بە پیاسە هات بۆ لام و بینی كچەكەی لە ژێر دارێكدا، تا ناوقەدی لە زەوییەكەدا نێژراوە. لە دوورەوە منی بینیبوو، كە وەك ئەوە وابوو, لە ناوقەددا بڕابێتمەوە و لە سەر لمەكە دانرابم. 'ئەی هاوار ئەوە چی دەكەیت؟ هەر كە دەنگیم بیست، وەك كێچ هەوڵمدا بازێك بدەم و لە چاڵەكە بێمە دەرەوە، بەڵام چونكو لمەكەم بە قایمی پەستبۆوە، نەمتوانی بە خێرای بێمە دەرەوە. كەوتمە كۆششكردن، بەدەست هەوڵمدا قاچم دەربهێنم. باوكم وەك شێت دایە قاقای پێكەنین. زۆر شەرمم كرد كە بۆی باس بكەم بۆچی وام كردووە، پاش ئەوە بەردەوام باوكم ئەمەی كرد بە گاڵتە. 'ئەگەر دەتەوێ بە زیندویی خۆت بنێژی، بە تەواوی بیكە. مەبەستمە بۆچی لە نیوەیدا دەستی لێهەڵدەگریت؟' پاشان لەبارەی ئەم ڕەفتارە ناشایەی منەوە، لە دایكمی پرسیبوو. باوكم نیگەرانی كچەكەی بوو، كە ببێت بە جۆرێك لە زیندەوەری زەوی هەڵكەند - جۆرێك لە زیندەوەر، كە لەژێر زەویدا خەریكی تونێل لێدانن - بەڵام دایكم مەبەستەكەی بۆ ڕوونكردبۆوە.

بەڵام هەروەك ئەوەی دایكم ئامۆژگاری كردم، هیچ ڕێگایەك نەبوو بتوانم بەر بەم ئازارە بگرم. لەگەڵ ئەوەشدا لەو كاتەدا لێی تێنەدەگەیشتم، كە خوێنی سوڕی مانگانە، هەر وەك میز، دەگەڕایەوە ناو سكم. بەڵام لەبەرئەوەی بۆ چەند ڕۆژ هەر دەهات یان هەوڵی دەدا بێت، فشاری دەهێنا، دەبووە ئازارێكی زۆر كە لە توانای مندا

نـەبوو. هـەر جـارە دڵۆپێـك خـوێن دەهاتـە خـوارەوە، سـەرئەنجام سـوڕی مانگانـەم، ئاسایی بە لایەنی کەمەوە، دە ڕۆژی دەخایاند.

ئـەم گرفتـە بـەو پـەڕی گەیـشت، کاتێـك کـە لـە مـاڵی خاڵـە محەمـەد دەژیـام. بەیانییـەکیان زوو، ئاسـایی نـانی بـەیانیم بـۆ خـاڵم ئامـادە دەکـرد. سـینییەکم لـە چێشتخانەوە برد بۆ ژووری دانیشتن، کە خاڵم لـەوێ چاوەڕوانی دەکـرد، لـەپڕ دنیـا لەبەرچاوم ڕەش بوو و قاپەکانم لـە دەسـت کەوتـە خـوارەوە. خـاڵم ڕایکـرد و کەوتـە شەپازلە لێدانم بۆئەوەی بمهێنێتەوە سەرخۆ. وردە وردە هاتمەوە سەرخۆ و گوێم لـە دەنگی خاڵم بوو، وەك ئـەوەی لـە دوورەوە بێـت، هاواری دەکـرد، 'مـارویم! مـارویم! بوراوەتەوە!'

کە هاتمەوە سەرخۆم، پورە مارویم پرسیاری لێکـردم، چـی بـووە، منـیش پـێم وت کە سوڕی مانگانەم ئەم بەیانییە دەستی پێکردووە. 'نا، ئەمە دروسـت نییـە، دەبێـت بتبـەین بـۆ لای پزیـشك، ئـەم پـاش نیوەڕۆیـە لـەلای پزیـشکەکەی خـۆم کاتێکـت بـۆ دەگرم.'

پورم بۆ پزیشکەکەی ڕوونکردەوە، کە سوڕی مانگانەم هـەر کاتێـك دەسـت پێبکـات زۆر ئازاراوییە و لە هـۆش خـۆم دەچـم. ئازارەکـە لـە پـەلوپۆم دەخـات و نـازانم چـی لەگەڵدا بکەم. 'دەتوانی یارمەتیم بدەی؟ تکایە - شتێك هەیە بتوانی بیکەی؟ چونکو لەمـە زیـاتر لـە توانـای منـدا نییـە.' بـەڵام مـن هـیچ هێمایـەکم نـەکرد بـەوەی کـە خەتەنە کراوم. هەتا نەمدەزانی چۆن ئەم بابەتە بێنمە بەر بـاس. هـەر لەسـەرەتاوە کە هێشتا کچ بووم و تـەواوی ئەو بابـەتانەی کە پەیوەندی هـەبوو بـە بـاری فیزیکـی منەوە، تێکەڵ کرابوو لەگەڵ نـەفامی، ژاوەژاو و شـورەیی. لـەوەش دڵنیـا نـەبووم کـە خەتەنەکردنم سەرچاوەی گرفتەکەیە، چونکو هەر لەو باوەڕەدا بووم ئەوەی بەسـەر مـن هـاتووە، هـەموو کـچان دەگرێتـەوە. دایکـم لـەو بـاوەڕەدا نـەبوو کـە ئازارەکـەم

نائاساییه، چونکو هەموو ئەو ژنانەی ئەو دەیناسی خەتەنە کرابوون و هەموو ئەم ئازارەیان چێشتوە. وا چاوی لێدەکرا کە بەشێك بێت لە پاداشتی ژن بوون.

لەبەرئەوەی پزیشکەکە منی ئەپشکنی، نهێنییەکەمی ئەدۆزییەوە. 'تەنها شتێك کە دەتوانم بتدەمێ حەبی پێشگیری سکپڕییە. کە ئازارەکەت ناهێڵێت، چونکو سوڕی مانگانەکەت دەوەستێنێت.'

حەلەولا! دەستم کرد بە قوت دانی حەب، هەرچەندە لە ڕاستیدا بیرۆکەکەم پێخۆش نەبوو. لە باسمەی ئامۆزامەوە بیست، کە ئەو حەبانە بۆ من خراپە. بەڵام لە مانگێکدا ئازارەکەم وەستاو و بە زۆری خوێنم نەما. چونکو حەبەکە کارێکی وای کردبوو کە لەشم وا تێبگات، سکم پڕ بووە، هەروەها هەندێك شتی چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا. مەمکم گەورە بوو، سمتم گەورە بوو، دەموچاوم پڕبۆوە و زۆر قەڵەو بووم. ئەم گۆڕانکاریە لە لەشمدا تەواو بەرچاو و ناسروشتی بوو. بڕیارمدا وا باشترە بەرەو ڕووی ئازار ببمەوە، دەستم لە حەب خواردن هەڵگرت. یەکسەر خێرا ئازارەکەم بۆ هاتەوە، خراپتر لە جارانی پێشوو.

پاشان چووم بۆ لای پزیشکی دووەم بۆئەوەی ئەگەر بتوانێت یارمەتییەکم بدات. بەڵام دووبارە بوونەوەی ئەزمونی پزیشکی یەکەم بوو، دەیویست حەبی پێشگیری منداڵبوونم دەرخوارد بدات. بۆم باسکرد، کە ئەم ڕێگایەم تاقیکردۆتەوە، بەڵام کاریگەرییە لاوەکییەکانیم بەدڵ نییە. هەرچی چۆنێك بوو بەبێ حەب، مانگی چەند ڕۆژ لە پەلوپۆ دەکەوتم، مردنم بە ئاوات دەخوازی، ئاسایی دەچوومە ناو جێگاوە و تا چاك دەبوومەوە. ئایا ڕێگا چارەیەکی تر هەیە؟ پزیشکەکە وتی، 'باشە، تۆ بە تەمای چیت؟ کاتێك ژن حەبی پێشگیری منداڵبوون وەردەگرێت، زۆربەی زۆری سوڕی مانگانەی دەوەستێت. کاتێك سوڕی مانگانەی دەبێت، ئازاری دەبێت. ڕێگایەکیان هەڵبژێرە.' کاتێك پزیشکی سێیەم هەمان ئامۆژگاری دووبارە کردەوە، تێگەیشتم دەبێت لە پاڵ بینینی پزیشکی تازەدا، شتێکی تریش بکەم.

بە پورم وت، 'لەوانەیە وا پێویست بکات پزیشکێکی تایبەت ببینم؟'

بە وردیەکەوە تەماشای کردم. 'نـا،' بە دڵنیاییەوە وتی. 'دەی باشە - بـە تـەمای جیت بەو پیاوانە بڵێی؟'

'هیچ. تـەنیا دەمـەوێت ئـەو ئـازارە نـەمێنێت، ئـەوە هەموویـەتی.' دەمزانـی لـە قسەکانیدا پـەیامێکی شاراوە هەیـە: خەتەنـەکردن نـەریتێکی ئـەفریقایی ئێمەیـە و شتێکە کە جێگای قسەوباس نییە لەگەڵ ئەو پیاوە سپی پێستانەدا.

بەڵام من تێگەیشتم، دروست ئەمە ئەو شتەیە کە دەبێت بیکەم. یان ئازار بـچێژم و یەك لەسەر سێی هەر مانگێك، وەك کەسێکی پەککەوتە بژیم. ئەوەشم دەزانی کـە ئەمە کارێکە هەرگیز خێزانەکەمان پێیقوت ناچێت. هـەنگاوی داهاتوو ڕۆشـن بـوو چی دەکەم: دەبێت بە دزییەوە بچمەوە بۆ لای پزیشك و پێـی بڵێم خەتەنـە کـراوم. بەلکو یەکێکیان یارمەتیم بدەن.

یەکەم پزیشکم هەڵبژارد، دکتۆر ماکرای، چونکو ئەو لە خەستەخانەیکی گـەورەدا دادەنیشت و لێکم دایەوە، کە ئاسانکاری زۆرە ئەگەر پێویستم بە نەشتەرگەری بێت. کە کاتم گـرت، دەبـوو یـەك مـانگ ئـازار بـچێژم تـا سـەرەم دێـت. کـە کاتەکـەی هـات، بەهانەی چوونە دەرەوەم هێنایەوە بۆ پورم و چووم بۆ کلینیکی دکتۆر ماکرای. پێم وت، 'شتێك هەیە دەبێت بە تۆی بڵێم. من لە سۆماڵەوە هـاتووم و مـن - مـن -' بـۆم زۆر سەخت بوو، باسـی ئـەم نهێنییـە ترسـناکە بکـەم بـەو ئینگلیزییـە شڕەوە. 'مـن خەتەنەکراوم.'

هەتا نەیهێشت ڕستەکە تەواوبکەم پێی وتم، 'برۆ جل بگۆڕە. دەمـەوێت تەماشـات بکەم.' پزیشکەکە ترسـی لـە دەموچـاومدا بـینی. 'هـیچ نییـە.' بـانگی سـستەرەکەی کرد، سستەرەکە پیشانی دام لە کوێ جل بگۆڕم و چی لەبەربکەم.

کە گەڕاینەوە ژووری پشکنین، بەڕاستی لە خۆم کەوتمە گومانەوە کە بە چ ڕۆژێك گەیشتووم. بیری ئەوەی کە کچێك لە وڵاتەکەی منەوە لەم شوێنە نامۆیەدا دانیشێت،

هەردوو لنگی بڵاوكاتەوە و پیاوێكی سپی پێست تەماشای بكات... چاكە، ئابڕوچونێكی گەورە كە دەمتوانی بیهێنمە بەرچاوی خۆم. پزیشكەكە هەوڵیدا لنگم لەیەكتری جیابكاتەوە. 'ئارام بەرەوە. باش دەبێت - من دكتۆرم. سستەرەكە لێرەیە هەر لەویانەدا ڕاوەستاوە.' سەرم سوڕان بۆ ئەو شوێنەی ئەو بە پەنجە ئاماژەی بۆ كرد. سستەرەكە خەندەیەكی ئارامبەخشانەی بۆ كردم و منیش خۆمم دا بەدەستەوە. زۆرم لە خۆم كرد بیر لە شتێكی تر بكەمەوە، وا بیرم كردەوە كە لێرە نییم، بەڵكو لە بیابانم لەگەڵ بزنەكانمدا لە ڕۆژێكی خۆشدا پیاسە دەكەم.

كاتێك تەواو بوو، لە سستەرەكەی پرسی، كەسێك هەیە لە خەستەخانەكەدا سۆماڵی بزانێت، ئەویش وتی بەڵێ، ژنێكی سۆماڵی هەیە و لە نهۆمی خوارەوە كار دەكات. بەڵام كە گەڕایەوە پیاوێكی سۆماڵی هێنا، چونكو نەیتوانی بوو ژنەكە بدۆزێتەوە. بیرم كردەوە، *جوانە! چ بەختێكی ڕەشە، كارێكی وا ترسناك باس بكەیت و پیاوێكی سۆماڵی بۆت وەربگێڕێت! چەند بە خراپی بەسەرمدا دەشكێتەوە؟*

دكتۆر ماكرای وتی، 'بۆی باس بكە، كە زۆر داخراوە هەتا من تێناگەم كە چۆن تائێستا بەرگەی گرتووە. هەر هەڵێكمان بۆ هاتەپێشەوە دەبێت نەشتەرگەری بۆ بكەین.' یەكسەر بێزاریم بە دەموچاوی پیاوە سۆماڵییەكەوە بینی. لێوەكانی هێنایەوە یەك و بە مۆنییەوە ڕوانییە پزیشكەكە. بەوەی كە تۆزێك لە ئینگلیز تێدەگەیشتم و ئاگاداری بیروبۆچوونی پیاوە سۆماڵییەكە بووم، هەستم كرد شتێك هەڵەیە.

پیاوەكە پێی وتم، 'چاكە، بەڕاستی ئەگەر دەتەوێت، ئەوان دەتوانن بۆت بكەنەوە.' تەنیا تەماشام كرد. 'بەڵام دەزانی ئەوە دژ بە كەلتورەكەی خۆتە؟ خێزانەكەتان ئاگاداره تۆ ئەو كارە دەكەیت؟'

'نا، ڕاستیت پێبڵێم، نا.'

"لەگەڵ کێدا دەژیت؟"

"لەگەڵ پور و خاڵمدا."

"ئەوان دەزانن تۆ ئەو کارە دەکەیت."

"نا."

"چاکە، یەکەم شت ئامۆژگاریت دەکەم، لەگەڵ ئەواندا قسەوباس بکە." سەرم بۆ لەقاند و کەوتمە بیرکردنەوە: *ئەوەیە وەڵامی پیاوێکی ئەفریقی نمونەیی. سوپاسی ئامۆژگارییە بەکەڵکەکانت دەکەم، برا. ئەمە کۆتایی دەهێنێت بە تەواوی کارەکە.*

دکتۆر ماکرای لەلایەن خۆیەوە وتی، ناتوانێت هەر ئێستا کارە نەشتەرگەرییەکەم بۆ بکات. پێویستە کات بگرمەوە. پاشان بۆم دەرکەوت کە ناتوانم بیکەم چونکو پورم پێی دەزانێت. "نا. من ئەوە دەکەم - من تەلەفون دەکەم بۆ کات گرتن." بێگومان ساڵێك ڕۆیشت و هەرگیز تەلەفونم نەکرد.

یەکسەر پاش ڕۆشتنەوەی خێزانەکەمان بۆ سۆماڵ، تەلەفونم کرد و کاتم گرت، بەڵام نزیکترین کات دوو مانگی پێدەچوو. لەو دوو مانگەدا هەر خەیاڵم لای ترسی خەتەنەکەم بوو. وای بۆ دەچووم کە نەشتەرگەرییەکە دووبارەکردنەوەی هەمان شتە، وە چاوەڕوانی زیاترم دەکرد، وای بۆچووم کە بەرگەی ئەو ئازارە ناگرمەوە. کە ڕۆژی دیاریکراو هات، ئاسایی نەچووم بۆ خەستەخانە و تەلەفونیشم نەکرد.

لەو کاتەدا لە وای دەژیام. گرفتی سوڕی مانگانەم خراپتر بوو، بەڵام ئێستا بۆ ئەوەی بژیم، لە دەرەوەی ماڵەوە کارم دەکرد. تۆ ناتوانی هیوادار بی کارەکەت لە دەستنەدەی، ئەگەر مانگی هەفتەیەك نەچیتە سەر کار. زۆرم بۆ خۆم هێنا، بەڵام هاوڕێکانم لە وای بینییان وەزعم تێکچووە. مارلین بەردەوام پرسیاری لێدەکردم چیمە. بۆم باسکرد، خەتەنەکراوم کاتێك منداڵ بووم.

بەڵام مارلین لە لەندەن گەورە بووبوو، سەری دەرنەدەکرد لەوەی باسی چی دەکەم. 'واریس، بۆچی خۆتم پیشان نادەیت؟ بەڕاستی نازانم باسی چی دەکەیت. چیان لێبڕیوی؟ ئەمە؟ ئەوە؟ چیان لێکردوی؟'

لە کۆتاییدا ڕۆژێکیان دەرپێکەم داکەند و پیشانم دا. هەرگیز نیگای دەموچاویم بیرناچێتەوە. ڕووی کرد بەولاوە و فرمێسك بەسەر کوڵمەکانییەوە جۆگەلەی بەست. پەرێشانی دایگرتم، لە دڵی خۆمدا وتم: *ئەی هاوار، دەبێت ئەمە ئەوەندە خراپ بێت؟* یەکەم وشە کە لە زاری هاتە دەرەوە، 'واریس، هەست بە هیچ دەکەیت؟'

'لەبارەی چییەوە دەدوێیت؟'

تەنیا سەری بادا. 'دەزانی، بیرت دێتەوە خۆت چۆن بوویت کاتێك کە کچێکی بچوك بوویت؟ پێش ئەوەی ئەمەت بەسەر بهێنن؟'

'بەڵێ.'

'باشە، وەك ئێستای من وابوویت؟ وەك ئێستا نەبوویت؟' ئێستا ئیتر بە دڵنیاییەوە بۆم دەرکەوت. ئیتر لەمە زیاتر پێویست ناکات بۆم پرسیار بێت - یان هەتا هیواداربم - کە هەموو ژنان بەو شێوەیەی من شێوێندرابن. ئیتر بە ڕۆشنی دەزانم، کە من جیاوازم. پێویست ناکات ئاواتبخوازبم، ئەو ئازارەی من هەمە بەسەر هەموو ژنێك بێت، بەڵام ناشم دەوێت لەم نێوەدا تەنیابم. 'باشە ئەمە بەسەر تۆدا نەهاتووە، بەسەر تۆ و دایکتدا.'

سەری باداو و دووبارە دەستی کردەوە بە گریان. 'تۆقێنەرە، واریس. ناتوانم باوەڕ بە خۆم بهێنم، هیچ کەسێك لە جیهاندا هەبێت وا بە تۆ بکات.'

'بەسە تکات لێدەکەم غەمگینم مەکە.'

'غەمگینم. غەمگین و تووڕە. من بۆ دەگریم چونکو ناتوانم باوەڕ بکەم خەڵکانێك هەبن لە جیهاندا ئەم بەڵایە بەسەر کچێکی بچوك بهێنن.'

بۆ چەند خولەکێك بە بێدەنگی دانیشتین، نەمدەتوانی تەماشای مارلین بکەم، کە بە هێواشی دەگریا. پاشان بڕیارمدا کە ئیتر بەسە. 'چاکە، شەقێکی تێهەڵدە. دەچم نەشتەرگەری دەکەم. سبەینێ تەلەفون بۆ ئەو پزیشکە دەکەم. بەلایەنی کەمەوە دەتوانم خۆشی لە چوونە توالێت ببینم. ئەوە هەموو شتێکە کە خۆشی لێببینم، بەلام ئەوە کەم نییە.'

'منیش لەگەڵتدا دێم، واریس. دێم بۆ ئەوێ. پەیمانت پێدەدەم.'

مارلین تەلەفونی کرد بۆ نووسینگەی پزیشکەکە و کاتێکی داواکرد، ئەم جارەیان دەبوو مانگێك ڕاوەستم. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا دەمووت، 'ئەرێ کچێ لەخۆت دڵنیایت، لەگەڵم دێیت؟'

'نیگەران مەبە. من دێم. دروست لەوێ لەگەڵتدا دەبم.' ڕۆژی نەشتەرگەرییەکە بەیانی زوو خەبەری کردمەوە و چووین بۆ خەستەخانە. سستەرەکە منی بردە ژوورەکە. ئای، خۆیەتی: مێزێك. کاتێك مێزی نەشتەرگەرییەکەم بینی، تۆزێکی مابوو بگەڕێمەوە و لەو ناوە ڕاکەم. نا باشترێکە لە بەردێکی ناو دەوەن، بەلام تۆزێك هیوام هەبوو. کە هەست بکەم ئەم کارە زۆر باشتر دەبێت. دکتۆر ماکرای بەنجی کردم شتێك کە حەزم دەکرد بکرامایە، کاتێك کە ژن کوژەکە قەسابی کردم. مارلین دەستی بە دەستمەوە بوو کە لە هۆش خۆم چووم.

کە هۆشم هاتەوە، منیان لە ژوورێکی دوو قەرەوێڵەیی دانابوو لەگەڵ ژنێك کە تازە منداڵی بووبوو. ئەم ژنە و باقی ئەو خەڵکەی کە لە کافەتیرییەکە لە کاتی نانخواردنی نیوەڕۆدا دەمبینین، بەردەوام پرسیاریان دەکرد، 'باشە، بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟'

چیم دەتوانی بڵێم؟ دانم پیادابنایە، 'ئا، هاتووم نەشتەری کۆنەندامی زاوزێم کردووە. کەناڵەکەی زۆر تەسك بوو!' هەرگیز ڕاستیم بە هیچ کەس نەوت. دەمووت

ئازاری سکم هەیە. لەگەڵ ئەوەی ماوەی چاکبوونەوەم هەر زۆر باشتر بوو لەوەی کە خەتەنە کرام، بەڵام ئەمە بە واتای دووبارە نەبوونەوەی ناخۆشترین بیرەوەری نەبوو. هەرجارێك میزم کردبێت، هەمان شتە کۆنەکان بوو: خوێ و ئاوی گەرم. بەڵام ئەم جارەیان، هیچ نەبێت سستەرەکە ڕێگای دام بچمە حەمام و خۆم بخەمە ناو ئاوی گەرمەوە. ئای. دەرمانی کەمکردنەوەی ئازاریان دامێ، ئەمەش خراپ نەبوو، بەڵام بەڕاستی خۆشحاڵ بووم کە تەواو بووم.

دکتۆر ماکرای کارێکی باشی بۆ کردم و هەمیشە مەمنونیم. پێی وتم، "ئەوە بزانە، تۆ تەنیا نیت. ڕێگام بدە با پێت بڵێم، بەردەوام ژنان هاتوون بۆ لام، هەمان گرفتیان هەبووە. ژنانێکی زۆر لە سودان، میسر، سۆماڵ. بەشێکیان سکیان هەبووە و تۆقیبوون، چونکو منداڵ بوون بە کۆئەندامی دوراوەوە، زۆر مەترسیدارە. لەوانەیە ببێتە هۆی چەند ئاڵۆزییەك - منداڵەکە لەوانەیە بخنکێت کاتێك کە بەو کەناڵە تەسکەدا دێت، یان دایکەکە خوێنی لەبەر بڕاوت و بمرێت. هەندێك بەبێ مۆڵەتی مێردەکانیان یان خێزانەکانیان دێن بۆ لام، بەڵام من کاری خۆم دەکەم، بە باشترین شێوە دەیکەم."

لە ماوەی دوو سێ هەفتەدا چوومەوە باری ئاسایی خۆم. ئا، نەك بە تەواوەتی، بەڵام زیاتر وەك ژنێك کە خەتەنە نەکرابێت. واریس بوو بە ژنێکی تر. توانیم لەسەر توالێت دانیشم و میز بکەم - خوششششش! ناتوانم چۆن باسی بکەم، کە چ سەرفەرازییەکی تازە بوو.

## بەشی سیانزەیەم

## گرفتی پاسپۆرت

کاتێك کە گەڕامەوە لە یەکەم دەرکەوتنی سینەماییم وەك کچی بۆند[1]، بە شۆفێرەکەم وت، یەکسەر بمگەیەنێتە ماڵی مارلین مۆنرۆ. پاش ڕۆیشتنم لەلای بەردو وڵاتی مەغریب، نەمدەوێرا پەیوەندی پێوە بکەم، بەڵام لەجیاتی ئەوە بڕیارم دا وازی لێبهێنم سارد بێتەوە تا دەگەڕێمەوە. لە دەرگای دەرەوەی خانووەکەیان، بە زەرفێکی گەورەی دیارییەوە، وەستام و بە نیگەرانییەوە لە زەنگی دەرگام دا. مارلین دەرگای پێشەوەی کردەوە، زەردەخەنەیەکی گەورە کەوتە سەر دەموچاوی، باوەشی بۆ کردمەوە و بەرەو ڕووم ڕایکرد. 'کردت! دەڵەسەگی شێت، کردت!' لەسەر دزینی پاسپۆرتە ساختەکە، مارلین لە من بورد، هەروەها وتی، ئەوە کاریگەری زۆر بووە لەسەری کە چۆن وێراومە بەدوایدا بگەڕێم و بیدۆزمەوە، کە ئەمە وای لێکردووە تورە نەبێت. بەڵام پەیمانم دا، کە هەرگیز خۆمان نەخەینە مەترسییەوە بەدووبارە بەکارهێنانی ئەو پاسپۆرتە، بەتایبەتی پاش ئەو ئەشکەنجەیەی کە لە کۆنترۆڵی فڕۆکەخانەی هێسرۆ بەسەرم هات.

دڵشاد بووم بەوەی مارلین لە من بورد، چونکو بەڕاستی هاوڕێیەکی باش بوو. وە بۆ جارێکی تر ناچار بووم هانا بۆ ئەم هاوڕێیەتییە بەرمەوە. کاتێك کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە لە لەندەن، لەو باوەڕەدا بووم پیشەی مانیکانم تازە کەوتۆتەڕێ - بەتایبەتی پاش ئەو سەرکەوتنە یەك لەدوا یەکانەی تیرێنس دۆنۆڤان و بەشداریم لە فیلمی جێمس بۆندا. بەڵام جادو ناسا، لە شەوێکدا پیشەکەم نەما، چۆن دەستی پێکرد هەرئاواش لەپڕ و ئاڵۆزاوی ئاسەوارێکی نەما. لە ماکدۆناڵد کارێك بۆ من نەما. لەبەرئەوە نەمتوانی لەوە زیاتر لە وای بمێنمەوە. بێ کارکردن نەمدەتوانی لە

ژوورکەدا بمێنمەوە و ناچار بووم بگوێزمەوە بۆ لای مارلین و دایکی. ئەم چوونەم لە زۆر لایەنەوە پێخۆش بوو لە ناو ماڵی تەواودا بیت و بەشێك بی لە خێزان. ئەم مانەوەیەم حەوت مانگی خایاند و لەگەڵ ئەوەش هەرگیز ڕوویەکی گرژیان پیشان نەدام، دەمزانی زیاد لە ئاستی خۆی ماومەتەوە. هەندێك کاری بچوکی مانیکانم، لەملاو ئەولا کرد، بەڵام ئەوەندە دەستکەوتی نەبوو لەسەر پێی خۆم ڕاوەستم. گواستمەوە بۆ لای هاوڕێیەکی ترم، پیاوێکی چینی بە ناوی فرانکیە، کە هاوڕێی قژچاکەرەکەم بوو. فرانکیە خانوویەکی گەورەی هەبوو - باش بوو، بۆ من گەورە بوو، چونکو دوو ژووری نوستنی هەبوو. بەخشندەیی کرد و ژوورێکی پێدام، هاوکات لە هەوڵی ئەوەدا بووم پیشەکەم بکەوێتە ڕێ.

لە ساڵی 1987، پاش ماوەیەکی کورت لە گواستنەوەم بۆ لای فرانکیە، فیلمی زە لیڤینگ دەیلایت[2]پیشاندرا. پاش دوو هەفتەی تر، هاوڕێیەکی ترم منی برد بۆ ئاهەنگی جەژنی لەدایك بوونی مەسیح، هەموو کەس لە لەندەندا ئەم جەژنە دەگێڕێت، زۆرم پێخۆش بوو، شەو درەنگ گەڕامە ماڵەوە. هەر سەرم خستە سەر سەرین، خەوم لێکەوت. بەڵام لە دەنگی بەردەوامی لێدانی پەنجەرەی ژوورەکەم، خەبەرم بۆوە. تەماشای دەرەوەم کرد، بینم ئەو هاوڕێیەمە کە منی گەیاندبووە ماڵەوە، ڕۆژنامەیەکی بەدەستەوە بوو. هەوڵی دەدا شتێك بڵێت، بەڵام تێی نەدەگەیشتم، لەبەرئەوە پەنجەرەکەم کردەوە.

'واریس! وێنەی تۆ، بەسەر بەرگی زە سەندەی تایمزدوەیە[3]!'

'نۆی...' چاوم هەڵگلۆفت. 'بەڕاستی - منم؟'

'نا! سەیریکە.' ڕۆژنامەکەی کردەوە و وێنەیەکی سێ چارەکی دەموچاوم، تەواوی لاپەڕەی یەکەمی گرتبۆوە. لە دەموچاوی خۆم گەورەتر بوو، بە قژێکی زەردی درەوشاوە و نیگایەکی سووربوون بەسەر دەموچاومەوە.

"ئەمە جوانە ... ئێستا دەگەڕێمەوە ناو جێگاکە ... دەنوم." بە خاو و خلیچکی چوومەوە ناو جێگا. لە نیوەڕۆدا بۆم دەرکەوت، کە ئەم چاپکردنە چ توانایییەك لە خۆی دەگرێت. بە دڵنیاییەوە دەرکەوتنم لە بەرگی زە سەندەی تایمزدا هەندێك جوڵە دەهێنێتە کایەوە. لەو کاتەدا لە پەلەقاژێدا بووم. هەموو لەندەنم کێڵا، چووم بۆ نواندن بۆ کاری مانیکان، لەگەڵ ئەوانەی کە لەسەر من شتیان بڵاوکردبۆوە، قسەم کرد و لەکۆتاییدا سەری ئاژانسی مانیکانم دا، بەڵام هیچی کەڵکی نەبوو.

ئاژانسە تازەکەم وتی، "باشە واریس، ڕاستییەکەی بازاڕی مانیکانی ڕەش لێرە زۆر گەرم نییە. دەبێت بە دوای کاردا سەفەر بکەیت - پاریس، میلان، نیوۆرك." بەخۆشییەوە دەمویست سەفەر بکەم، ئەگەر ئەم گرفتە کۆنەی پاسپۆرتم نەبوایە. بۆیان باسکردم، کە شتێکیان لەبارەی پارێزەرێکەوە بە ناوی هارۆلد ویلەر بیستووە، کە توانیوێتی یارمەتی چەند کۆچکردوو بدات لە پەیوەند بە پاسپۆرتدا. بۆچی من نەچم قسەی لەگەڵ بکەم؟

چووم بۆ نووسینگەی هارۆلد ویلەر، بۆم دەرکەوت، کە پارەیەکی زۆری دەوێت بۆئەوەی یارمەتیم بدات - دوو هەزار پاوەند. لێکم دایەوە، ئەگەر بتوانم سەفەر بکەم و کار بدۆزمەوە، دەتوانم ئەو پارەیە لەماوەیەکی کورتدا بەدەست بهێنم. بۆم ڕۆشن بوو، بەم هەلومەرجەوە ناتوانم بە هیچ لایەکدا بڕۆم. ئەو پارەیەم لە هەر سەرچاوەیەك، کە ئەگەر بوونی هەبوو، پێکەوە نا و دوو هەزار پاوەندەکەم بەدەستهێنا. بەڵام نیگەرانی ئەوە بووم هەموو پارەکەی بدەمێ و پاشان قۆڵبڕ دەرچێت.

بۆ دڵنیایی پارەکەم لە ماڵەوە دانا، دیسانەوە کاتم گرتەوە و بۆ ئەم جارەیان مارلینم لەگەڵ خۆم برد، بۆئەوەی ئەویش ئاگادار بێت. لە زەنگی تەلەفونیم دا و سکرتێری ویلەر وەڵامی دامەوە و پاشان ڕێگای داین بچینە ژوورەوە. هاوڕێکەم لە ڕاڕەوەکەدا مایەوە، من چووم لەگەڵ ویلەردا قسەم کرد لە ژوورەکەی.

بێ پێچ و پەنا پێم وت: 'ڕاستیم پێبڵێ. تەنیا دەمەوێت بزانم، ئەو پاسپۆرتەی من وەری دەگرم، دوو هەزار پاوەند دەهێنێت. دەتوانم یاسایی بۆ هەر کوێیەك لە جیهاندا پێی بچم؟ هیچ پێم خۆش نییە لە کونە گورگێکدا توندم بکەن و دیپۆرتم کەنەوە. هەروەها تۆ ئەو شتە لەکوێوە دەهێنی؟'

'نا، نا، ناتوانم لەبارەی سەرچاوەکانی خۆمەوە قسەت بۆ بکەم. دەبێت ئەوە بۆ منی جێهێڵێت. دڵەکەم، ئەگەر تۆ پاسپۆرتت دەوێت، بە دڵنیاییەوە من دەتوانم پاسپۆرتت بدەمێ. گوێ لە من بگرە، تەواو یاسایی دەبێت. پاش ئەوەی دەستمان پێکرد دوو هەفتە دەخایەنێت. کە ئامادە بوو، سکرتێرەکەم تەلەفونت بۆ دەکات.'
*زۆر چاکە! ئەمە بە واتای ئەوە دێت لە دوو هەفتەی داهاتوودا، هەر کاتێك بۆ هەر شوێنێك پێم خۆش بێت، دەچم.*

'چاکە، لەوە دەچێت باش بێت،' وتم. 'هەنگاوی دووەمان چی دەبێت؟' ویلەر باسی کرد، کە پلانی وایە شووبکەم بە پیاوێکی ئێرلەندی. ئەو دوو هەزار پاوەندە دەچێت بۆ ئەو پیاوە ئێرلەندییە لەبەرامبەر ئەو کارەی دەیکات. ویلەر تەنیا بەشێکی کەمی لێدەبات بۆ خۆی. ڕۆژ و کاتی بینینمی تۆمارکرد، من و مێردە تازەکەم، لە تۆمارگەی هاوسەرێتی، چاومان بەیەکتر دەکەوێت و سەد و پەنجا پاوەندی تریش دەکەمە دەستییەوە.

'تۆ میستەر نۆسولیڤان دەبینی،' ویلەر بە زمانێکی ئینگلیزی تەواو، ئامۆژگاری کردم. بەردەوام دەینووسی و هاوکاتیش قسەی دەکرد. 'شوو بە پیاوێکی لێهاتوو دەکەیت. ئێوەی - بەوبۆنەوە - پیرۆزباییت لێدەکەم.' سەری بەرزکردەوە و زەردەخەنەیەکی بچوکی بۆ کردم.

دوایی لە مارلینم پرسی، کە لەو باوەڕەدایە ئەم کەسە جێگای متمانەیە. ئەو وتی، 'باشە، نووسینگەیەکی ڕێکوپێکی هەیە لە خانوویەکی خۆشدا لە گەڕەکێکی جواندا.

ناودکەی بەسەر دەرگاکەیەوەیەتی. سکرتێرێکی کارامەی هەیە. دەتوانم بڵێم ئەمەی لێدەوەشێتەوە.'

بۆ ڕۆژی مارەیییەکەم، هاوڕێ متمانە پێکراوکەم، وەك شایەت لەگەڵ خۆمدا بردم. لەدەرەوەی تۆمارگەی هاوسەرێتی چاوەڕوانمان کرد، چاومان کەوت بە پیاوێکی پیری دەموچاو قوپاوی سووری قژ هەڵوایی سپی و جلوبەرگ دڕاوو، زیکزاك بەسەر شۆستەکەدا دەهات. ئێمە هەر پێدەکەنین تا پێی نایە سەر پێپلیکانەی تۆمارگەکە، من و مارلین تەماشای یەکتریمان کرد و چاومان چووە پشتی سەرمان، پاشان گوڕم دایە خۆم ڕووم تێکرد. 'تۆ میستەر ئۆسولیڤانیت؟'

'خۆیەتی. ئەوە ناوی منە.' دەنگی نزم کردەوە. 'تۆ ئەویت؟' سەرێکم بۆ لەقاند. 'پارەت پێیە، کچۆڵە پارەکەت هێناوە لەگەڵ خۆت؟'

'بەڵێ.'

'سەد و پەنجا پاوەندە؟'

'بەڵێ.'

'کچی چاك، باشە، پاشان، خێراکە، خێراکە. با بڕۆین. کات بە فیڕۆ نەدەین.' مێردە تازەکەم بۆنی ویسکی لێدەهات و گومانی تیادا نەبوو تەواو سەرخۆش بوو.

کاتێك دوایکەوتین بۆ ژوورەوە، بە گوێی مارلیندا چرپاندم، 'ئەرێ ئەوەندە دەژی تا من پاسپۆرتەکەم دەردەهێنم؟'

تۆمارکەر دەستی بە گێڕانی مەراسیم کرد، بەڵام بۆ من سەخت بوو هۆشم لای خۆم بێت. میستەر ئۆسولیڤان پێی ئەرزی نەدەگرت، بەردەوام خۆی دەدا بە مندا و هەر ئەوەندە تۆمارکەر وتی، 'ئایا تۆ، واریس، ئەم پیاوە دەکەیت -' زرمە هەستا و پیاوە کەوت. یەکەم سات وای بۆچووم کە لە حەوت ساڵان ڕاست بۆتەوە، تا بینیم بە

دەمــی داچــەقیوەوە تونــد هەناســە دەدا. دانەویمــەوە و کەوتمــە ڕاوەشــاندنی و هاوارکردن، 'میستەر ئۆسولیڤان، هەستە!' بەڵام جوڵەی نەکرد.

سەرم بەرزکردەوە بۆ مـارلین و هـاوارم کـرد، 'ئەمـە خۆشـە، ڕۆژی مـاردیی منـە!' مارلین لە تاو پێکەنین، پـاڵی دابـوو بـە دیوارەکـەوە و دەسـتی بـە سـکییەوە گرتبـوو. 'ئەمە بەختی منـە! مێـردە خۆشەویستەکەم لەبـەردەم مێـزی قوربانگـەدا لـە هـۆش خـۆی بـچێت.' لـە گرمـەی ئـەو هەلومەرجـە پێکەنیناوییـەدا، کەوتمـە ئـەوەی چـۆن بیکەم بە گاڵتە.

تۆمارکـەر هـەردوو دەسـتی خـستە سـەر ئـەژنۆکانی دانەوییـەوە بـۆ پـشکنینی دەزگیرانەکــەم و بەســەر چــاویلکە بــچوکەکەیەوە لێــی ورد بــۆوە. 'ئەمــە گیــان بەدەردەبات؟'

ویستم بە ڕوویدا بتەقێمەوە، 'من چـۆن ئـەم شـتە قـۆڕە بـزانم؟' بـەڵام دەمزانـی دەسـتەکەم ئاشـکرا دەبێـت. 'هەسـتە، دەی خێراکـە، هەسـتە!' بـە هێواشـی کەوتمـە کوتانەوەی دەموچاوی. 'تکایە - کەسێك تۆزێ ئاوم بداتێ. کەسێك هەوڵێکم لەگەڵدا بـدات!' بـە پێکەنینـەوە پاڕامـەوە. تۆمارکـەر کوپێـك ئـاوی بـۆ هێنـام و کـردم بـە دەموچاویدا.

'ئۆه...' کابرا کەوتـە پرخانـدن و لرخـەکردن و لـە کۆتاییـدا چاوی هـەڵبڕی. بـە نەقیزە و بگرە و بەردە توانیمان میستەر ئۆسولیڤان بخەینە سەر پێی خۆی.

'دەی تەواو بێت.' لە ژێر لێـوەوە وتم، ترسی ئـەوەم هـەبوو دووبـارە بکەوێتـەوە. خۆشەویستانە قایم قۆڵیم گرت تا مەراسیمەکە تەواو بوو. چووینە دەرەوە، میـستەر ئۆسولیڤان داوای سەد و پەنجا پاوەندەکەی کرد و منیش ئەدرێسەکەیم وەرگـرت بـۆ کاتێك کە کێشەیەکم بۆ بێتە پێشەوە. پارەکەمی خستە تەنکەی باخـەڵی، بـە کۆپلـە گۆرانییەك دڵشادانە بە جادەکەدا لێیدا و ڕۆیشت.

پاش هەفتەیەك هارۆلد ویلەر خۆی تەلەفونی بۆ کردم و وتی پاسپۆرتەکە ئامادەیە، بە دڵێکی شادەوە چووم بۆ نووسینگەکە بۆ هێنانی. دیکومێندێکی دایە دەستم: پاسپۆرتێکی ئێرلەندی بە وێنەی دەموچاوی ڕەشم و ناوی واریس ئۆسولیڤانەوە. من شارەزای پاسپۆرت نەبوو، بەڵام لەوە دەچوو تۆزێك ئاوێزە بێت. نا. زۆر ئاوێزە دیاربوو. وەك ئەوەی کەسێك لە ژێر زەمینەکە دروستی کردبێت. "ئەمە خۆیەتی؟ مەبەستمە بڵێم ئەم پاسپۆرتە یاساییە؟ دەتوانم بەمە سەفەر بکەم؟"

"نا، بەڵێ." ویلەر بۆ دڵنیایی سەریشی بۆ لەقاند. "ئێرلەندییە، دەیبینی. پاسپۆرتێکی ئێرلەندییە."

"تممم." سەیری بەرگەکەی دواوەیم کرد، بەناو پەڕەکانیدا گەڕام. "باشە. کارەکەمی پێبڕوات. کێ گرنگی بە ڕووکەش دەدا؟"

زۆری پێنەچوو خستمە کارەوە. ئاژانسەکەم کاتی بۆ گرتم لە پاریس و میلان و منیش لەم پەیوەندەدا داوای ڤیزەم کرد. بەڵام دوو ڕۆژی نەبرد، نامەیەکم بۆ هات. کە زانیم لە کوێوە هاتووە، وشك بووم. نامەکە لە کەنتوری پەنابەرانەوە هاتبوو، داوایان دەکرد، بە زووترین کات بییان بینم. هەموو جۆرە ئەگەرێکی ناخۆشم هێنایە بەرچاوی خۆم، بەڵام لە کۆتاییدا بۆم دەرکەوت، کە هیچ ڕێگایەکی ترم نییە، تەنیا ئەوە نەبێت بچم بیان بینم. هەروەها دەمزانی ئەو دەسەڵاتەیان هەیە، یەکسەر دیپۆرتم کەنەوە یان ڕەوانەی بەندیخانەم بکەن. خواحافیز لەندەن. خواحافیز پاریس. خواحافیز میلان. خواحافیز مانیکان. مەرحەبا حوشترەکان.

ڕۆژێك پاش وەرگرتنی نامەکە، لە ماڵی فرانکیەوە سواری میترۆ بووم بۆ کەنتوری پەنابەران و تەماشای ئەم بینا گەورەیەی دەوڵەتم کرد. وام هەستکرد دەچمە ناو نارامگاوە. کاتێك دروست ژوورەکەم دۆزییەوە، لەلایەن کۆمەڵێك دەموچاوی مۆنەوە

پێشوازی کرام، کە لە ژیانمدا کەسانی وەهام نەبینیبوو. 'لەوێدا دانیشە،' پیاوێکی دەموچاو ڕەقەڵە فەرمانی پێدام. لە ژوورێکی تەواو جیاکراوەدا دایاننام و کەوتنە پرسیار کردن لێم. 'ناوت چییە؟ پێش ئەوەی شووبکەیت ناوت چی بووە؟ خەڵکی کوێی؟ چۆن ئەو پاسپۆرتەت دەست کەوتووە؟ ناوی ئەو پیاوە چییە؟ چەندت پارە داوەتێ؟' دەمزانی، بە یەك هەڵەی بچوك لە وەڵامدانەوەدا، واریسە گۆن گۆت دەکرێت. هاوکات کارمەندەکان وشە بە وشەی قسەکانمیان تۆمار دەکرد. پشتم بە خۆم بەست و وەڵامی کورتم پێدانەوە. کاتێك پێویستم بە کات و بیرکردنەوە بوو، دەستم بۆ تواناییەکانی خۆم دەبرد، خۆم وا پیشان دەدا کە بە هۆی گرفتی زمانییەوە تێناگەم.

کەنتوری پەنابەران پاسپۆرتەکەیان گلدایەوە و وتیان بۆ وەرگرتنەوەی دەبێت مێردەکەم بهێنم بۆ گفتگۆ - ئەمە شتێك بوو ئاواتەخوازبووم نەیبیستم. لە کۆتاییدا توانیم لە کەنتور بێمە دەرەوە، بەبێ ئەوەی شتێك لەبارەی هارۆلد ویلەرەوە بڵێم. بڕیارم دابوو، پارەکەم لەم دزە بسەنمەوە پێش ئەوەی حکومەت بچێتە سەروکاری یان ئەوە کۆتایی دوو هەزار پاوەندەکەمە.

کەنتوری پەنابەرانم جێهێشت و یەکسەر چووم بۆ نووسینگە ڕووپۆش جوانەکە و لە زەنگی دەرگام دا. کاتێك سکرتێرەکەی وەڵامی دامەوە، پێم وت واریس دیریەم و دەمەوێت میستەر ویلەر ببینم و کارەکە پەلەیە. کەچی سەرسامانە میستەر ویلەر لەوێ نەبوو، لەبەرئەوە دەرگای بۆ نەکردمەوە بچمە ژوورەوە. چەند ڕۆژ لەسەر یەك چووم بۆ نووسینگە و لە دەرگام دا و هاوارم کرد، بەڵام سکرتێرە ئەمەکدارەکەی جرجەکەی پاراست. چاودێریم کرد، لە دەرەوەی بیناکە تەواوی ڕۆژ خۆم لێشاردەوە، چاوەڕوانیم کرد بۆئەوەی هەر هاتە دەرەوە پەلاماری بدەم. بەڵام ونبوو.

هاوکات لە هەوڵی هێنانی نۆسولیڤان بووم بۆ کەنتوری پەنابەران. لە ناوچەیەکی پەنابەر نشین بوو بە ناوی کرۆیدۆن، لە خوارووی لەندەن، کە سۆماڵییەکی زۆری تیادا دەژیا. تا توانیم سواری شەمەندەفەر بووم، پاشان بۆ باقی ڕێگەکە تەکسیم گرت، چونکو شەمەندەفەر نەدەگەیشتە ئەوێ. بە تەنیا کەوتمە گەڕان، هەر چاوەچاوم بوو، بەڕاستی پێم خۆش نەبوو لەوێم. ناونیشانەکەم دۆزییەوە، بینایەکی چەند ماڵی بچوکی داڕوخاو بوو، لە دەرگام دا. وەڵام نەبوو. بەدەوری بیناکەدا گەڕام و هەوڵمدا خۆم بەرزکەمەوە بۆئەوەی لە پەنجەرەکەوە تەماشا بکەم، بەڵام نەمتوانی هیچ شتێك بەدیبکەم. دەبێت لە کوێ بێت - بە ڕۆژ بۆ کوێ دەچێت؟ بیرم لێکردەوە. ئا بار. کەوتمە ڕێ، کە گەیشتم بە نزیکترین بار، خۆمم پیاکرد و میستەر نۆسولیڤانم لە ناو بارەکەدا دۆزیەوە. "من دەناسیتەوە؟" پرسیارم لێکرد. پیاوە پیرەکە لە سەرشانەوە تەماشای کردم، پاشان خێرا گەڕایەوە دۆخی خۆی و ڕێك بۆ پێشەوە چاوی بریە بتڵە خواردنەوەکانی پشت بارەکە. *واریس خێرا بیرکەرەوە.* دەبێت ئەو هەواڵە ناخۆشەی پێڕاگەیەنم و داوای لێبکەم، لەگەڵمدا بێت بۆ کەنتوری پەنابەران، دەمزانی نایەت بۆ ئەوێ. "ئەمە بەسەرهاتەکەیە، میستەر نۆسولڤیان. کەنتوری پەنابەران پاسپۆرتەکەمیان گلداوەتەوە. دەیانەوێ لەگەڵ تۆ قسە بکەن، تەنیا یەك دوو پرسیاری کورتت لێدەکەن پێش ئەوەی پاسپۆرتەکەم بۆ بگەڕێننەوە. دەزانیت، دەبێت دڵنیایان بکەیت، بەڕاستی شوومان بە یەکتر کردووە.نەمتوانی ئەو پارێزدەرە نەعلەتییەم بدۆزمەوە - دیار نییە، لەبەرئەوە کەس نەبوو یارمەتیم بدات." هێشتا هەر ڕێك تەماشای پێشەوەی دەکرد، قومێکی لە ویسکییەکەی دا و سەری بادا. "سەیرکە، دوو هەزار پاوەندم دا بە تۆ بۆئەوەی یارمەتیم بدەی ئەو پاسپۆرتە دەربهێنم!"

ئەمە سەرنجی ڕاكێشا. لایكردەوە بۆ تەماشاكردنم، لە سەرسامیدا دەمی داچەقاند. 'تۆ سەد و پەنجات پێداوم، گوڵەكەم. هەرگیز لە هەموو ژیانمدا دوو هەزار پاوەندم نەبووە یان ئەگەر بمبوایە لە شوێنێكی وەك كرۆیدۆن دەگیرسامەوە.'

'من دوو هەزارم داوە بە هارۆلد ویلەر بۆ تۆ بۆئەوەی بمكەی بە ژنی خۆت!'

'باشە، ئەو نەیداوە بە من. ئەگەر تۆ ئەوەندە كەری دوو هەزار پاوەندت داوە بەو پیاوە، ئەوە گرفتی خۆتە - نەك من.' داوام لێكرد، لێی پاڕامەوە یارمەتیم بدات، بەڵام هیچ مەیلی نەبوو. بەڵێنم پێدا، كە پێویست ناكات شەمەندەفەر بگرێت بۆ كەنتوری پەنابەران، بە تەكسی دەیبەم. بەڵام بەسەر كورسی باڕەكەوە جوڵەی نەكرد.

كەوتمە گەڕان بەدوای شتێكدا، پاڵپێوەنەر بێت بۆی، پێم وت، 'سەیركە، پارەت پێدەدەم، پارەی زیاترت پێدەدەم. پاش سەردانی كەنتوری پەنابەران، دەچین بۆ باڕ و چەند دەتوانی  بە هەوەسی خۆت بخۆرەوە.' ئەم بەڵێنە مەیلێكی گوماناوی تیادا دروست كرد و لایكردەوە و برۆكانی بەرزكردەوە. *دەی واریس خەریك بە و ئەم كرەوە ببەرەوە.* 'ویسكی، ویسكییەكی زۆر زۆر، پەرداخی پڕ ویسكی بەدرێژایی باڕەكە. باشە؟ سبەینێ بەیانی دێم بۆ ماڵەوەتان و تەكسییەك دەگرین بۆ لەندەن. تەنیا چەند خولەكێك دەبات، دوو پرسیاری كورت - پاشان یەكسەر بەرەو باڕ. باشە؟' سەری بۆ لەقاندم و گەڕایەوە سەر تێڕامانی بتڵە خواردنەوەكانی پشت باڕەكە.

بۆ سبەینێ بەیانی گەڕامەوە بۆ كرۆیدۆن و لە دەرگای ماڵی پیاوە پیرەكەم دا. بەڵام وەڵام نەبوو. چوومە خوارەوە بۆ سەر جادە چۆڵەكە و بەرەو باڕەكە كەوتمە ڕێ و چوومە ژوورەوە، بەڵام تەنیا كەسێك كە لەوێ بوو مەیخانەچییەكە بوو، بەروانكەیەكی سپی لەبەردابوو، قاوەی دەخواردەوە و خەریكی ڕۆژنامە خوێندنەوە بوو. 'ئیمڕۆ میستەر ئۆسۆلیڤانت بینیوە؟'

سەرێکی بادا و وتی، "هێشتا زووە بۆ ئەو، گوڵەکەم." خێرا گەڕامەوە بۆ ماڵی ئەو درۆزنە سوالکەرە و کەوتمە کوتانی دەرگاکەی. ئەم جارەش بێ وەڵام بوو، لەسەر پێپلیکانەی بەردەرگاکەی دانیشتم، بۆنی میز دەهات، دەستم بە لووتمەوە گرت. لەکاتێکدا لەوێدا دانیشتبووم، بیرم دەکردەوە چی بکەم، دوو کوڕی مۆنی تەمەن بیستەکان هاتنە سەرەوە و لەبەردەممدا ڕاوەستان.

"تۆ کێیت؟" یەکێکیان پیاماهەڵشاخی. "وە بۆچی لەسەر پێپلیکانەی باوکم دانیشتووی؟"

"نۆی، سلاو،" بە ڕوویەکی خۆشەوە وتم. "نازانم ئێوە دەزانن، من شووم بە باوکتان کردووە."

هەر دووکیان چاویان تێبڕیم، گەورەکەیان هاواری لێکردم، "چی! چ قسەیەکی قۆڕ دەکەی؟"

"سەیرکەن، ئێوە دەزانن من گرفتێکی گەورەم هەیە و پێویستیم بە یارمەتی باوکتان هەیە. هەموو ئەوەی من لەوم دەوێت، بێت لەگەڵمدا بۆ شار بۆ کەنتور و وەڵامی چەند پرسیار بداتەوە. پاسپۆرتەکەمیان گلداوەتەوە و دەمەوێت وەریگرمەوە، لەبەرئەوە تکا..."

"ونبە لەم ناوە، قوز حیز!"

"ها، سەیرکەن! هەرچی پارەیەکم هەبووە، داومە بەو پیاوە پیرە،" ئەمەم وت و دەستم بۆ دەرگاکەی ڕاکێشا. "وە من بێ ئەو لەم ناوە ناڕۆم." بەڵام کوڕەکەی شتێکی تری لە ژێر سەردا بوو. کوتەکێکی لە پاڵتۆکەی دەرهێنا و لێمی بەرزکردەوە، وەك ئەوەی بیەوێ کەللەی سەرم بشکێنێ.

"ئاوا؟ ئێستا دێینە وێزەت. فێرت دەکەین چۆن بێیتە ئەم ناوەو درۆ بکەیت -" براکەی زەردەخەنە گرتی و پێکەنی، لە زەردەخەنەکەی وردبوومەوە، هەندێك دانی کەوتبوو. ئەمە بۆ من بەس بوو. زانیم ئەم کوڕانە هیچیان نییە لە دەستی بدەن.

لەسەر ئەم پێپلیکانە دەستم لێهەڵناگرن تا دەمکوژن و کەسیش پێم نازانێت - یان گوێ نادەنێ. قەڵەمبازێکم دا و بۆی دەرچووم. چەند کۆڵان دوام کەوتن، پاشان بە ترساندنی من، دەستیان هەڵگرت.

بەڵام کە گەیشتمە ماڵەوە، بڕیارم دا دووبارە بگەڕێمەوە بۆ کرۆیدۆن و بەردەوام بم تا ئەو پیاوە پیرە دەدۆزمەوە. چونکو هیچ ڕێگایەکی ترم نەبوو. لەو کاتەدا نەك هەر کرێ خانووم نەدەدا بە فرانکیە، بەڵکو نانخواردنیشم کەوتە سەر ئەو. لەگەڵ ئەوەش لە هاوڕێکانم پارەم قەرز دەکرد بۆ خەرجی، وە ئەم هەلومەرجە نەیدەتوانی زۆر بەردەوام بێت. هەرچی پارەم هەبوو خستبوومە دەستی ئەو جەردەیەوە، کە خۆی وا پیشان دەدا پارێزەری پەنابەرانە، بەبێ پاسپۆرتیش نەمدەتوانی کار بکەم. ئینجا چیم هەیە لە دەستی بدەم؟ هەندێك دان ئەگەر وریا نەبم، بەڵام بڕیارم دابوو لەو تاوانبارانە زۆرزانتر بم، ئەمەش زۆر قورس نەبوو.

دوای نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی گەڕامەوە، بە هێواشی پیاسەیەکم بەو ناوەدا کرد، هەوڵم دا لەبەردەمی خانووی پیاوە پیرەکەدا نەوەستم. باخچەیەکم دۆزییەوە و لەسەر قەنەفەیەك دانیشتم، چەند خولەکی نەبرد میستەر نۆسولیڤان خۆی دەرکەوت. نازانم لەبەر چی، سەرحاڵ بوو، پێی خۆش بوو منی بینی. خێرا ڕازیبوو لەگەڵم سواری تەکسی بێت و بچین بۆ لەندەن. 'پارەم پێدەدەی، وانییە؟' سەرم بۆ لەقاند. 'وە پاشان خواردنەوەم بۆ دەکڕیت، کچۆڵە؟'

'هەرچی خواردنەوە تۆ بتەوێت بۆتی دەکڕم، کاتێك تەواو بووین. بەڵام لە پێشدا دەبێت تۆزێك ئاسایی بیت، کاتێك بۆ خەڵکی ئەو کەنتورە قسە دەکەیت. ئەوانە زۆر زۆڵن، دەزانی. ئیتر پاش ئەوە دەچین بۆ باڕ...'

کە چووینە ناو کەنتوری پەنابەرانەوە، کارمەندێك تەماشایەکی میستەر نۆسولیڤانی کرد و بە ڕووگرژییەکی زۆرەوە وتی، 'ئا ئەمە مێردەکەتە؟'

"بەڵێ."

"باشە میستەر ئۆسولیڤان، با دەست لەم یارییانە هەڵگرین. ئەم بەسەرهاتە چییە؟" هەناسەیەکم هەڵکێشا، زانیم بەردەوامی ئەم چاوشارکێیە کەڵکی نییە. چی لە دڵمدا بوو هەڵم ڕشت و ئەوەی دەمزانی پێم وتن، سەبارەت بە کاری مانیکان، هارۆلد ویلەر و ئەوەی کە پێی دەوترا شووکردنەکەم. میستەر ویلەریان زۆر بۆ مەبەست بوو، تەواوی زانیارییەك کە هەمبوو لەسەری پێم دان، بە ناونیشانەکەشیەوە. "سەبارەت بە پاسپۆرتەکەت، پاش تەواو بوونی لێکۆڵینەوەکانمان، لە چەند ڕۆژی داهاتوودا پەیوەندیت پێوە دەکەین." ئەوە هەمووی بوو، پاشان ڕێگەیان داین بچینە دەرەوە.

کە چووینە سەر جادەکە، کێچ کەوتە کەوڵی میستەر ئۆسولیڤان بۆ بارە. "چاکە، پارەت دەوێت؟ بگرە ..." دەستم بۆ جانتاکەم برد، دوا بیست پاوەندیم دەرهێنا و خستمە قولە مستییەوە. "ئێستا ئیتر ونبە لەبەرچاوم. ئیتر لەوە زیاتر توانای تەماشاکردنی تۆم نییە."

"ئەمە هەموویەتی؟" میستەر ئۆسولیڤان بیست پاوەندی کاغەزییەکەی بادەدا. "ئەمە هەموویەتی وەری دەگرم؟" پشتم تێکرد و لە شەقامەکە بەرەو خواربوومەوە. "سۆزانی!" هاواری لێکردم. خۆی بۆ دواوە ڕاست کردەوە، بۆ ئەوەی هەناسەی تەواو وەرگرێت. "تۆ حیزی سۆزانی!" خەڵکێك کە لەوناوە دەڕۆیشتن، لایان کردەوە بۆ سەیرکردنی من. لەوانەیە وا بە خەیاڵیاندا بێت، ئەگەر من لەشفرۆش بم، بۆ پارە بەو دەدەم.

پاش چەند ڕۆژ کەنتوری پەنابەران تەلەفونیان کرد و داوایان لێکردم، بچم بۆ کەنتورەکەیان. وتیان لە هارۆلد ویلەر کۆڵیوینەتەوە، بەڵام جارێ زۆر شتیان بۆ ڕۆشن نەبۆتەوە. سکرتێرەکەی وتویەتی ڕۆیشتووە بۆ هندستان و ڕۆشن نییە کەی دەگەڕێتەوە. بەڵام پاسپۆرتێکی کاتی بۆ دوو مانگیان دا بە من. ئەمە یەکەم وچان

بوو لە تەواوی ئەو گرفتەی تێیکەوتبووم و پەیمانم لەگەڵ خۆم بەست تەواوی کەڵك لەو دوو مانگە وەرگرم.

بڕیارم دا، لەپێشدا سەفەری ئیتالیا بکەم، چونکو تۆزێك قسەم بە زمانەکەی دەکرد، لەوەوپێش لە وڵاتێکدا ژیابووم کە کولۆنیالی ئەو بووە. ڕۆشن بوو، ئەوەی زیاتر دەمزانی لە زمانی ئیتالیایی جنێوەکانی دایکم بوو، بەڵام هەر بە کەڵك دەهات. چووم بۆ میلان و پێم خۆشبوو، بەشداریم کرد لە نواندنی مۆدێلی جلوبەرگدا. لەم ماوەیەدا بە مانیکانێکی تر ئاشنا بووم، بە ناوی جولیا. جولیا باڵا بەرزێك بوو، قژ زەرد تا سەر شان درێژ و لەش و لارێکی جوان، زیاتر جلوبەرگی ژێرەوەی نمایش دەدا. پێکەوە کاتێکی خۆشمان بردەسەر بە گەڕان بە ناو میلاندا، کاتێك کە خۆپشاندانەکە تەواو بوو، بڕیارمان دا بچین بۆ پاریس و لەوێش پێکەوە بەختی خۆمان تاقی بکەینەوە.

ئەو دوو مانگە جەژن بوو بۆ من، چوومە شوێنی تازە، خەڵکی ترم بینی، خواردنی جیاوازم خوارد. لەگەڵ ئەوەش پارەیەکی وا زۆرم بەدەست نەهێنا، هەر بەشی ئەوەی کرد لە کاتی گەڕانمدا بە ناو ئەوروپادا خەرجی بکەم. پاشان کاتێك کارمان لە پاریس تەواو بوو، من و جولیا پێکەوە گەڕاینەوە بۆ لەندەن.

کە گەڕامەوە چاوم بە نوێنەرێك کەوت لە نیویورکەوە هاتبوو، کە بەدوای بەهرەمەندانی تازەدا دەگەڕا. داوای لێکردم بچم بۆ نەتەوە یکگرتووەکان و لەوێ ئیشێکی زۆری مانیکانم پێبدات. بێگومان زۆر حەزم دەکرد، چونکو هەموو کەسێك لەو باوەڕەدا بوو، کە نیویورك بازاڕێکە بەپیتە بۆ هەموو کاڵایەك، بەتایبەتی بۆ مانیکانی ڕەشپێست. ئاژانسەکەم بۆی ڕێکخستم و داوای ڤیزەی بۆ کردم بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان.

باڵوێزخانەی ئەمریکا چاوێکی بە کاغەزەکانمدا خشاند، پاشان یەکسەر پەیوەندی کرد بە کاربەدەستانی بەریتانیاوە. سەرئەنجامی ئەم پەیوەندییە بوو بە نامەیەك،

کە تیادا ڕاگەیاندرابوو، لە ماوەی سی ڕۆژدا دیپۆرت دەکرێمەوە بۆ سۆماڵ. چاو بە فرمێسک تەلەفونم کرد بۆ جولیا، کە لەلای براکەی بوو لە واڵس.

"کەوتومەتە گرفتەوە گرفتێکی گەورە. کچێ، هەموو شتێك بۆ من تەواوبوو. دەبێت بگەڕێمەوە بۆ سۆماڵ."

"نا، واریس. باشە بۆ چەند ڕۆژ بۆچی نایەیت بۆ ئێرە و بایەکی باڵی خۆت بدەیت؟ دەتوانی شەمەندەفەر بگریت. زۆر دوور نییە لە لەندەنەوە، ئێرەش زۆر خۆشە. بۆت باش دەبێت ماوەیەك لەوێ دووركەویتەوە و لەوانەیە ئێمەش لێرە ڕێگا چارەیەکمان بێت بە خەیاڵدا."

کە گەیشتم، جولیا لە ئێستگا منی هەڵگرت، بە ناو ناوچەیەکی سەوزانی دەردەوەی شاردا منی گەیاندە ماڵەوەیان. لە ژووری دانیشتنەکەیان دانیشتین و نیگلی براشی هات بۆ لامان. پیاوێکی باڵا کورتی ڕەنگ پەڕیوو، بە ڕیشێکی سووری درێژەوە و دانەکانی پێشەوەی و نینۆکەکانی ڕەنگی نیکۆتینیان گرتبوو. پیرتر دیاربوو وەك لەوەی چاوەڕوانم دەکرد، تەمەنی لە سەرەتای پەنجاکاندا بوو. لەسەر سینییەك چای بۆ هێناین، پاشان دانیشت و کەوتە کێشانی جگەرەی یەك لەسەر یەك، کاتێك باسی دێوەزمەی گرفتی پاسپۆرتم دەکرد و کە چۆن بەم سەرئەنجامە غەمناکاوییە گەیشتووە.

نیگل پاڵی دابۆوە بە کورسیەکەیەوە و هەردوو دەستی خۆی گرتبوو، کە لەپڕ وتی، "نیگەران مەبە، من یارمەتیت دەدەم." گێژبووم لە وتەی ئەم کابرایە، کە تەنیا سی خولەکێك بوو دەمناسی، پێم وت، "چۆن ئەمە دەکەیت؟ چۆن یارمەتیم دەدەی؟"

"دەتکەم بە ژنی خۆم."

سەرم بادا. "نا، نا، ئەو بەزمەم دیوە. هەر ئەمەش توشی ئەم دەردیسەرییەی کردم. خۆم توشی هەمان کێشە ناکەمەوە. بەسە. دەرەقەتی ئەم بەزمە نایەم.

دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ ئەفریقا، دڵخۆش دەبم، خێزانەکەم لەوێیە و بە هەموو شتێکی ناشنام. هیچ شتێك لەبارەی ئەم وڵاتە شێتەوە نازانم. هەراوهوریایە، هیچ شتێك لە جێگای خۆیدا نییە. دەگەڕێمەوەماڵەوە.'

نیگل هەستایە سەر پێ و بە خێرایی بەسەر پێپلیکەکاندا سەرکەوت. کە گەڕایەوە، ئەو سەندەی تایمزەی کە وێنەی منی پێوە بوو، بەدەستێوە بوو. ئەوەی کە ساڵێك لەوەوپێش دەرچووبوو، زۆر پێش ئەوەی جولیا بناسم. 'چی پێ دەکەیت؟'

'هەڵم گرتبوو چونکو دەمزانی ڕۆژێك دێت، تووشی دەبم.' ئاماژەی بە چاوم کرد لە وێنەکەدا. 'ئەو ڕۆژەی چاوم بەو وێنەیە کەوت، لە چاوانتا فرمێسکم بینی، بە سەر ڕوومەتەکانتا دەهاتە خوارەوە. کاتێك دەموچاوتم بینی، گریانم تیادا بەدیکرد و زانیم پێویستت بە یارمەتی هەیە. پاشان خوا پێی وتم - خوا وتی، ئەرکی منە پارێزگاری تۆ بکەم.'

نۆی، قسەی پوچ، بە چاوی سەرسوڕمانەوە لێی ورد بوومەوە، بیرم کردەوە: *ئەم شێتە کێیە؟ خۆی کەسەێکە پێویستی بە یارمەتی هەیە*. بەڵام لە پشوی کۆتایی هەفتەدا، نیگل و جولیا هەردووکیان دڵنیایان کردم، ئەگەر بتوانێت یارمەتیم بدات، بۆچی نا؟ چ داهاتوویەکم لە سۆماڵدا هەیە بگەڕێمەوە؟ لەوێ چی چاوەڕوانم دەکات؟ بزن و حوشترەکانم؟ لە نیگل ئەو پرسیارەم کرد، کە لەسەرمدا دەخولایەوە: ' ئەمە بۆ تۆ چی تیادایە؟ بۆچی دەتەوێت بمهێنی و خۆت تووشی ئەم بەزمە دەکەیت؟'

'پێم وتی - هیچ شتێکم لە تۆ ناوێت. خوا منی بۆ تۆ ناردووە.' بۆم باسکرد کە هێنانی من، تەنیا ئەو کارە ناسانە نییە بچین بۆ تۆمارگای هاوسەرێتی. هەر ئێستا من مێردم هەیە.

'چاکە، دەتوانی لێی جیابیتەوە و بە دەزگای دەوڵەتی ڕادەگەیەنین، کە ئێمە نیازمان هەیە شوو بە یەکتری بکەین.' نیگل وتی، 'ئیتر دیپۆرتت ناکەن. لەگەڵت

دێـم. مەبەسـتمە. مـن هـاووڵاتی بـەریتانیم - نـاتوانن بڵـێن نـا. سـەیرکە، مـن زۆر نیگەرانی تۆم و لە خزمەتت دام بۆ یارمەتی. هەرچی بتوانم دەیکەم.'

'چاکە، زۆر زۆر سوپاست دەکەم...'

جولیـاش وتـی، 'سـەیرکە واریـس، ئەگـەر دەتوانێـت، بـا یارمـەتیت بـدات. ئـەم ڕێکەوتە لەدەست خـۆت مـەدە، چـونکو ج ڕێگایـەکی تـرت هەیـە؟' پـاش چـەند ڕۆژ قسەوباس بڕیاری خۆمم دا، چونکو ئەو هاوڕێم بوو، ئەویش برای بوو. دەمزانـی لـە کوێ دەژی و دەمتوانی متمانەی پێبکەم. جولیاش ڕاسـتی دەوت: ئـەم هەلـە لەدەست خۆم نەدەم.

دانیشتین پلانێکمان چنی، کە نیگل لەگەڵمـدا بێـت بـۆ قسەکردن لەگـەڵ میـستەر نۆسولیڤان سەبارەت بە جیابوونەوە، چونکو بەڕاستی نەمدەویست بە تەنیا دووبـارە خۆم تووشی ئەو کوڕانە کەمەوە. هێنامـە بەرچـاوی خـۆم وەك ئاسـایی کـە هـەموو شتێك پەیوەندی بەم پیاوە پیرەوە هـەبێت - پـارەی دەوێـت پـێش ئـەوەی ڕازی بێـت لەسەر هەر شتێك. هەناسەیەکم هەڵکێشا، بیرکردنەوە لەبارەی ئەمـەوە لـە پـەلوپۆی دەخستم. بەڵام هاوڕێکەم و براکەی بەردەوام داوایان لێدەکردم کە کۆڵنەدەم، وە مـن زیاتر بە پلانەکە هیوام پەیدا کرد. 'با بڕۆین،' نیگل وتی. 'سبەینێ لێدەخوڕین بـۆ کرۆیدۆن.'

بۆ ڕۆژی دوایی هەردووکمان بەرەو گەڕەکی پیاوە پیرەکـە کەوتینـە ڕێ و ڕێنمـایی نیگلم کرد بۆ ماڵەکەی. 'وریای خۆت بە،' نـیگلم ئاگـادار کـردەوە کاتێـك بـە ڕێگـاوە بـووین. 'ئـەو پیاوانـە - کوڕەکـانی - شـێتن. مەبەسـتمە بڵـێم، ترسـم هەیـە لـە نوتومبیلەکە بێمە خوارەوە.' نیگل پێکەنی. 'بەڕاستمە. بـۆ لێـدانم بەدوامـدا ڕایـان کرد. ئەوانە شێتن، من پێت دەڵێم. دەبێت زۆر باش ئاگاداری خۆمان بین.'

'واریـس بـا بـڕۆین. تـەنیا بـەو پیـاوە پـیرە دەڵـێین، تـۆ جیادەبیتـەوە. وە ئـەوە هەموویەتی. کارێکی گەورە نییە.'

ئەو کاتەی گەیشتینە ماڵی میستەر ئۆسولیڤان، پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو، ئوتومبیلەکەمان لە جادەکەی پێشیان پارك کرد. کە نیگل لە دەرگاکەی دەدا، من تەماشای دەوروپشتی خۆم و سەرجادەکەم دەکرد. وەڵام نەبوو، بەڵام بۆ من جێگای سەرسامی نەبوو. پێشبینی ئەوەم دەکرد، کە دەبێت جاریکی تر بڕۆین و سەرێکی بارەگە بدەین.

نیگل وتی، 'وەرە، با بچین دەورو پشتێك بکەین و لە پەنجەرەوە تەماشا بکەین و بزانین لە ماڵەوەیە.' پێم خۆش نەبوو، هەروا با ئاسانی تەماشای ناو پەنجەرە بکات. بەڵام پاش گەڕانی بێهودەی چەند پەنجەرە، نیگل بە پەرێشانییەوە سەیرێکی منی کرد. 'هەست دەکەم شتێکی ناجۆر هەبێت.' لە دڵی خۆمدا وتم، *ئینجا ئێستا تێگەیشتیت. هەر کاتێك هەر شتێکم لەگەڵ ئەو پیسەدا بووبێت، ئەو هەستەم هەبووە.*

'مەبەستت لە "شتێکی ناجۆر" چییە؟'

'نازانم ... وا هەست دەکەم ... ئەگەر بتوانم لەوانەیە لەم پەنجەرەیەوە بچمە ژوورێ' - ئەوەی وت و بە لەپی دەستی کەوتە کوتانی یەکێك لە پەنجەرەکان بۆئەوەی بیکاتەوە.

دراوسێکەی تەنیشتیان هاتە دەرەوە و هاواری کرد، ' ئەگەر بە دوای میستەر ئۆسولیڤاندا دەگەڕێن، ئێمە بۆ چەند هەفتە دەچێت نەمان بینیوە.' کەتێك ئەو ڕاوەستابوو، دەستی خۆی بەسەر بەرکۆشەکەیەوە گرتبوو، تەماشای ئێمەی دەکرد، نیگل شوشەی پەنجەرەیەکی شکاند و بۆگەنێکی پیس هاتە دەرەوە. بە هەر دوو دەست دەم و لووتی خۆمم گرت و دوورکەوتمەوە. نیگل دانەویەوە و لە کونی پەنجەرە شکاوەکەوە تەماشای ناوەوەی کرد. 'مردووە - دیارە، لەسەر ئەرزەکە کەوتووە.'

بـە ژنـە دراوسـێکەیمان وت، تەلـەفون بکـات بـۆ ئـەمبولانس، خۆشمـان سـواری ئوتومبیلەکە بـووین و گەڕاینـەوە. پـێم خـۆش نییـە بیڵێم، بـەڵام ئـاهێکی خۆشـیم تێگەڕا.

بـە ماوەیـەکی کـورت، پـاش دۆزینـەوەی میـستەر ئۆسـولیڤان بـە مردویـی لـە چێشتخانەی ماڵەکەیاندا، من و نیگل بووین بە هاوسەری یەکتر. حکومەتی بەریتانی دیپۆرتکردنـەوەی مـنی وەسـتاند، بـەڵام ئەشـیان شـاردەوە کـە لـەو بـاوەڕەدان شووکردنەکەمان ساختەیە. بێگومان کە وابوو. لەگەڵ ئەوەشدا من و نیگل لەسەر ئەوە ڕێکەوتین، کە تا پاسپۆرت وەردەگرم، باشترە لە ماڵەکەی لە والس بمێنمەوە.

پـاش ئـەوەی کـە لـە مەقادیـشۆ بـووم، پاشـان لـە لەنـدەن، حـەوت سـاڵ بـوو بـیرم چووبۆوە، کـە چـەند خۆشـی لـە سروشـت دەبیـنم. لەگـەڵ ئـەوەی ئێـرە ناوچـەیەکی سەرسەوز بوو، بە کیلگـەی زۆر و ڕوبـارەوە و تـەواو جیـاواز لـە بیابانـەکانی سۆماڵ، کاتێکی خۆشم بردەسەر، بە پێچەوانەی ئەوەی لە خانووی بەرزدا بـی بـە ئاسمانـەوە یان لە ستۆدیوی بێ پەنجەرە. لە والس ئەو شتانەی کە مایەی خۆشیم بوو لە ژیـانی کۆچـەریدا، دەسـتم پێکـردەوە: ڕاکـردن، پیاسـەکردن، لێکردنـەوەی گـوڵی نێـو دار و دەوەن و میزکردن لە دەرەوە. هەڵدەکەوت خەڵك بمبیـنن، بـە قنگـی ڕووتـەوە لـەناو دەوەنەکاندا.

مـن و نیگـل لـە دوو ژووری جیـاوازدا دەژیـاین وەك دوو هـاوڕێ - نـەك وەك ژن و مێرد. لەسەر ئەوە ڕێکەوتبووین، کە ئەو من مارەبکات تا بتـوانم پاسپۆرت وەرگـرم، سـەرەڕای ئـەوەش کـەی مـن پـارەم بـوو یارمـەتی بـدەم، ئـەویش پێـی لەسـەر ئـەوە دادەگرت، کـە لەبەرامبـەردا هـیچ چاوەڕوانییەکی نییـە. نیگـل لـە پـەیڕەوی کردنـی ئامۆژگارییەکانی خوادا، سەبارەت بـە یارمـەتی دانـی ئەوانـەی لـە تالووکـەدان، تـەنیا پاداشتی خوای دەویست. بەیانییەکیان زووتـر لـە ئاسایی لـە خـەو هەڵسام، بـەنیازی

ئەوەی بچم بۆ لەندەن بۆ نواندن. لە پێپلیکەکان هاتمە خوارەوە، قاوەم ئامادەکرد، هێشتا نیگل لە ژوورەکەی لە جێگادا بوو. دەستکێشە لاستیکە زەردەکانم لە دەستدا بوو، خەریکی قاپ شتن بووم، کە زەنگی دەرگا لێدرا.

بە دەستکێشەکانەوە، هێشتا کەف لێدەتکا، دەرگام کردەوە و دوو پیاوم بینی ڕاوەستابوون. قاتی خاکیان لەبەردابوو، بە دەموچاوی مۆنەوە و یەکی جانتایەکی ڕەشیان بەدەستەوە بوو. 'میسس ریچاردس؟'

'بەڵێ؟'

'مێردەکەت لێرەیە؟'

'بەڵێ، لە سەرەوەیە.'

'تکایە ڕێگامان بدە بێینە ژوورە. ئێمە بە کارێکی ڕەسمی دەوڵەتی هاتووین.' هاوکات لەوەدەچوو کەسێکی تر لەوناوە بگەڕێ و تەماشا بکات.

'فەرموو، وەرنە ژوورەوە - سلاو، قاوەتان دەوێ یان شتێکی تر؟ دانیشن ئێستا بانگی دەکەم.' لە ژووری دانیشتن، لەسەر کورسییە خۆشەکانی نیگل دانیشتن، بەبێ ئەوەی پاڵبدەنەوە. 'هۆ، دڵەکەم،' خۆشەویستانە بانگم کرد. 'وەرە خوارەوە، تکایە. لێرە میوانمان هەیە.'

بەچاوی خەواڵوو و قژی ئاڵۆسکاوەوە هاتە خوارەوە. 'سلاو.' نیگل بە بینینیان یەکسەر زانی کێن. 'بەڵێ، دەتوانم یارمەتیتان بدەم؟'

'بەڵێ، چاکە، تەنیا چەند پرسیارێکمان هەیە، کە لە تۆی بکەین. لەپێش هەموو شتێکدا دەمانەوێت دڵنیابین تۆ و ژنەکەت پێکەوە دەژین. ئایا پێکەوە دەژین؟'

غەزەب لە دەموچاوی نیگل دەباری، هەروا پاڵم دا بە دیوارەکەوە و کەوتمە تەماشاکردنیان. 'باشە، ئێستا ئێوە چۆنی دەبینن؟'نیگل تەقییەوە.

هەر دوو بریکارەکە بە نیگەرانیەوە چاوێکیان گێڕا بە ناو ژوورەکەدا. 'ئمم. بەڵێ گەورەم. ئێمە باوەڕ بە تۆ دەکەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت سەیرێکی ناو ماڵەکەت بکەین.'

نیگل دەموچاوی ڕەش هەڵگەڕا، لە هەوری چڵکن دەچوو، مەترسیدار بوو. 'سەیرکەن. دوو پێتان ناجوڵێ بە ناو ماڵی مندا. بۆم گرنگ نییە ئێوە کێن. ئەوە ژنمە، پێکەوە دەژین، بە چاوی خۆتان دەیبینن چۆنە. بێئاگادارکردنەوە هاتوون - خۆمان نەگۆڕیوە - لەبەرئەوە لە ماڵی من بچنە دەرەوە!'

'میستەر ریچادس، نابێت خۆت تووڕە کەیت. بەپێی یاسا پێویستە لەسەرمان -'

'بە بینینتان تێکدەچم!!!' *ونبن، بڕۆن ونبن تا زووە.* بەسەرسامی و دەموچاوی داتەپیوانەوە، هەروا دانیشتن، وەك ئەوەی بە کورسییەکاندا داکوترابن. 'بڕۆنە دەردوە لە ماڵی من! جارێکی تر بەم ناوەدا بێنەوە، هەتا ئەگەر تەلەفونیشم بۆ بکەن، دەست دەدەمە تفەنگ و پێتانەوە دەنێم و بۆ ئەو لەپێناوی ئەو گیانی خۆم بەختدەکەم.' ئەمەی وت و ئاماژەی بۆ من کرد.

سەرم بادەدا و بیرم کردەوە. *ئەم پیاوە شێتە، بەڕاستی بەڕاستی حەزی لە من کردووە و من لە گێژاوێکی قووڵدام. ئەرێ من چی دەکەم لێرە؟ دەبوایە بڕۆشتمایەوە بۆ ئەفریقا - لەوێ باشتر دەبووم.* پاش ئەوەی دوو مانگ لەوێ بووم، جارێکیان بە نیگلم وت، 'نیگل، بۆچی خۆت پاکوتەمیز ڕاناگری، جوتێ پێڵاوی جوان لە پێکە و کچێکی برادەر بگرە؟ با من یارمەتیت بدەم.'

ئەویش هاتە وەڵام و وتی، 'برادەری کچ؟ برادەری کچم بۆچییە. ئەی هاوار من ژنم هەیە - لەگەڵ برادەری کچ چی بکەم؟'

کە وای وت، پەڕۆ بە دەمەوە نەما. 'شێتە، بڕۆ سەرە حیزەکەت بخەرە ناو تەوالێتەوە و ناوی پیابکە! پیاو، وەرەوە سەرخۆت و لە ژیانی من دەرچۆ! من تۆم خۆشناوێت! من و تۆ پەیمانمان بەستووە - تۆ ویستت یارمەتی من بدەی - بەڵام من

ناتوانم ئەوە بم کە تۆ دەتەوێت. من ناتوانم خۆم وا پیشان بدەم، تۆم خۆشدەوێت لەبەرئەوەی دڵت خۆشبێت' لەگەڵ ئەوەی من و نیگل پەیمانمان بەستبوو، بەڵام نیگل شکاندی و دوای شتی خۆی کەوت. کاتێك کە خۆی شین و مۆر کردەوە و بەرووی بریکارەکاندا تەقییەوە، لەگەڵ خۆیدا درۆی نەدەکرد. لە مێشکی ئەودا هەموو وشەیەك دروست بوو. لەگەڵ ئەوەشدا شتەکان زۆر ئاڵۆزتر بوون، چونکو من پشتم پێی بەستبوو. وەك هاورێیەك زۆر مەمنونی بووم، بەڵام نەمدەویست پەیوەندییەکی رۆمانتیکیم لەگەڵیدا هەبێت، بەراستی ویستم بیکوژم، کاتێك دەستی کرد بەوەی وا هەڵسوکەوت بکات، کە من هاوسەری خۆشەویست و شتی شەخسی ئەو بم. خێرا زانیم، دەبێت دەرچم تا زووتر باشتر.

بەڵام گرفتی پاسپۆرت درێژەی کێشا. هەر کە نیگل زانی پشتم بەو بەستووە، هەستی بەهێزبوون رایکێشا بۆئەوەی داواکارییەکانی زیاتر و زیاتر بکات. کەوتە ئازار دانی من - لە کوێ بووم، چی دەکەم، لەگەڵ کێ بووم. بەردەوام داوای لێدەکردم، خۆشم بوێ و چەند زیاتر دەپاڕایەوە، زیاتر رقم لێی دەبۆوە. هەندێك جار کارم دەکەوتە لەندەن یان دەچووم بۆ سەردانی هاورێکانم. هەر هەلێکم بۆ رێك بکەوتایە، لە نیگل دوور دەکەوتمەوە، بەو هیوایەی ژیری خۆم راگرم.

هەرچی چۆنێك بوو، وردە وردە توانایی ژیری خۆمم لەدەست دا، لەکاتێك لەگەڵ پیاوێکدا دەژیام ژیری خۆی لەدەست دابوو. چاوەروانی پاسپۆرت - بلیتی رزگاریم - تا دەهات زیاتر هیلاکی دەکردم. رۆژێکیان دەچووم بۆ لەندەن، لەسەر پلاتفۆرمەکە راوەستابووم، لە ناچاریدا ویستم خۆم فرێدەمە بەردەم شەمەندەفەرەکە. لەو چەند خولەکەدا کە گوێم لە گرمەی هاتنی بوو، هەستم بە هەوای ساردی دەکرد، دەیدا بە قژمدا و بیرم لەو ئاسنە قورسانەی دەکردەوە، کە چۆن ئێسقانەکانم دەشکێنێت. مەیلێکی بەهێزم هەبوو بۆ کۆتایی هێنان بە تەواوی نیگەرانییەکانم، بەڵام لە

کۆتاییدا پرسیارم لە خۆم کرد، *بۆچی لەبەر ئەو پیاوە کۆتایی بە ژیانی خۆم بهێنم؟*

ئەو ڕاستیەش بڵێم، پاش چاوەڕوانی زیاتر لە یەك ساڵ، نیگل چوو بۆ کەنتۆری پەنابەران و هەوڵێکی باشی دا، تا لە کۆتایدا ڕازی بوون، پاسپۆرتێکی کاتیم بدەنێ. هاواری کرد، 'ژنەکەم مانیکانێکی نێونەتەوەییە، هیچ نەبێت پێویستی بە پاسپۆرتێکی کاتییە تا بتوانێت بۆ کارکردن سەفەر بکات.' زرم! جانتای کاری مانیکانەکەمی فڕێ دایە سەر مێزەکە. 'من هاووڵاتییەکی بەریتانیم و ئێوە بەم شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ ژنەکەمدا دەکەن. چاکە - دەترسم، شەرم دەکەم بڵێم ئەمە وڵاتی منە، داواکارم ئەمە هەر ئێستا ڕاگەیەندرێ!' بە ماوەیەکی کورت پاش ئەم سەردانە، حکومەت دەستی بەسەر پاسپۆرتە سۆماڵییەکەمدا گرت و پاسپۆرتێکی کاتییان پێدام، کە دەمتوانی ئەم وڵاتەی پێ بەجێبهێڵم، بەڵام دەبوو بەردەوام تازەی کەمەوە. لە ناوەوە ئەم مۆرەی پێوە بوو 'دەستدەدا بۆ سەفەر بۆ هەموو وڵاتێك بێجگە لە سۆماڵ.' ناخۆشترین وشەگەلێك بوون، کە دەمتوانی بیهێنمە بەرچاوی خۆم. سۆماڵ لە شەڕدا بوو، حکومەتی بەریتانیا نەیدەویست بەرپرسیاربێت لە یەکێك، کە لە ژێر چاودێری خۆیدایەتی، بچێت بۆ وڵاتێك کە شەڕی تیادایە. وەك دانیشتویەکی بەریتانی، حکومەت بەرپرسیار بوو لە من. کاتێك ئەم وشانەم دەخوێندەوە 'دەستدەدا بۆ سەفەر بۆ هەموو وڵاتێك بێجگە لە سۆماڵ.' لەبەرخۆمەوە دەمووت، 'ئای چیم بەخۆم کرد؟ هەتا ناتوانم بچم بۆ وڵاتی خۆم.' ئێستا ئیتر بە تەواوەتی نامۆ بووم.

هیچ کەسێك بە منی وتوە، چی هەڵدەبژێرم، ئەگەر وابوایە، دەموت لە بیری خۆتی بەرەوە، پاسپۆرتە سۆماڵییەکەم بەرەوە. بەڵام هیچ کەسێك ئەم قسەوباسەی لەگەڵ مندا نەکرد. ئیتر زۆر درەنگ کەوتبووم تا پاشگەز ببمەوە. نەمدەتوانی

بگەڕێمەوە، تەنیا یەك ئاڕاستە هەبوو ئەویش بۆ پێشەوە بوو. داوای ڤیزام کرد بۆ ئەمریکا، تەنیا بۆ خۆم جێگایەکم لە فڕۆکە گرت بۆ نیویورك.

## بەشی چواردەیەم
## هەنگاوێکی گەورە

نیگل بەردەوام پێی دادەگرت لەسەر ئەوەی بێت لەگەڵمدا بۆ نیویورك. هەرگیز ئەو شارەی نەدیبوو، کەچی هەموو شتێکی لەبارەیەوە دەزانی: "ئەو شوێنە تەواو گەڕەلاوژێیە. وە تۆ واریس - تۆ نازانی چی دەکەیت، بۆ کوێ دەچیت - بەبێ من تەواو ون دەبی. شوێنێکی بێترس نییە بۆ تۆ، ئەگەر بە تەنیا لەوێ بیت - من دێم بۆ پارێزگاری تۆ." وایە، بەڵام کێ پارێزگاری من بکات لەدەست نیگل؟ یەکێك لە ڕەوشتە خوازراوەکانی لە گفتوگۆدا، دووبارە کردنەوەی لۆژیکی ناهەمواری خۆی بوو هەر دووبارەی دەکردەوە هەر دووبارەی دەکردەوە هەردووبارەی دەکردەوە ... وەك توتی شێت، تا لە پەلوپۆی دەخستی، بۆی گرنگ نەبوو چی پێدەڵێیت. قسەوباس لەگەڵیدا بێهودە بوو. بەڵام ئەم جارەیان خۆم نەدا بەدەستەوە. لەم سەفەرەدا هەلێکی گەورەم دەبینییەوە بۆ داهاتووم، نەك هەر بۆ پیشەکەم، بەڵکو وەك دەستپێکردنێکی تازە دوور لە بەریتانیا، لە نیگل و لە تەواوی ئەو پەیوەندییە ناساغە.

لە ساڵی 1991دا، بە تەنیا گەیشتمە وڵاتە یەکگرتووەکان و فەرمانبەری تۆمارگە لە ئاژانسی نیویورك، شوقەکەی خۆیی پێدام و خۆی چووە لای هاوڕێکانی. شوقەکە لە ڤیلج لە ناوەڕاستی ناوچەیەکی خۆشدا بوو لە مانهاتان. بێجگە لە جێگا نووستنێکی گەورە، ناوماڵێکی وای تیادا نەبوو، ئەم ساکارییە تەواو لەبار بوو بۆ من.

کە گەیشتمە ئەوێ، ئاژانسەکەم کارێکی زۆری بۆ دانابووم و یەکسەر بەشێوەیەك دەستم پێکرد، کە هەرگیز لەوەو پێش شتی وام بە خۆمەوە نەدیبوو، وە پارەیەکم پێکەوە نا، کە هەرگیز لەوەو پێش نەمبووبوو. یەکەم هەفتە کە گەیشتمە ئەوێ،

تەواوی ڕۆژەکان کارم کرد. پاش چوار ساڵ کۆشش بۆ دۆزینەوەی کار، گلەییەکم نەما.

هەموو شتێك چاك دەچووە پێشەوە تا پاش نیوەڕۆیەکیان، کاتێك کە لە نواندن بوومەوە. لەکاتی وچاندا، تەلەفونم کرد بۆ ئاژانس بۆ پشکنینی کاتە دیاریکراوەکانی ڕۆژی دوایی. فەرمانبەری تۆمارگەکە وتی، 'هاوسەرەکەشت تەلەفونی کرد. بە ڕێگاوەیە و ئیمشەو لە شوقەکە یەکتری دەبینن.'

'هاوسەرەکەم - ناونیشانی ئەو شوێنەت پێدا کە من تیایدا دەژیم؟'

'ئۆی. وتی، تۆ پێش ڕۆیشتنت زۆر سەرقاڵ بوویت و لە بیرت چووە ناونیشانی بدەیتێ. هاوسەرەکەت زۆر بە پەرۆش بوو، دەیوت، "تەنیا دەمەوێ دڵنیابم وەزعی باشە، چونکو یەکەم جارییەتی دێتە نیویورك."' تەلەفونەکەم دانایەوە و بۆ خولەکێك وەستام تا هەناسەیەکی تەواو بدەم. نەمدەتوانی باوەڕ بکەم. چی بکەم باوەڕم هێنا، بەڵام ئەم جارەیان زۆر پێی لە بەڕەکەی ڕاکێشابوو. ئەو پیاوە هەژارەی ئاژانس جێگای سەرزەنشتکردن نەبوو، هیچ شتێکی لەو بارییەوە نەدەزانی، کە نیگل هاوسەری ڕاستەقینەی من نییە. وە چۆن دەتوانم بۆی ڕوونکەمەوە؟ *سەیرکە، ڕاستە ئێمە شوومان بە یەکتری کردووە، بەڵام من شووکردنەکەی من تەنیا بۆ پاسپۆرت بووە، چونکو بیانییەکی قاچاغ بووم، خەریك بوو دیپۆرت دەکرامەوە بۆ سۆماڵ، تێگەیشتی؟ ئینجا ئێستا با بچینە سەر کاتە دیاریکراوەکانی سبەینێ* -. ناخۆشترین شت ئەوە بوو، کە من لە ڕووی یاساییەوە شووم بەو کردبوو.

کە کارم تەواو بوو، ئەو ئێوارەیە گەڕامەوە شوقەکەم، بڕیاری خۆمم دابوو چی دەکەم. وەك ئاگادار کرابوومەوە، نیگل گەیشت و لە دەرگای دا. ڕێگام دا بێتە ژوورەوە و پێش ئەوەی چاکەتەکەی داکەنێت، بە ڕەقییەکەوە پێم وت، 'وەرە، با بڕۆین. بۆ نانی ئێوارە دەچینە دەرەوە.' هەرکە بە ئارامی لەناو خەڵکەکەدا دانیشتین، بێ پێچ و پەنا کەوتمە گفتوگۆ: 'سەیرکە نیگل، لە توانامدا نەماوە. *چاوم*

*توانای بینینی تۆی نییە*. تۆ لە پەلوپۆم دەخەیت! تا تۆ لەم ناوەدا بیت ناتوانم کار بکەم. ناتوانم بیربکەمەوە. بێ ورەم. بێزارم و تەنیا دەمەوێت چاوم بە چاوت نەکەوێت.' دەمزانی ئەوەی پێم دەوت، تۆقێنەر بوو، وە ئازار دانیشی، مایەی خۆشیم نەبوو. بەڵام چارم نەبوو. لەوانە بوو ئەگەر ئەوەندە دڵڕەق بم، بمتوانیایا لە کۆتاییدا تێم بگەیاندایە.

زۆر کەساس و غەمناك دەهاتە بەرچاو، هەستم بە تاوانباری دەکرد. 'باشە، تۆ قسەی خۆتت کرد. من نەدەبوو بهاتمایە. سبەینێ یەکەم فرۆکە دەگرم و دەگەڕێمەوە.'

'زۆر چاکە! بڕۆ! نامەوێت لەم شوقەیەدا بتبینمەوە، کاتێك کە لە ستۆدیۆ دەگەڕێمەوە ماڵەوە. من لێرە کار دەکەم - ئەمە کاتی پشووم نییە. کاتم نییە بۆ شێتوێتی تۆ.' بەڵام بۆ سبەینێ ئێوارە کە هاتمەوە نەڕۆیشتبوو. هەروا بە تاریکی دانیشتبوو لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد - بێزەوق، تەنیا، کەساس - بەڵام هەر وەك خۆی وابوو. کاتێك کەوتمە هەڵشاخاندن پیایدا، ڕازیبوو بۆ سبەینێ بڕوات. سبەینێیەکی تریش. لە کۆتاییدا ڕۆیشت و گەڕایەوە بۆ واڵس. لە دڵی خۆمدا وتم: *ئۆخەی دەروومان لێکرایەوە*. بەهۆی بوونی کاری زۆرەوە، مانەوەم لە نیویورك درێژەی کێشا. بەڵام نیگل ڕێگای نەدا زۆر بە ئارامی دانیشم. دیسانەوە زیاتر لە دوو جار گەڕایەوە بۆ نیویورك. بە هەمووی سێ جار هات بێئاگادارکردنەوە.

بێجگە لەو هەلومەرجە ناخۆشەی کە لەگەڵ نیگلدا ڕوویدا، ژیانم لە هەموو ڕوویەکەوە باش دەچووە پێشەوە. لە نیویورك، لەگەڵ ئەو خەڵکە کاتێکی خۆشم بردسەر و پیشەکەم لە بردودابوو. بۆ بێنێتۆن و لێڤیس کارم کرد و لە کۆمەڵێك ڕێکلامی بازرگانیدا بۆ خشڵ، پۆمێلاتۆ بە کراسی سپی ئەفریقییەوە بەشداریم کرد. هەروەها بەشداریم کرد لە ڕێکلامی ئارایشتی بۆ ڕێڤلۆن، پاشان بووم بە

دەموچاوێکی ناسراوی بۆنی تازەی ئاجای. کە ڕێکلامەکە بریتی بوو لەمە: 'لە دڵی ئەفریقاوە بۆنێکی خۆش دێت بۆ داگیرکردنی دڵی هەموو ژنێك.' ئەم کۆمپانیانە هەموو شتێکیان بەکاردەهێنا بۆ گۆڕانی شێوەی من - لە نیگایەکی ئەفریقییانەوە، هەر هەمان نیگا کە منی کێشکرد بۆ کاری مانیکان لە لەندەن. بۆ ئەکادیمی ئەوردس. ڕیڤلۆن فیلمێکی تایبەتی ڕێکلامی بازرگانی دروست کرد، کە من لەگەڵ سیندی کراوفۆرد، کلودیا شیفر و لاورنهوتۆن، دەورم تیادا دەبینی. لەو کلیپەدا هەر یەکەمان وەڵامی یەك پرسیار دەداتەوە، کە لێمان دەکرێت: 'چ شتێك ژن دەکات بە شۆڕشگێر؟' وەڵامەکەم کورتکراوەی ڕاستی ژیانی نائاسایی خۆم بوو: 'کۆچەرییەك لە سۆماڵەوە دەبێت بە مانیکانی ڕیڤلۆن.'

پاشان بووم بە یەکەم مانیکانی ڕەشی ڕیکلامی ئۆلی ئۆف ئلای. هەروەها کلیپێکی مۆسیقیم بۆ ڕۆبێرت پالمەر و میت لۆف دروستکرد. ئەم پرۆژانە برەوی دا بە پیشەکەم و پاشان وێنەی من کەوتە ناو گۆڤارە بەناوبانگەکانی مۆدێلەوە: ئیلێ، ئالورێ، گلامۆر، ڤۆگۆی ئیتالی، ڤۆگۆی فەرەنسی. بەردەوام کەوتمە کارکردن لەگەڵ وێنەگرە بەناوبانگەکان، کە یەکێك لەوانە ڕیچارد ئاڤدۆن بوو. بێجگە لەو ڕاستییەی کە ئەم زۆر بەناوبانگتر بوو لە وێنەگرانی مۆدێل، من ڕیچاردم خۆشدەویست، چونکو سوعبەتچی و زۆر پێی لە زەویدا بوو. سەرەڕای ئەوەی بۆ چەند دەیەیەك کاری کردبوو، بەردەوام بۆچوونی منی دەپرسی لەبارەی کارەکانییەوە: 'واریس، باری سەرنجت چییە لەبارەی ئەمەوە؟' لە ڕاستیدا ئەوەندە گرنگی پێدەدام پرسیارم لێبکات، کە بۆ من واتایەکی زۆری دەدا. ڕیچارد چووە ڕیزی یەکەم وێنەگری مەزنی وەك تێرانس دۆنۆڤان، کە وەك کەسێك زۆر ڕێزم لێدەگرت.

لە ماوەی چەند ساڵدا، کارم لەگەڵ کۆمەڵێك وێنەگری پەسەندکراودا کرد. وا دەردەکەوت، کارێکی ئاسان بێت هەموو ڕۆژێك وێنەت لێبگیرێت، بەلام پاش ئەوەی بووم بە خاوەنی ئەزمونێکی زیاتر، بینیم کە گۆڕانکارییەکی گەورە ڕوویداوە لە

چۆنیەتیدا، لایەنی کەم لە بۆچوونی منەوە، کە بووبوومە بابەتی ئەو وێنانە. وێنەگری مەزن ئەوەیە، کە بتوانێت تایبەتمەندییەکانی مانیکان پیشان بدات و بەهێزی بکات، لەجیاتی ئەوەی ئەندێشەیەکی پێش دیاریکراوی بەسەردا بسەپێنێت. بەشێك لە بەها دانی من لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆئەوەی کە بە تەمەنتر بووم، زیاتر ڕێزم لە خۆم دەگرت و لەو شتانەی، کە جیام دەکاتەوە لەو ژنانەی بەردەوام لە مەیدانی مۆدێلدا لەگەڵمدا کاریان دەکرد. ڕەش پێست بوون لە پیشەسازییەکی وەهادا ناوێزەیە، کاتێك کە هەر کەسێك باڵای شەش پێیە، قژێکی ئاوریشمی تا سەر ئەژنۆی هەیە و پێستێکی سپی پۆشلینی پێوەیە. من لەگەڵ وێنەگرانێکدا کارم دەکرد، کە کەڵکیان وەردەگرت لە ڕووناکی و ئارایشت و ڕازانەوەی قژ، بۆئەوەی لە شتێکی تر بچم نەك لە خۆم. بەڵام ئەمەم پێخۆش نەبوو، حەزم لە بەرهەمێکی وا نەدەکرد. ئەگەر تۆ سیندی کراوفۆدت دەوێت، بێگومان سیندی بەکار بهێنە، لەجیاتی ئەوەی ژنێکی ڕەش پێست بهێنیت و هۆقەیەك مکیاجی بکەیت بۆئەوەی شتێکی نامۆی وەك سیندی کراوفۆدی ڕەشی لێدەرچێت. ئەو وێنەگرانەی من پێم خۆشبوو کاریان لەگەڵدا بکەم، کەسانێك بوون کە جوانی سروشتی ژنانیان بۆ گرنگ بوو. هەوڵیان دەدا ئەم جوانییە پیشان بدەن. ئەوەندەی بە منەوە دەگەڕایەوە، بێگومان دەستیان زۆر ئاواڵە نەبوو. بەڵام ڕێزم لە کۆششەکەیان دەگرت.

کە ناوبانگم دەرکرد، پەیمانکاریم زۆر بۆ پەیدا بوو، بەرنامەی ڕۆژانەم پڕبوو لە نواندن و وێنەگرتن. چونکو پێم خۆش نەبوو کاتژمێر لە دەست بکەم، ڕاگرتنی کات و دانیشتنەکان زۆر سەخت بوو بۆم. بۆم دەرکەوت کە شێوازی کۆن بۆ دیاریکردنی کات، مایەی گرفتە، سەختە بزانی درێژی سێبەرکەت چەندە لە نێو تەلارە هەوربڕەکانی مانهاتاندا. گرفتی ئامادە نەبوون لە کاتی دیاری کراوی کۆبوونەوەکاندا دەستی پێکرد. کەم توانایی خوێندن و نوسینم، لە دۆزینەوەی ئەدرێس دا گرفتی بۆ دروست دەکردم. ئاژانسەکەم ئەدرێسی بۆ دەنوسیم، منیش هەردەم ژمارەکەم بە

پێچەوانەوە دەخوێندەوە. ئەدرێسی 725برۆدوەییان پێدەدام، من بە 527برۆدوەی تێدەکەیشتم و بۆم پرسیار بوو کە ئایا ئەمە لە هەموو کەس ڕوودەدات. ئەمەم لە لەندەنیش بەسەرهاتبوو، بەڵام چونکو لە نیویورك زۆرتر کارم دەکرد، بەردەوام ئەم گرفتەم بۆ دەهاتەپێشەوە.

کاتێك کە ئەزمون و باوەڕم بە پیشەکەم زیادی کرد، ڕێڕەوی نواندن، پەسەندترین بەشی کاری مۆدێل لەلام، دەستی پێکرد. ساڵی دوو جار نەخشەکەران نواندن دەگێڕن بۆ پیشاندانی جلوبەرگە تازەکانیان. ئەم نواندنانە لە میلانەوە دەستپێدەکات و دوو هەفتە دەخایەنێت. پاشان دەچێت بۆ پاریس، ئینجا لەندەن، دوایی لە نیویورك. ڕۆژانی کۆچەریم، ئامادەییەکی باشی تیادا دروست کردبووم بۆ ئەم جۆرە ژیانە: سوکوسۆڵ سەفەرکردن، جوڵاندن بۆ ئەو شوێنەی کاری لێیە، قایل بوون بەوەی کە ژیان بەخشیوەتی و کارکردن لەگەڵی بە باشترین شێوە.

کە وەرزی نواندن لە میلان دەستپێدەکات، ژنان و کچانی مەیدانی مۆدێل هەموو ڕوو لەوێ دەکەن، لەگەڵ هەموو ئەو ژنان و کچانەی کە خەو بەوەوە دەبینن، ببن بە مانیکان. لەپڕ شار پڕدەبێت لە ژنانی زۆر باڵا بەرز، وەك مێرووولە بە هەموو لایەکدا لە جوڵەدان. لە سوچی هەموو جادەیەکدا، لە ئیستگای پاسدا، لە هەموو قاوەخانەکاندا مانیکان دەبینی. *ئەوی، سەیرکە، ئەوە یەکێکە. ئەوە یەکێکی تر. یەکێکی تریش.* هیچ نیگایەکی گومانلێکراوانە لە ئارادا نییە، دۆستانەیە. 'سڵاو!' هەندێك سەیری قەد و باڵای ئەوی تر دەکات. هەندێك بۆ یەکتری ئاشنان. هەندێك تەواو ناناشنان، بۆ یەکەم جارە هاتوونەتە ئێرە، تەنیان و زمنەقیان چووە. هەندێك کاتێکی خۆش دەبەنەسەر. هەندێکی تر نا. لە هەموو شێوە و جۆرێکی تیادایە. وە ئەگەر یەکێك بڵێت چاوپیاهەڵهانین نییە، با بۆ خۆی بڵێت، قسەی قوڕ دەکات. لەم شتانەت زۆر بە تووشەوە دەبێت.

ئـاژانس کاتـەکان دەگرێـت، پاشـان مانیکانـەکان بـە نـاو میلانـدا دەگـەڕێن بـۆ چاوپێکەوتن، هەوڵدەدەن جێگایـەك بـۆ خۆیـان لـە نـاو نواندنەکانـدا بکەنـەوە. ئـیتر لەمـەدا بـۆت دەردەکـەوێت، کـاری مۆدێـل هـەمووی هـەر خۆشـی نییـە. بـە دەگمـەن. لەوانەیە لە تەنیا ڕۆژێکدا حەوت، دە، پانزە کاتت بۆ گیرابێـت. ئەمـەش کـارێکی زۆر زۆر سەختە، چونکو تەواوی ڕۆژەکە هەر ڕاکەڕاکەتە، کاتی نانخواردنت نییە، بەهۆی ئەوەی خەریکی چاوپێکەوتنێکی کە بۆت دانراوە و دوو دانەی تـریش بـە ڕێگاوەیـە. کاتێك دەچی بـۆ چـاوپێکەوتنێك، سـی کـچ لەپێـشتەوە ڕاوەسـتاون و چاوەڕوانن. وە ئەوە ڕۆشنە کە هـەر یـەکێکیان دەبێـت لـەپێش تـۆوە بـچێتە ژوورەوە. کاتێـك نۆبـە دەگاتە سەر تۆ، ئەلبومەکەی خۆتیانی پیشان دەدەیت  کە وێنەکانتی تیادایە. ئەگەر کڕیار تۆی پـێ بـاش بـوو، ئـەوا داوات لێـدەکات بـە بەردەمیـدا هاتووچـۆ بکـەیت. وە ئەگەر بەدڵی بیت، ئەوا داوات لێدەکات هەندێك جلوبەرگ تاقیبکەیتەوە. ئـیتر ئـەوە هەموویەتی: "زۆر سوپاس. یەکێکی تر!"

لێت ڕۆشن نییـە وەردەگیرێیـت یـان نـا، بـەڵام کـاتی ئـەوەت نییـە نیگـەرانی بیـت، چونکو بە ڕێوەی بۆ یـەکێکی تـر. ئەگـەر تۆیـان پـێ بـاش بێـت، ئـەوا پەیوەنـدی بـە ئاژانسەکەتەوە دەگرن و کاتەکەت بۆ دیاری دەکەن. هاوکات زوو فێری ئـەوە دەبیـت، کە کار بـە سـەختی نـەگریت، یـان تـوڕە نـەبیت بـەهۆی لـە دەسـتدانی کارێکـەوە کـە داواتکــردووە یــان هەســتت بریــندار نــەبێت بــەهۆی ڕەتکردنــەوەت لەلایــەن نەخشەکێشەرانی بەناوبانگەوە. کاتێك دەستدەکەیت بە بیرکردنەوە، *ئۆی، بۆ وەریان نـەگرتم؟ ئایـا وەرم دەگـرن؟ بۆچـی وەرم نـاگرن؟* گومـانی تیـادا نییـە خـۆت شـێت دەکەیت. بەتایبەتی کاتێك داوای کارێکت کردووە و وەرت ناگرن. ئەگەر ڕێگا بدەیت، ئەمە ئازارت بدات، وردە وردە خۆت لەناودەبەیت. لە کۆتاییدا تێدەگەیت، کە هەموو پرۆسـەی چـاوپێکەوتن زیـاتر دەردیـسەرییە. لەسـەرەتاوە ئاسـایی نیگـەران دەبـووم، *باشە. بۆچی ئەوەم بەرنەکـەوت؟ خـانم، بەڕاسـتی دەمویـست ئـەو کـارە بکـەم!* بـەڵام

لەدواییدا فێربووم بـە دروشمـی خۆمـەوە بـچمە نـاو ئـەم پـیشەیەوە: سیت لا ڤـای[1].
بەداخەوە، *ئەم جارە نەبوو!* ساف و سادە منیان بەدڵ نەبوو. هەڵەی منـیش نـەبوو.
ئەگەر ئەوان بە دوای کەسێکەوە بن بـە بـاڵای دوو مـەتر، بـە قـژێکی درێـژی زەرد و
کێشی چل کیلۆوە، بێگومان واریسیان بەدڵ نابێت. کچێ، بەردەوام بە برۆ.

ئەگـەر کرپـار ناونووسـت بکـات، ئـەوا دەگەڕێیتـەوە و پـەراوەی ئـەو جلوبەرگـە دەکـەیت کـە بـۆ نواندنەکـە لەبـەری دەکـەیت. هـەموو ئـەم هەڵـسوڕانانە بـەردەوام دەبێـت، کەچـی هێـشتا نوانـدن دەسـتی پێنـەکردووە. بێتاقـەت دەبیت، لـە پـەلوپۆ دەکەویت، بە تەواوی نەنووستوویت و کاتی ئەوەت نەبووە تەواو نان بخۆیت. ڕیوەڵە و هیلاك دیاری. زیاتر لاواز و لاوازتـر دەبیـت، لـە کاتێکدا لـە هـەوڵی ئـەوەدای هـەر ڕۆژە جوانتر بنوێنیت، چونکو پیشەکەت بەوە دەڕوات. پاشـان بـۆت دەبێتـە پرسـیار، ئەرێ من ئەمە بۆچی دەکەم؟ بۆچی لێرەم؟

کـە نوانـدنی مۆدێـل دەسـتپێدەکات، تـۆ هێـشتا خـەریکی چاوپێکەوتنی، چـونکو تەواوی پرۆسەکە تەنیا دوو هەفتە دەخایـەنێت. لـە ڕۆژی نواندنـدا دەبێـت نزیکـەی پێـنج کـاژێر زووتـر لـەوێ بیـت. هـەموو کـچەکان تێکدەترنجێنـە ئـەوێوە، ئارایـشت دەکرێت، پاشـان دادەنیـشیت و چاوەڕوان دەکـەیت، ئینجا قـژت چاکدەکرێت، پاشـان دادەنیـشیت و چاوەڕوان دەکـەیت تـا نوانـدن دەسـتپێدەکات. دوایـی یەکـەم دەسـتەی جلوبـەرگ لەبەردەکـەیت، ئینجـا ڕادەوەسـتی و چاوەڕوان دەکـەیت، نابێـت دانیـشیت بۆئـەوەی جلوبەرگەکـە چـرچ نـەبێت! هەرکـە نوانـدن دەکەوێتـە ڕێ، شـڵەژاندن دەستپێدەکات - تەواو شێتێتییە. 'هۆ! لـە کوێیـت؟ ئـەوە چـی دەکـەیت؟ واریـس لـە کوێیە؟ نۆمی لە کوێیە؟ وەرە ئێرە. وەرە پێشەوە - خێراکە. تـۆ ژمـارە نـۆی. تـۆ لـە پاش ئـەویت.' بـە جلوبەرگەکـەوە، بـە بەرچاوی ئـەو هـەموو خەڵکـە نامۆیـەوە کـە نایان ناسیت، خۆت دەنوێنیـت. 'ئـا، ئـا، وا هـاتم، ئـا - چاوەڕوانم.' هـەر هـەموو پـاڵ بەیەکترییەوە دەنێن. 'ئەوە تۆ خەریکی چیت؟ لەسەر ڕێگام لاچۆ - من دەچم!'

ئینجا پاش ئەو هەموو زەحمەتە، تۆزێك دەروت لێدەكرێتەوە: سەرەی تۆیە. نۆبەی تۆیە، لەپشت شانۆكەوە ڕاوەستە. ئینجا *دەبێ!* دەكەویتە ڕۆشتن بەسەر ڕێڕەوەكەدا، بەناو ڕووناكی زۆر بەهێز و مۆسیقای گوێچكە كونكەردا، هەموو چاوت تێدەبڕن، تۆیش بەو پەڕی نازكردنەوە، بە هێواشی دێیت و دەچیت و خۆت بادەدەیت و بیردەكەیتەوە، ***ئەوە منم. هەر هەمووتان - تەماشای من بكەن!*** ئارایشت و قژت لەلایەن كارامەترین كەسی ئەو مەیدانەوە كراوە و جلوبەرگێكت لەبەركردووە، كە ئەوەندە گرانە هەرگیز خەوی پێوە نابینیت بیكڕیت. بەڵام بۆ چەند ساتێك تۆ بووی بە خاوەنی، وە بۆ خۆت دەزانیت، پێوەی چەند بە شكۆیت. كۆمەڵێك وێنەت لێدەگیرێت و پاشان كە ڕێڕەوەكەت جێهێشت، ناتوانی چاوەڕوانی خۆگۆڕین بیت و دووبارە بگەڕێیتەوە. پاش ئەو هەموو ئامادەكارییە، هەموو نواندنەكە تەنیا بیست یان سی خولەك دەخایەنێت، بەڵام لەوانەیە لەو ڕۆژەدا سێ چوار پێنج نواندنت هەبێت، لەبەر ئەوە هەركە تەواو بوویت، دەبێت یەكسەر دەرچی و بچیت بۆ ئەوی تر.

كاتێك ئەم دوو هەفتە شێتانەیە تەواو دەبێت لە میلان، كۆمەڵی نەخشەكێشان، ئارایشتكەران و قژچاكەران لەگەڵ هەموو مانیكانەكاندا، وەك خێڵی كۆچەری، دەچن بۆ پاریس. پاشان هەمان پرۆسەكە خۆی دووبارە دەكاتەوە، پێش ئەوەی بچن بۆ لەندەن و نیویورك. لە كۆتایی ئەم ڕاكەڕاكەیەدا، بە ئاستەم هێزت تیادا دەمێنێت و كاتێك لە نیویورك تەواو دەبیت، باشترە تۆزێك پشوو بدەیت. وە ئامادەبیت بچیت بۆ پشوودان بۆ دوورگەیەكی بچوك، لەهەر شوێنێكی بێ تەلەفون. ئەگەر وا نەكەیت، ئەگەر هەر لە هەوڵی كاردكردندا بیت، بێگومان لەبەر زۆری كار تێكدەچیت.

هەرچەند مانیكانی كارێكی خۆشە - و دانی پیادا دەنێم كە حەزم لە قەشەنگی، دردوشانەوە وجوانییەكەیەتی - بەڵام لایەنی دژواریشی هەیە، كە لەوانەیە بە زەرەری ژن تەواو بێت، بەتایبەتی بۆ یەكێكی گەنج، كە لەخۆی دڵنیا نەبێت. كارم

کـردووە و توشـم بـووە بـە تووشـی شـێوازکارێکەوە یـان وێنەگرێکـەوە کـە هـاواری لێهەڵساوە: 'ئەی هاوار! ئەوە قاچەکانت چییەتی! ئەو پەڵە ڕەشـە ناشـیرینانە چییە بەسەریەوە؟' دەتـوانم وەڵامـی چـیی پێبدەمـەوە؟ ئەوانـە نیـشانەی برینـدار بـوونی پێنانە بەسەر سەدان دڕك و بەردە لە بیابـانی سـۆماڵدا، وەبیرهێنـەرەوەی منداڵیمـە، کە بۆ ماوەی چواردە ساڵ بێ پێڵاو بووم. چۆن دەتـوانم ئەمـە بـۆ نەخشەکێـشان لـە پاریس ڕوونکەمەوە؟

کاتێـك لـە چـاوپێکەوتنێکدا بـۆ وەرگـرتنی کـار، داوایـان لێکـردم کراسـێکی کـورت لەبەربکەم، یەکسەر غـەم دایگـرتم. دەڕۆیـشتم و لەسـەر یـەك پـێ ڕادەوەسـتام، خـۆم بادەدا بـەو هیوایـەی کەمکوڕییـەکانم نـەبینن. مـن لاقـم گێـڕە میراتییەکە، کە لـە گەورەبوونمـدا لـەناو خێزانێکـی کۆچـەری کـەم خۆراکـەوە سەرچـاوەی گرتـووە. وە بـەهۆی ئـەم لاقگێڕیـەوە بـوو، لـە کـار دەرکـرام، نەخۆشـییەکی جەسـتەیی کـە هـیچ کونتڕۆڵێکم بەسەریدا نەبوو.

جاران زۆر شەرمم لە لاقی خۆم دەکرد و ئـازارم پێـوە دەچێـشت. هـەتا جارێکیـان چووم بۆ لای پزیشك بۆ دۆزینەوەی چارەسـەرێك. 'لاقـم بـشکێنە،' بـە پزیـشکەکەم وت، 'نامـەوێ ئـیتر لـەوە زیـاتر هەسـت بـە کـەموکوڕی بکـەم.' بـەڵام بـاش بـوو، پزیشکەکە پێی وتم، زۆر بە تەمەنم، ئێسکەکانم دەقیان گرتووە و کارێکیـان لەگەڵدا ناکرێت. کە زیاتر چوومە تەمەنەوە، لەدڵی خۆمدا وتم، ***چاکە، ئەمانـە لاقـی منـە و سـەرئەنجامی ئەوەیـە، مـن کـێم و لـە کوێـوە هـاتووم.*** هـەر ئەوەنـدەی لەشـی خـۆمم ناسی، لاقەکانمم لا خۆشەویست بوون. ئەگـەر پزیـشکیش شتێکی لێبکردایـە، ئەوسـا دەمتوانی چەند نواندن بـۆ مـاوەی پێـنج خولـەکێك ئـەنجام بـدەم، وە لـە ئیمڕۆشـدا دەبووە مایەی تووڕە بـوونێکی زۆر لـە خـۆم. بـە چ هۆیـەك گۆڕانکـاری بەسـەر لەشـی خۆمدا بهێنـم - بۆئـەوەی جلوبەرگـەکانیان جوان بنـوێنن؟ ئێـستا ئـیتر شـانازی بـەو لاقانەمەوە دەکەم، چونکو مێژوویەکیان هەیە، بەشێکن لە مێژووی ژیـانی مـن. هـەر

ئەو لاقە گێڕانەم هەزاران میل منیان هەڵگرتووە بەناو بیابانی ئەفریقادا و ڕۆشتنە هێواش و لەرزۆکەکەم، ڕۆشتنی ژنێکی ئەفریقاییە، لەبارەی ڕابووردوی منەوە دەدوێت.

گرفتێکی تری پیشەی مانیکان، وەك هەر پیشەیەکی تر، ئەوەیە کە لە کەسانی ناپەسەند بێبەش نییە. لەوانەیە لەبەرئەوە بێت، کەسانێکی زۆر لەسەر ئەو بڕیارانەی کە داویانە، بە موو لێی لانادەن، وە لەم پەیوەندەدا خۆیان تووشی ناهەموارییەکی زۆر دەکەن. جارێکیان لەگەڵ یەکێك لە بەڕێوەبەرانی هونەری تایبەت بۆ یەکێك لە گۆڤارەکانی مۆدێل، کارم دەکرد، کە - بۆ من نمونەی ڕەقی و هەڵسوکەوتی درەندانە بوو، کە وێنەگرتنەکەی لێکردین بە دۆزەخ. لە دورگەیەکی بچوکی جوانی کاریبیاندا بووین و وێنەمان لێدەگیرا. ئەم جێگایە وەك بەهەشت وایە و هەمووومان کاتێکی خۆشمان دەبردەسەر، چونکو پارەمان پێدەدرا لەوێ کار بکەین. لەکاتێکدا زۆربەی خەڵك بەو پەڕی خۆشییەوە پارەی دەدا بۆئەوەی پشووەکەی لەوێ بەرێتەسەر. بەڵام ئەم ژنە نا. هەر لەو ساتەی گەیشتینە ئەوێ، بە دوای کلکی منەوە بوو. "واریس، بەڕاستی دەبێت بکەویتە خۆت. پێویستە هەستیت و خێرا بکەیت - تۆ تەنها دانیشتویت. من ناتوانم لەگەڵ کەسانێکی وەك تۆدا کار بکەم." بۆ ئاژانس لە نیویورك تەلەفونی کردبوو، گلەیی کردبوو، کە من گەلحۆیەکم و ئامادە نییم هیچ کارێك بکەم. ئاژانس تەواو سەرسام بووبوون، بەڵام ئەوانیش وەك من هیچیان نەوتبوو.

ئەم بەڕێوەبەرە هونەرییە ژنێکی دڵشکاوی غەمناك بوو. دیاربوو بێهیوا بوو، نە هاوسەری هەبوو نە هاوڕێ، هیچ کەسێکی نەبوو خۆشیبوێت. هەموو لەزەتی ژیانی و خۆشەویستییەکەی هاتبووە سەر کارەکەی، چونکو هیچ شتێکی تری نەبوو پێوەی سەرگەرم بێت. لەبەرئەوە هەموو داخەکەی خۆیی بە من دەڕشت و لەو باوەڕەشدا بووم، یەکەم کەس نەبووبم - یان دوا کەس. پاش چەند ڕۆژ لەم بەزمە، هیچ

سۆزێکم بۆی نەما. تەماشام دەکرد و بیرم دەکردەوە، *دوو شت هەیە دەتوانم لەگەڵ ئەم ژنەدا بیکەم: دەتوانم یەك زللەی لێبدەم یان تەنیا سەیری بکەم و زەردەخەی بۆ بکەم و هیچ نەڵێم.* وە بەو باوەڕە گەیشتم: *باشترین شت ئەوەیە هیچ نەڵێم.*

ناخۆشترین شت ئەوەیە، کچێکی گەنج، کە تازە دەستی کردبێت بەم کارە و توشی بێت بە توشی ژنێکی وەك ئەم بەڕێوەبەری هونەرییەوە. هەندێك لەم کچانە، هێشتا بۆنی شیری خاو لە دەمیان دێت، کە بەتەنیا فڕۆکە دەگرن و ئۆکلەهاما یان جۆرجیا یان باکووری داکوتا جێدەهێڵن و دەچن بو نیویورك یان فەرەنسا یان ئیتالیا بۆئەوەی کارێك بکەن. زۆرجار نائاشنان بەو وڵاتە یان بەو زمانە. کەسانێکی ساکارن و کاریان لێدەکێشنەوە. لە توانایاندا نییە بەرەوڕووی ڕەتکردنەوە و بەتاککەوتنەوە بن. ئەزمون یان ژیری یان ئەو باوەڕ بەخۆ بوونەیان نییە، کە بزانن گرفتەکە لە خۆیاندا نییە. گەلێك غەمناك و دڵشکاو، بەگریان دەگەڕێنەوە بۆماڵەوە.

ساختەچی و قۆڵبڕ لەم پیشەیەشدا هەیە. گەلێك کچی گەنج سەرچڵانە دەیانەوێت ببن بە مانیکان و دەکەونە داوی ئەوەی پێی دەڵێن ئاژانس، کە پارەیەکی زۆریان لێدەکێشنەوە بۆ دانانی ئەلبومێکی مۆدێل. خۆشم قوربانی ئەم جۆرە پارە کێشانەوەیە بووم، کاتێك چووم بۆ لای هارۆلد ویلەر، ئەمە زۆر تووڕەی کردم. مۆدێل بەدوای پارەوەیە، نەك پارە دەدات. ئەگەر کەسێك بییەوێت ببێت بە مانیکان، تەنیا پارەیەك کە دەیەوێت، پارەی بلیتی پاسە تا دەگاتە ئاژانسکە. دەتوانێت لە کەتەلۆکی تەلەفوندا ژمارەکەی بدۆزێتەوە و تەلەفونیان بۆ بکات و کاتێك بگرێت بۆ سەردانیان. ئەگەر ئاژانسکە کەوتە باسی ئەوەی چەندی تێدەچێت - ئەوا یەکسەر دوورکەوێتەوە! ئەگەر ئاژانسێکی باش لەو باوەڕەدا بوو، کەسێك بەژن و باڵای لەبارە، بە دەردی ئێمڕۆ دەخوات، ئەوا یارمەتی دەدات پێکەوە ئەلبومێکی بۆ دادەنێت. پاشان کاتێکی بۆ دادەنێت و تاقی دەکاتەوە و کاری پێدەدات.

ئەگەر هەنـدێك خـەڵك لـە نـاو مۆدێلدا ناپەسـەندن، ئـەوا هەنـدێك هەلومـەرجی کاریش هەیە کە هەردەم گونجاو نییە. جارێکیان کارێکم قبوولکرد، دەمزانی گایـەکی تیادایە، بەڵام بە تەواوەتی بۆم ڕۆشن نەبوو، تا لە نیویورکەوە سواری فڕۆکـە بـووم بۆ لۆسئەنجلس و پاشان بە هەلیکۆپتەر بۆ بیابان.

من و گروپێکی وێنەگرتن لەگەڵ گایەکی ڕەشی گەورەی شاخ تیژ بووین، تەواو لـە جیهان دابڕاو لە بیابانی کالیفۆرنیا. لەناو گالیسکەیەکی پێچکەداردا مکیـاج و قژیان بۆ چاککردم. کە تـەواو بـووم وێنەگرکـە مـنی بـردە دەرەوە بـۆ لای گاکـە. `سڵاو لـە سێیتەن[2] بکە،` وێنەگرکە پێی وتم.

`ئۆی، سێیتەن چۆنی.` لام خۆشەویست بوو. `جوانە. ئەفساناوییە. بەڵام، جێگای متمانەیە؟`

` ئائا، بێگومان. ئەوە خاوەنەکەیەتی.` وێنەگرەکە دەستی بـۆ پیاوێـك ڕاکێـشا کـە لغـاوی سـێیتەنی بـە دەسـتەوە بـوو. `ئـەو خـۆی دەزانێـت چـی بکـات.` وێنەگرەکـە کارەکەی بۆ باسکردم. وێنەکـە دەبێـت بـە وێنـەی سـەر بتڵـی کحـول. مـن بـە ڕووتـی لەسـەر گاکـە دادەنیـشم. لەڕاسـتیدا ئـەم هەواڵـە شـۆکێك بـوو، چـونکو هـیچ شـتێکم لەبارەی ئەمەوە نەدەزانی تا گەیـشتمە شوێنەکە. بـەڵام نەمویـست لەبـەردەمی ئـەو هەموو خەڵکەدا بیکەم بە هەڵا، لەبەرئەوە هەوڵمدا چۆن هاتووە، هەروا بڕوات.

بـەزەییم بـە گاکـەدا دەهاتـەوە، چـونکو هـەوا زۆر گـەرم بـوو، هـەروەها ئـاو بـە لووتیـەوە ڕانەدەوەسـتا. قـاچ و دەسـتی گاکـەیان بـە جۆرێـك دانـابوو کـە نـەتوانێت بجوڵێت، ئەم ئاژەڵە دامـاوەش ملکـەچ لـە شـوێنی خۆیـدا ڕەق وەسـتابوو. وێنەگرەکـە دەستی گرتـەوە بۆنـەوەی بەسـەریدا سـەرکەوم بۆسـەر پـشتی گاکـە. `پاڵکـەوە،` بـە دەست هێمای بۆ کردم. `خۆت درێژکەرەوە بەسەر پشتی گاکەدا - سکت توند بکە لـە گاکە و لاقەکانت درێژ و بڵاوکەرەوە. تەواوی وەخت هەوڵمدا جوان، ئـارام و سێکسی بنوێنم. بـیرم دەکـردەووە: *ئەگـەر ئەمـە هەڵمداتـە خـوارەوە دەمـرم.* لـەپڕ بـە سـکی

ڕووتمدا هەستم بە جوڵەی ماسولکەکانی پشتی گاکە کرد و کاتێکم زانی بە ئاسمانی مۆجاڤاوەم و هەوڵمدا خۆم بگرمەوە، بەڵام بە فنگدا کەوتمە سەر زەوییە وشکە ڕەقەکە.

'سەلامەتی؟'

'نا، نا.' خۆم قایم ڕاگرت، هەوڵم دا خۆم وا پیشان بدەم کە نەترساوم. نەمویست هیچ کەسێك وەك واریس دریییەی ترسنۆك ناوم بەرێت - لە گایەکی پیر ترساوە. 'چاکە، با تەواوی کەین. پارمەتیم بدە، با سەرکەومەوە.' لەڕاستیدا گاکە ئەو گەرمایەی پێخۆش نەبوو، لەبەرئەوە دوو جاری تر هەڵیدامە خوارەوە. لە سێهەم کەوتنەخوارەوەمدا قولەپێم ئازاری پێگەیشت و یەکسەر ئاوسا. 'چاکە، ئێوە وێنەی خۆتان گرت؟' لە سەر زەوییەکەوە پرسیارم کرد.

'ئۆ، جوانتر دەبوو ئەگەر کۆمەڵێك وێنەی تریشمان بگرتایە...'

خۆشبەختانە، وێنەی ئەم گایە هەرگیز بڵاونەکرایەوە. لەبەر چەند هۆیەك بەکاریان نەهێنا، منیش خۆشحاڵ بووم. خەیاڵی ئەوەی، کە کۆمەڵێك پیاوی پیر بە دەوری بتڵێك مەشروبدا دانیشن و هاوکات تەماشای سمتی ڕووتی من بکەن، جێگای داخ بوو. پاش ئەو کارە بڕیارم دا، ئیتر خۆم بە ڕووتی پیشان نەدەم، چونکو بەڕاستی پێم ناخۆش بوو. پارە ئەوە ناهێنێت هەستی خۆتی بۆ بریندار بکەیت، بە وەستان لەبەردەم خەڵکدا، بە شەرم و داماویەوە چاوەڕوانی وچانێك بیت و ڕاکەیت هانا بەریتە بەر خاولییەکە.

لەگەڵ ئەوەی کاری گاکە لەوانەیە خراپترین ئیشم بووبێت، بەڵام زۆربەی کات کاری مۆدێلم پێخۆش بووە، خۆشترین پیشەیە کە لەوانەیە هەموو کەس داوای بکات. لەو کاتەدا کە تێرێنس دۆنۆڤان منی برد و لەبەردەمی کامێرەدا دانام، هەرگیز ئەوە نەدەچوو بە مێشکمدا، کە کەسێك لەسەرئەوەی من چۆن دەنوێنم

یارەم پێبدات. لە ڕاستیدا هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم، بتوانم لە ڕێگایەکەوە خۆم بەخێو بکەم، کە وەك دەردەکەوت زەحمەتی کەمی بوێت. لەبەرامبەردا هەموو کارەکە لەلای من وەك یارییەکی کەرانە وابوو. بەڵام خۆشحاڵم لەوەی کە توانیم تا سەر بیکەم. هەرددم مەمنونم، کە هەلێکم بۆ هاتەپێشەوە لە ئیشەکەدا سەرکەوتووبوم، چونکو ئەمە لە توانای هەموو کچێکدا نییە. بەداخەوە کچانێکی گەنجی زۆر، هەوڵی زۆر دەدەن و زۆر جار بە سەرئەنجام ناگەن.

بیرمە کاتێك گەنج بووم، کە وەك کاردکەری خاڵە محەمەد ئیشم دەکرد، خەوم بەوەوە دەبینی کە ببم بە مانیکان. وە لەکۆتاییدا شەوێك هێزم دایە خۆم و لە ئیمانم پرسی چۆن دەستی بدەمێ. دە ساڵ دوای ئەوە، کارم بۆ وێنەکانی ڕێفلۆن دەکرد لە ستۆدیۆی نیویورك، کە ئارایشتکەرەکە هات و پێی وتم، ئیمان لە ژوورەکەی بەرامبەرە و خەریکی وێنەگرتنی کۆمەڵێکی تازەی کەرەستەی ئارایشتییە. دەرپەڕیمە دەرەوە و چووم بۆ بینینی. "ئۆ، دەبینم خەریکی کاری لەسەر بەرهەمەکانی خۆت. بۆچی کەڵك لە من وەرناگریت، وەك ژنێکی سۆماڵی، بۆ ڕێکلامی کەرەستە ئاریشتەکانت؟" پرسیارم لێکرد.

لێم وردبۆوە و کەوتە منگەمنگ کردن، "باشە، بەڵام من توانای تۆم نییە."

بە سۆماڵی پێم وت، "*ئەی من هەر بەخۆڕایی کار بۆ تو ناکەم.*" سەیر بوو، هەرگیز لەوە نەگەیشت، کە من هەر هەمان کچە بچکۆلە کارەکەرەکەی جارانم، کە سینییە چام بۆ دەبرد.

ئەوە ڕاستییەکی نائاساییە، کەمن هەرگیز بە دوای کاری مۆدێلەوە نەبووم، بەڵکو ئەو هات بۆ لام. لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت، کە من هەرگیز زۆر بە هەند نەمگرت. حەزی ئەوەم نەبووە ببم بە "سوپر مانیکان" یان "ئەستێرە،" چونکو هێشتا لەوە نەگەیشتووم، کە بۆچی مانیکانەکان بەناوبانگ بوون. هەموو ڕۆژێك دەبینم چۆن

مەیدانی مۆدێل زیاتر و زیاتر گەرمتر دەبێت بە گۆڤار و تەلەفیزیۆنەکان سەبارەت بە سوپر مانیکانەکان و بۆم دەبێتە جێگای پرسیار: *ئەم هەمووە سەبارەت بە چی؟*

ئاسایی چونکو ئێمەی مانیکان هەندێك خەڵك وەك خوا هەڵسوکەوتمان لەگەڵدا دەکات و هەندێکی تر وەك کەسانێکی گەمژە. زۆربەی کات هاوبۆچوونی خەڵکانی دووەم بووم. چونکو دەبێت گەمژە بم، نانی دەموچاوی خۆم بخۆم. بە نیگایەکی باوەڕ بەخۆبوونەوە خەڵك دەڵێت، 'تۆ مانیکانی؟ ئۆی، زۆر خراپە - مێشکت کای تیادایە. هەموو ئەوەی دەبێت بیکەیت، تەنیا لەوێدا ڕاوەستی و لەبەردەمی کامێرەدا خۆت جوان پیشان بدەیت.'

بەهەر ڕێگەیەك بووبێت، مانیکانی جۆراوجۆرم بینیوە و بەڵێ هەندێکیشیان زۆر زیرەك نەبوون. بەڵام زۆربەی زۆریان کەسانی ڕۆشنبیر، کارامە، جیهانگەڕ و شارەزا بوون لە زۆربەی زۆری بابەتەکاندا، وەك هەر ئینسانێکی تری سەر ڕووی زەمین. دەتوانن لەسەر پێی خۆیان ڕاوەستن و کاروباری خۆیان بکەن و کارامانە بێنەدەست. بۆ خەڵکانێکی وەك بەڕیوەبەری بێباوەڕی تورەهاتی هونەری، سەختە بەرەو ڕووببنەوە لەگەڵ ئەو ڕاستییەی کە هەندێك لە ژنان دەتوانن هەم جوان بن و هەم زیرەك. لەبەرئەوە پێویستیان بەوەیە ئێمە بخەنە جێگایەکەوە، لووتبەرزانە قسەمان لەگەڵدا بکەن، وەك ئەوەی ئێمە گەلە نەفامێکی دەم بە پێکەنین بین.

لەو باوەڕەدام گرفتی ڕەوشتی سەبارەت بە مۆدێل و ڕیکلام، بە شێوەیەکی باوەڕپێنەکراو ئاڵۆزە. بۆ من سروشت، بەرزی ئینسان، خێزان و هاوڕێیەتی لە سەروو هەموو شتێکەوەیە. لەگەڵ ئەوەشدا وا ژیان دەکەم بەوەدی بڵێم، 'ئەوە بکڕە چونکە لە شتێکی جوان دەچێت.' بە زەردەخەنەیەکی گەورە کاڵا دەفرۆشم. قۆشمەچی دەردەچم ئەگەر بڵێم، 'بۆچی ئەمە دەکەم؟ من یارمەتی ڕووخانی جیهان دەدەم.' بەڵام لەو باوەڕەدام هەر کەسێك هەر کارێکی هەبێت، دەتوانێت هەندێك جار هەمان شت بڵێت. ئەو شتە باشانەی کە لە کارەکەمەوە بۆم ماوەتەوە،

دیداری خەڵکانێکی چاك و بینینی شوێنی جوان و ئەزمونی تازە لەگەڵ کەلتووری جیاجیادا، کە وای لێکردم حەزم بە کردنی کارێك بێت کە یارمەتیدەری جیهان بێت، لەجیاتی ئەوەی ڕووخێنەری بێت. وە لەجیاتی ئەوەی ژنێکی تری هەژاری سۆماڵی بم، هەلومەرجێکی وام هەیە کە شتم لەدەست بێت. من کە پیشەی مانیکانم پێخۆش بووە، زیاتر چونکو هەستم کردووە، هاووڵاتییەکی جیهانیم و دەتوانم بۆ هەر شوێنێکی بێهاوتا لەسەر ئەم زەمینە سەفەر بکەم، نەك لەبەرئەوەی لە هەوڵی بوون بە ئەستێرە و ناوبانگدا بووبم. زۆر جار کە لە پەیوەند بە کاردا بۆ دوورگەیەکی جوان سەفەرم کردبێت، هەر هەلێکم بۆ هاتبێتە پێشەوە، خۆم دەرباز کردووە بۆ کەنار دەریا و کەوتومەتە ڕاکردن. زۆر هەستم بە خۆشی کردووە، ئازاد بم لە سروشتدا و بگەڕێمەوە باوەشی هەتاو. خۆم دزیوەتەوە بۆناو دارستان و بێدەنگ دانیشتوم و گوێم بۆ ئاوازی باڵندە گرتووە. ئای. چاو دادەخەم، بۆنی گوڵی بۆندار دەکەم، لەسەر ڕووم هەست بە هەتاو دەکەم، گوێ لە دەنگی پەلەوەر دەگرم و بە خەیاڵ دەگەڕێمەوە ئەفریقا. هەوڵدەدەم ئەو هەست بە ئارام و خۆشییەی کە لە سۆماڵدا بوومە، بیهێنمەوە بەرچاوی خۆم و هەست بکەم دووبارە لە ماڵەوەم.

---

1.C`est La vie وشەیەکی فەرەنسییە، بە واتای 'دیاری ژیان' دێت

2.سێیتەن بە واتای شەیتان دێت، Satan

## بەشی پانزەیەم
## گەڕانەوە بۆ سۆماڵ

لەساڵی 1995دا، پاش ماوەیەکی زۆر لە وێنەگرتن و نمایشی مۆدێل، بۆ وچاندان هەڵهاتم بۆ ترینیداد. کاتی کارنەڤاڵ بوو، هەموو جلی ئاهەنگیان لەبەردابوو، هەرچی لەو ناوەدا بوو سەمای دەکرد و بەشداری خۆشی دەکرد. لە ماڵی خێزانێکی ئاسیاودا مابوومەوە، دوو ڕۆژ بوو لەوێ بووم، کە پیاوێك لە دەرگای ماڵەکەی دا. دایەگەورەی خێزانەکە، کە ژنێکی بە تەمەن بوو، بە پورە مۆنیکا ناومان دەبرد، چوو دەرگا بکاتەوە. دوانیوەڕۆیەکی درەنگ بوو، هەوا لە دەرەوە هێشتا گەرم بوو، بەڵام ژوورەکەی ئێمە کە لێی دانیشتبووین، فێنك و ڕوو لە سێبەر بوو. پیاوەکە ڕووەو ڕۆژ لەناو دەرگاکەدا ڕاوەستابوو، من تەنیا وێنەی سێبەرەکەیم دەبینی، خۆیم نەدەبینی، بەڵام گوێم لێبوو بەدوای کەسێکدا دەگەڕا بە ناوی واریس. پورە مۆنیکا بانگی کردم، 'واریس، لەسەر تەلەفون بانگت دەکەن.'

'لەسەر تەلەفون؟ تەلەفون لە کوێیە؟'

'دەبێت لەگەڵ ئەم پیاوە بچیت. ئەو دەتبات بۆ لای تەلەفونەکە.'

دوای پیاوەکە کەوتم بۆ ماڵیان. پیاوەکە دراوسێی پورە مۆنیکا بوو، ماڵەکەیان چەند دەرگا ئەولا تر بوو، تەنیا ماڵێك بوو لە ناوچەکەدا، کە تەلەفونیان هەبێت. بە ناو ژووری دانیشتنەکەیاندا چووین بۆ هۆڵەکەیان و پیاوەکە تەلەفونەکەی پیشان دام. 'هەلاو؟' ئاژانسەکەم بوو لە لەندەنەوە.

'هەلاو واریس. ببورە زەحمەتم دای، بەڵام بی بی سی پەیوەندی بە ئێمەوە کردووە و دەڵێن، پێیان خۆشە بە زووترین کات پەیوەندیان پێوە بکەیت. دەیانەوێت قسەت لەگەڵدا بکەن لەسەر دەرهێنانی فیلمێکی دیکۆمێنتی.'

'دیکومێنتی لەبارەی چییەوە؟'

'سەبارەت بە بوونت بە سوپرمانیکان، لەکوێوە هاتوویت و چ هەستێکت هەیە بەرامبەر بەم ژیانە تازەیە، تۆ خۆت دەزانی.'

'ئەوە خۆ چیرۆك نییە. ئەی هاوار، ئەیان دەتوانی شتێکی باشتر بدۆزنەوە؟'

'باشە، هەرچی چۆنێك بێت لەسەر ئەمە قسەیان لەگەڵدا بکە. چ کاتێك تەلەفونیان بۆ دەکەی، تا پێیان ڕاگەیەنم؟'

'تەماشاکە، من نامەوێت لەگەڵ هیچ کەسێکدا قسە بکەم.'

'بەڵام بەڕاستی ئەوان دەیانەوێت بەزووترین کات قسەت لەگەڵدا بکەن.'

'وەك تۆ دەڵێیت. تەنیا پێیان بڵێ کاتێك گەیشتمەوە لەندەن، قسەیان لەگەڵدا دەکەم. کە نێرەم جێهێشت، دەبێت بگەڕێمەوە نیویورك، پاشان فڕۆکە دەگرم بۆ لەندەن. هەرکە گەیشتمە ئەوێ تەلەفونیان بۆ دەکەم.'

'زۆر چاکە. من پێیان دەڵێم.'

بەڵام بۆ سبەینێ، کە لە دەرەوە بووم بەشداری ئاهەنگەکەم دەکرد، پیاوەکە هاتبۆوە بۆ لای پورە مۆنیکا و وتبووی داوای واریس دەکەن لەسەر تەلەفون. ئەمەم تەواو پشتگوێ خست. دووبارە ڕۆژی دوایی تەلەفونێکی تر کرا. ئەم جارەیان لەگەڵ پیاوەکە ڕۆیشتم، چونکو لەوە دەچوو زەحمەتی ئەم پیاوە بدەن بە ناردنی بە شوێن مندا. گومانی تیادا نەبوو، دووبارە ئاژانسەکەم بوو.

'بەڵێ، چییە؟'

'بەڵێ واریس. دووبارە بی بی سییە. دەڵێن زۆر پێویستە قسەت لەگەڵدا بکەن، سبەینێ لەهەمان کاتدا تەلەفونت بۆ دەکەن.'

'سەیرکە، ئێستا کاتی پشوومە، چاکە؟ بە هیچ شێوەیەك قسە لەگەڵ کەسدا ناکەم. من لەتاو هەموو ئەمانە هەڵهاتووم، لەبەرئەوە وازم لێ بێنن با تەنیا بم و کۆتایی بە وەرسکردنی ئەو پیاوە هەژارەش بهێنن.'

'تەنیا دەیانەوێت دوو پرسیارت لێبکەن.'

هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشا. 'ئەی هاوار. دەیباشە، پێیـان بڵێ، سبەینێ بۆ ئـەم ژمارەیە تەلەفون بکەن.' بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ جێـری پۆمێرۆی بەڕێوەبـەر قـسەم کـرد، کـە بەرهەمهێنـەری فـیلم بـوو بـۆ بـی بـی سـی. لـەبارەی ژیانمـەوە پرسـیاری لێکردم.

بێزارانە وەڵامـم دایـەوە، 'لـەپێش هـەموو شـتێکدا، ئێـستا مـن نامـەوێت لـەبارەی ئەمەوە قسە بکەم. وا بڕیارە من لێرە پشووم هەبێت. دەزانـی؟ نـاتوانین کـاتێکی تـر قسە بکەین؟'

'داوای لێبـوردن دەکـەم، بـەڵام ئێمـە دەبێـت بڕیـار بـدەین و مـن پێویـستیم بـە هەندێك زانیاری هەیە.' من لـە ڕاڕەوی مـاڵی نەناسـێکدا لـە ترینیـداد ڕاوەسـتابووم، باسـی بەسـەرهاتی ژیـانی خـۆمی بـۆ بکـەم بـۆ نەناسـێك لـە لەنـدەن. 'باشـە، چـاکە، واریس. من پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە.'

دوو ڕۆژی تـر دیـسانەوە پیاوەکـە هاتـەوە بـۆ لای پـورە مۆنیکـا، 'تەلـەفون بـۆ واریس.' شـانم هەڵتەکانـد، سـەرم بـۆ بـادا و بـەناو جادەکـەدا دوای پیاوەکـە کـەوتم. جێری بوو لە بی بی سیەوە. 'بەڵێ، واریس، بەڕاستی ئێمـە دەمانـەوێ دیکۆمێنتێـك لەسەر ژیانت تۆمار بکەین. فیلمەکە نیو کاژێر درێژ دەبێت، لە بەرنامەی *ڕۆژێك کە ژیانم گۆڕا*[2] پیشان دەدرێ.'

لە ماوەی نێوان یەکەم تەلەفون لەلایەن ئاژانسەکەمەوە و دووەم تەلەفون لەلایەن بی بی سییەوە، هەر بیرم لەو فیلمە دیکۆمێنتییە دەکردەوە. 'باشە، گوێبگرە جێـری - من لەگەڵت ڕێکدەکەوم. ئەم کارە لەگەڵ ئێوەدا دەکەم، ئەگەر ئێوە من بەرنەوە بۆ سۆماڵ و یارمەتیم بدەن دایکم بدۆزمەوە.' ڕازیبوو، لەو بـاوەڕەدا بـوو گەڕانـەوە بـۆ ئەفریقا کاریگەرییەکی چاکی دەبێت لەسەر بەسەرهاتەکەم. جێری پێی وتم، هەرکـە گەیشتمە لەندەن تەلەفونی بـۆ بکـەم، بۆئـەوەی دانیـشین و پلانـی هـەموو پڕۆژەکـە دابڕێژین.

بە هۆی گرفتی پاسپۆرت، جەنگی خێڵەکی ناو سۆماڵ و بێتوانایيم لە دۆزینەوەی خێزانەکەماندا، گەڕانەوەم لەگەڵ بی بی سی، دەبووە یەکەم هەلی سەردانی ماڵەوە، لەو کاتەوەی کە مەقادیشۆم جێهێشتبوو. هەتا ئەگەر بتوانم سواری فڕۆکە بم بۆ مەقادیشۆ، وەك ئەوە نییە، کە تەلەفون بکەم بۆ دایکم و پێی بڵێم لە فڕۆکەخانە بمبینێ. لەو ساتەوەی بی بی سی بەڵێنی بردنەوەی منی دا، بێجگە لەوە نەمدەتوانی بیر لە هیچی تر بکەمەوە. دانیشتنێکی زۆرم بوو لەگەڵ جێری و کۆلی یاریدەدەری، بۆ پلان دانانی پرۆژەکە و قووڵکردنەوەی بەسەرهاتی ژیانی خۆم.

هەر لە لەندەنەوە دەستمان کرد بە فیلم گرتن. چوومەوە بۆ هەموو ئەو شوێنانەی، کە ئەو کاتەی لەماڵی خاڵە محەمەد بووم. خانووەکەی باڵوێزی سۆماڵ، کە بی بی سی مۆڵەتی وەرگرتبوو بۆ چوونە ژوورەوە. قوتابخانەی سۆلس چێرچ، کە تیایدا مالکۆلم فایرچایەلد چاوی بە من کەوت. پاشان لەسەر کامێرا دیمانەیان لەگەڵ مالکۆلم فایرچایەلد کرد، پرسیاریان لێکرد، کە چی وای لێکرد بە دوای وێنەگرتنی کارەکەرێکی نەناسراوەوە بێت. ستافەکە فیلمیان لێگرتم کاتێك کە تێرێنس دۆنۆڤان خەریکی وێنە گرتنم بوو. دیمانەیان کرد لەگەڵ هاوڕێ باشەکەم، سارا دۆکاس، بەڕێوەبەری ستۆرم لە ئاژانسی مۆدێلی لەندەن.

شوروشەوقی پرۆژەکە هەنگاوێکی گەورەی نا، کاتێك کە بی بی سی بڕیاری دا فیلمم لێبگرێت وەك بەڕێوەبەری بەرنامەی سۆل ترێن[3]، کە باشترین بەرنامەی تەلەفیزیۆنییە لە مەیدانی موسیقای ڕەشدا. لەوەوپێش هەرگیز شتی وام بەخۆمەوە نەبینیبوو، تەواوی سەرئێشە بوو بۆ من. سەرەڕای ئەوەش کە گەیشتمە لۆس ئەنجلوس. بە قورسی سەرمام بووبوو، بەئاستەم دەمتوانی قسەبکەم. تەواوی ئەو ماوەیەی لە سەفەردا بووم لە لەندەنەوە بۆ لۆس ئەنجلوس، خەریکی لووت سڕین، خوێندنەوەی دەستخەتەکانی خۆم، خۆ ئامادەکردن بۆ بەرنامەکە و سوار بوونی لیمۆزین بووم، هەموو ئەمانە لە لایەن ستاف کامێرای بی بی سییەوە، کە وەك

سێبەر بە دوامەوە بوون، فیلمی لێدەگیرا. هەراوبەزمی ئەمە چەند بەرابەر زیادی کرد، کاتێك کە چووین بۆ ستۆدیو و ستافەکەی بی بی سی فیلمیان لە ستاق سۆل ترێن گرت، کە خەریکی فیلم گرتنی من بوون. ئەگەر شتێك هەبێت نەمەوێت فیلمی لێبگیرێت، دەبێت هەر ئەمە بێت. دڵنیام خراپترین بەرێوەبەری بەرنامە بوو لە مێژووی سۆل ترێندا، بەڵام دۆن کۆرنێلیس و ستاق بەرهەمهێنەر زۆر دڵفراوان بوون لەگەڵ من. لە بەیانی کاتژمێری نۆوە دەستبەکار بووین تا نۆی شەو. لەو باوەڕەدام ئەو ڕۆژە، درێژترین ڕۆژی کاریان بوو. ئەو گرفتەی کە هەمبوو لە خوێندنەوەدا هێشتا هەر دەردیسەری بۆ دروست دەکردم، وەك ئەوەی کە لە قسەکردنی فیلمی جیمس بۆندا هەم بوو. سەرەڕای ئەوەی کە تواناییم چووبووە سەرەوە، دەبوو هێشتا هەوڵبدەم بە دەنگی بەرز بیخوێنمەوە. هەوڵی خوێندنەوەی کارتی یەك لە دوای یەکی پرۆگرامەکە لەبەردەم بیست سی سەماکەردا، دە دوانزە گۆرانی بێژی بەناوبانگی نێونەتەوەییدا، هاوکات بریسکە بریسکی لایت، تواناییەکی زیاتری لە من دەویست. هاوار بەرزبۆوە، 'بچۆ بۆ بیست و شەش... بیبڕە!' 'بچۆ بۆ حەفتا و شەش... بیبڕە!' مۆسیقا لێدەدرا، سەماکەران دەکەوتنە سەما و هەموو دەستیان بە فیلم گرتن دەکرد، ئینجا من ڕیزەکانم تێکەڵ دەکرد: 'بچۆ بۆ نەوەد و شەش... بیبڕە!' سەماکەرەکان لە شوێنی خۆیان وشك دەبوون، پاشان باڵیان شۆڕ دەکردەوە و لە من ورد دەبوونەوە وەك ئەوەی بڵێن، 'ئەم دەڵە سەگە کەرە کێیە؟ ئەمەتان لە کوێ دۆزیوەتەوە؟ با بچینەماڵەوە.'

یەکێك لە کارەکانم بەخێرهاتنی دۆنا سومەر بوو، کە شانازییەکی گەورە بوو بۆ من، چونکو یەکێك لە گۆرانی بێژە پەسندکراوەکانی هەمیشەیی من بوو. 'خانمان، ئاغایان، تکایە چەپڵەیەکی گەرم بۆ خانمی سۆل، دۆنا سومەر!'

'بیبڕە!'

'ئێستا چی؟'

'لەبیرت چوو ناونیشانی بڵێیت. واریس کارتەکە بخوێنەرەوە.'

'ئۆی ئەعلەتی - ئەی! ئەم کارتە قۆڕە بەرزدەکەیتەوە، بەرزی کەرەوە؟ ناتوانم ببینم. و مەیبەرە خوارەوە. ڕێك ڕایگرە - ئەو لایتانە ڕێك لە چاوم دەدا. ناتوانم شت ببینم.'

دۆن کۆرنیلۆس منی بردە سوچێکەوە و پێی وتم، 'هەناسەیەکی قووڵ بدە. پێم بڵێ هەست بەچی دەکەیت.' بۆم باسکرد، ئەو دەستوخەتە بەکەڵکی من نایەت - ئەوە شێوازی من نییە بەو شێوەیەی من قسە دەکەم.

'چۆنت دەتەوێت؟ وا بکە. بڕیار بدە - هەمووی بکە.' ئەوان زۆر ئارام و لەسەرخۆبوون لەگەڵم. دۆن و ستافەکەی ڕێگایان دا خۆم بڕیار بدەم و خۆم هەمووی بکەم، پاشان یارمەتیان دام سەرلەنوێ بیکەمەوە. باشترین بەشی هەموو ئەم ئەزمونە، کارکردن لەگەڵ ئەم کۆمەڵە و دۆنا سۆمەر بوو، کە سیدییەکی بە ئیمزای یادگاری خۆی، دامێ.

پاشان من و بی بی سی چووین بۆ نیویورك. دوام کەوتن بۆ شوێنی کارەکەم، کە لە دەرەوەی ستودیۆ بوو، لەبەر باران وێنەم لێگیرا، کە بە کراسی ڕەشی ژێرەوە، پاڵتۆی بارانی و چەتر بەدەستەوە، بەسەر جادەکانی مانهاتاندا هاتوچۆم دەکرد. شەوێکی تر، کامێراچییەکە لە فۆژبنێکی ماڵەکەمەوە فیلمی لێدەگرتم، لە کاتێکدا کە خۆم و هاوڕێکانم خەریکی چێشت لێنان بووین. ئەوەندە خۆشمان بردەسەر کە لە بیرمان چووەوە ئەو لەوێیە.

قۆناغی داهاتوومان وا پێویستی دەکرد، کە من و هەموو ستافەکە لە لەندەن یەکتری بگرینەوە و فڕۆکە بگرین بەرەو ئەفریقا، کە لەوێ بۆ یەکەم جار لە پاش هەڵهاتنم، بە خێزانەکەمان شاد دەبمەوە. کاتێك کە لە لەندەن، لۆسئەنجلوس و نیویورك خەریکی فیلم گرتنبووین، ستافی بی بی سی لە هەوڵی دۆزینەوەی دایکمدا

بوون. بۆ دیاری کردنی شوێنی خێزانەکەمان کەڵکمان لە نەخشە وەرگرت و هەوڵمدا ئەو ناوچانەیان پیشان بدەم کە خێزانەکەمان ئاسایی کۆچیان تیادا دەکرد. پاشان دەبوو بچینە سەر تەواوی ناوی خێڵی خێزانەکەمان، کە زۆر ناڕۆشن بوو بەتایبەتی بۆ ڕۆژئاواییەکان. بۆ ماوەی سێ مانگ بی بی سی خەریکی گەڕان بوو بەبێ هیچ سەرئەنجامێك.

پلانەکە ئاوابوو کە من لە نیویورك خەریکی کاری خۆم بم تا بی بی سی دایکم دەدۆزێتەوە، پاشان دەچم بۆ لەندەن و لەوێوە هەموو پێکەوە دەچین بۆ ئەفریقا و سەرئەنجامی بەسەرهاتەکەم لەوێ فیلمی لێدەگیرێت. پاش ماوەیەکی کورت لە گەڕانی بی بی سی بەدوای دایکمدا، جێری تەلەفونی بۆ کردم و وتی، 'دایکتمان دۆزیوەتەوە.'

'ئەی کە خۆشە!'

'لەو باوەڕەداین خۆی بێت.'

'مەبەستت چییە لەوەی دەڵێی "لەو باوەڕەدام"؟'

'ئەو ژنەی دۆزیومانەتەوە و پرسیاری لێدەکەین کە کچێکی هەیە بەناوی واریس. دەڵێت، بەڵێ، بەڵێ کچم هەیە بە ناوی واریس. بەڵێ واریس لە لەندەن دەژی. بەڵام زۆر زۆر بێئاگایە لە وردەکاری، لەبەرئەوە ستافەکەمان لە سۆماڵ دەستی بەستراوە نازانێ چی بکات - کە ئایا ئەو ژنە دایکی واریسێکی ترە یان چی.' پاش چەند پرسیاری تر بی بی سی دەست لە ژنەکە هەڵدەگرێت، بەڵام ئەمە سەرەتای گەڕان بوو. لەپڕ بیابان پڕبوو لە ژنانێك کە خۆیان دەکرد بە دایکی من، هەموو کچیان هەبوو بە ناوی واریس، لە لەندەن دەژیا، کە ئەمە بۆ خۆی زۆر نامۆ بوو، لە کاتێکدا من بۆ خۆم هەرگیز کەسێکم نەبینیبوو هاوناوی من بێت.

بۆم باسکردن کە ئەمە چ باسە. 'سەیرکە، ئەو خەڵکە لەوێ زۆر هەژار و بێچارەن. ئەو خەڵکە لەوەی بڵێن "نا، ئێمە کەسوکاری ئەوین" هیوایەك دەبینن، کە

ئێوە دەچنە لادێ بچوکەکەیان و فیلم دەگرن و لەوانەیە لەو پەیوەندەدا پارەیەکیان دەستکەوێت، خواردنێکیان بەرکەوێت. ئەو ژنانە وا خۆیان پیشان دەدەن کە دایکی منن بەو هیوایە شتێکیان چنگکەوێت. نازانم چۆن بیردەکەنەوە کە بەو هیوایە دەگەن، بەڵام ئەوان هەوڵی خۆیان دەدەن.

بەداخەوە هیچ وێنەیەکی دایکمم نەبوو، بەڵام جێری بیرێکی تری کەوتە سەرەوە. 'ئێمە پێویستمان بە شتێکی نهێنی هەیە لەبارەی تۆوە، کە تەنیا دایکت لێی ئاگادارە.'

'چاکە، دایکم هەر بە ئاڤدۆلە بانگی دەکردم، کە واتای دەم بچکۆلە دێت.'

'ئینجا بیری ئەوەی دێتەوە؟'

'بێگومان.'

ئیتر لەپاش ئەوەوە ئاڤدۆل بوو بە ناوی نهێنی. کاتێك کە بی بی سی لەگەڵ ئەم ژنانەدا گفتوگۆی دەکرد تەنیا دەیان توانی وەڵامی چەند پرسیار بدەنەوە، کە دەگەیشتن بە ناوەکە تێدەکەوتن. ماڵئاوا. بەڵام لە کۆتاییدا ڕۆژێکیان تەلەفونیان بۆ کردم و وتیان، 'لەو باوەڕەداین دۆزیومانەتەوە. ئەم ژنە نازناوەکەتی بیر نییە، بەڵام دەڵێت کچێکی هەیە بەناوی واریس کە کاری بۆ باڵوێز کردووە لە لەندەن.'

بۆ ڕۆژی دوایی یەکسەر لە نیویورکەوە سواری فڕۆکە بووم. کە گەیشتمە لەندەن، بی بی سی چەند ڕۆژی پێویستبوو خۆی ئامادەکات. سەفەری فڕۆکەمان ئامادەکرد بۆ ئادیسئابابا لە ئسیوپیا، پاشان بە فڕۆکەیەکی بچوك بۆ سنووری نێوان ئسیوپیا و سۆماڵ. سەفەرەکە مەترسیدار بوو. لەبەر جەنگ نەمان دەتوانی بچینە ناو سۆماڵەوە، لەبەرئەوە خێزانەکەمان دەبوو سنوور ببڕن بێن بۆ لامان. ئەو شوێنەی فڕۆکەکەی لێدەنیشتەوە ناوەڕاستی بیابان بوو، جادەی نیشتنەوەی نەبوو، لە ناو دەوەن و دار و بەرددا دەنیشتەوە.

کاتێك بی بی سی خەریکی خۆ ئامادەکردن بوو، من لە هۆتێل مامەوە. نیگل هات بۆ سەردانم. لەبەر ناسکی هەلومەرجەکەم هەوڵمدا ئارام بم لەگەڵی. هێشتا من بارمتەی خانووەکەیم ئەدا لە والش، لەبەرئەوەی کاری نەبوو، ڕازی نەبوو کار بدۆزێتەوە. هەتا لە لای کەسانێك کە دەمناسین کارم بۆ دۆزییەوە، بەڵام پاش سێ هەفتە دەریان کرد و پێیان وت بەم ئاوەدا نەگەڕێتەوە. لەسەرەتاوە، کاتێك نیگل ئاگاداری ئەم فیلمە دیکومێنتییە بوو، کەوتە درێژدادڕی کردن لەگەڵم بۆئەوەی بێت بۆ ئەفریقا. 'دەمەوێ بێم، دەمەوێ ئاگاداری لە تۆ بکەم.'

پێم وت، 'نا، تۆ نایەیت. لەو باوەڕەدای، من چۆن باسی تۆ بکەم بۆ دایکم؟ بڕیارە تۆ چی بیت؟'

'باشە، من مێردی تۆم!'

'نا، تۆ نا! لە بیری خۆتی بەرەوە. تێگەیشتی؟ ئەوە هەر لە بیری خۆت بەرەوە.' شتێك زۆر ڕۆشن بوو، نیگل ئەو کەسە نەبوو، من بە دایکمی بناسێنم. وەك مێردم، ئەوە بێگومان هەر نا.

هەر لە یەکەم کۆبوونەوەکانی پلاندانانەوە لەگەڵ بی بی سی، نیگل پێی داگرت لەسەرئەوەی بێت. هەر زوو جێری بێزاربوو بەدەستییەوە. زۆرجار بۆ ئانخواردنی ئێواران کۆدەبووینەوە، جێری ڕۆژێکیان تەلەفونی کرد و وتی، 'ئیمشەو ئەو لەگەڵت دێت؟ تکات لێدەکەم، واریس، وازی لێبهێنە با نەیەت.'

کە گەڕامەوە بۆ لەندەن، نیگل هات بۆ هۆتێلەکەم دووبارە کەوتەوە قسەکردن بۆئەوەی بێت بۆ ئەفریقا. کە ڕەتم کردەوە، پاسپۆرتەکەمی دزی. بێگومان دەیزانی، بڕیارە ئێمە لە ماوەی چەند ڕۆژدا وڵات بەجێدەهێڵین. هیچ قسەیەك نەما بتوانێت ئەو ڕازی بکات پاسپۆرتەکەم بداتەوە. لە بێچارەیدا شەوێکیان جێریم بینی و پێم وت، 'جێری، باوەڕ ناکەی ئەگەر پێت بڵێم، پاسپۆرتەکەمی بردووە و نیازی نییە بیداتەوە دەستم.'

جیڕی بە هەر دوو دەست ناوچەوانی خۆی گرت و چاوانی نووقاند. 'ئەی هاوار، بەڕاستی هێزم لەبەر بڕا بەدەست ئەمەوە، واریس. مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم هیچەدا پەکی خستم - بەڕاستی بێزار بووم.' جیڕی و کەسەکانی تری بی بی سی هەوڵیان دا قسە لەگەڵ نیگل بکەن. 'سەیرکە، وەك کەسێکی گەورە هەڵسوکەوت بکە. ئێمە خەریکە دەگەینە کۆتایی پرۆژەکەمان، تۆ ناتوانی ئەمە لەگەڵ ئێمە بکەیت. پێویستە ئەم بەسەرهاتە لە ئەفریقادا بگەیەنین بە کۆتایی، کە ئەمەش بە واتای ئەوەیە واریس بەرین بۆ ئەوێ. تکات لێدەکەین ...' بەڵام نیگل گوێی پێنەدا. بە پاسپۆتەکەمەوە گەڕایەوە بۆ واڵس.

بە تەنیا سەفەرم کرد بۆ واڵس و لێی پاڕامەوە. هەر دووبارە ڕازی نەبوو دەستی لێهەلگرێت ئەگەر لەگەڵمان نەیەت بۆ ئەفریقا. لە ماوەی پانزە ساڵدا دەست بە دوعا بووم بۆ هەلێك دووبارە دایکم ببینمەوە. لەگەڵ نیگل بچم هەر هەموویم لێتێکدەدات. هیچ دوودڵییەکم لەمەدا نەبوو - گومانی تیادا نەبوو تێکیدەدات. ئەگەر ئەوم لەگەڵ خۆم نەبردایە، هیچ شانسێکم نەبوو دایکم ببینم، چونکو بێ پاسپۆرت نەمدەتوانی سەفەر بکەم. 'نیگل تۆ بۆت نییە دوامان کەویت و سەرئێشە بۆ هەمووومان دروست کەیت. نایبینیت - هەلێکە بۆ بینینی دایکم بۆ یەکەم جار پاش پانزە ساڵ.

زۆری پێناخۆش بوو، ئێمە دەچین بۆ ئەفریقا و ئەو هیچی لەدەست نایەت بیکات. 'سوێند دەخۆم، تۆ زۆر نارەوا بوویت لەگەڵ من!' هاواری کرد. لە کۆتاییدا ڕازیم کرد پاسپۆرتەکەم بداتەوە، بەو بەڵێنەی ڕۆژێك لە ڕۆژان بیبەم بۆ ئەفریقا، کە ئەم کارە تەواو بوو - تەنیا هەردووکمان. فێڵێکی ئاسان بوو، مایەی شانازی نەبوو، چونکو دەمزانی هەرگیز ئەو بەڵێنە نابەمەسەر. بەڵام هەڵسوکەت لەگەڵ نیگل، وەك کەسێکی بەڕەوشت و هۆشمەندانە، هەردەم بێکەڵك بوو.

لە گالادی، دێیەکی بچوکی ئیسیوپیا، کە پەنابەرانی سۆماڵ تیایدا کۆبووبوونەوە پاش ئەوەی سنوریان بڕیبوو لەدەست جەنگ هەڵهاتبوون، فڕۆکە دوو ماتۆڕییەکەمان لە بیابانێکی خاك سووری بەردرێژدا، خراپ نیشتەوە. لە دووری چەند میلەوە تەپوتۆزی خەڵك بەرزبۆوە، هەموو بەرەو ڕووی ئێمە ڕایان دەکرد. لەوەوپێش شتی وەهایان نەبینیبوو. من و ستاف بی بی سی لە فڕۆکەکە هاتینەخوارەوە و یەکسەر هەوڵمدا بە سۆماڵی قسە بکەم لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە بەرەو پیرمان هاتبوون. کۆششم کرد لەگەڵیان قسەوباس دامەزرێنم، چونکو هەندێکیان ئسیوپی بوون و هەندێکی تریان سۆماڵی، بەڵام بە زاراوەیەکی تر دەدوان. پاش چەند خولەك وازم هێنا.

بۆنی هەوای گەرم و لم بەسەردا هات و یەکسەر منداڵی ونبووی خۆمم بیرکەوتەوە. هەموو بیرەوەرییە بچوکەکان وەك لێشاو ڕووی تێکردم و دەستم کرد بە ڕاکردن. دەستەکە هاواریان لێهەڵسا، 'واریس، بۆ کوێ ڕادەکەیت؟'

'کاری خۆتان بکەن ... بۆ هەر شوێنێك پێویستە بچن ... من دەگەڕێمەوە.' ڕامکرد و دەستم لە زەوییەکە دا و بە خۆڵ پەنجەکانمم شێلا. دەستم لە درەختەکان دا. تۆزاوی و وشك بوون، بەڵام دەمزانی کاتی باران هاتووە، پاشان هەموو شتێك دەبووژێتەوە. پڕ بە سییەکانم هەوام هەڵمژی. یادگارییەکانی منداڵیمی پێومبوو، هەموو ئەو ساڵانەی کە لە دەرەوە ژیام، ئەو ڕووەکە بیابانیانە و ئەو لە سوورەماڵم بوو. ئەی هاوار ئەمە شوێنی منە. لە خۆشی ئەوەی گەڕاومەتەوە ماڵێ، دەستم کرد بە گریان. لەژێر درەختێکدا دانیشتم و هەستم کرد زۆر دڵخۆشم بەوەی گەڕاومەتەوە شوێنێك کە مولکی ئەوم، لە هەمان کاتیشدا غەم دایگرتم چونکو ماوەیەکی زۆر بوو ئەمەم لەدەست دابوو. سەیرێکی دەوروپشتی خۆمم کرد، بۆم پرسیار بوو، کە چۆن توانیومە بۆ ماوەیەکی درێژ لێی دووربم. وەك کردنەوەی دەرگایەك وابوو کە تا ئەو ڕۆژە نەمدەوێرا بیکەمەوە، بەشێك لە خۆمم دۆزییەوە

کە لە یادمدا نەمابوو. کە گەڕامەوە لادێکە، هەموو بە دەورمدا کۆبوونەوە و تەوقەیان لەگەڵدا کردم. "خوشکێ بەخێربێیتەوە."

پاشان بۆمان دەرکەوت، ئەوەی چاوەڕوانمان دەکرد وا دەرنەچوو. ئەو ژنەی دەیوت دایکی منە وا نەبوو. هیچ کەسیش نەیدەزانی چۆن خێزانەکەم بدۆزێتەوە. کوڕەکانی بی بی سی بێهیوا بوون، پارەیان لە بودجەدا نەبوو بۆ جاری دووهەم بگەڕێنەوە. جێری بە بەردەوامی دەی وت، "نا، نا، بەبێ ئەم بەشە بێ کۆتایی دەبێت. بێ کۆتاییش بەسەرهاتێکی ڕاستەقینە نادات بە دەستەوە بۆ تەواوی فیلمەکە. هەمووی بە فیڕۆچوو. چی بکەین؟"

کەوتینە گەڕان بەناو لادێکەدا، لە هەموو کەسێکمان پرسی کە ئایا هیچیان لەبارەی خێزانی منەوە بیستووە، یان هیچ زانیارییەکیان لەبارەیانەوە هەیە. خەڵك هەموو حەزیان دەکرد یارمەتیمان بدەن، داوایەك کە بە شوێنیدا هاتبووین زۆر بە خێرایی بڵاوبۆوە. ئەو ڕۆژە درەنگانێ پیاوێکی پیر بۆ لام هات و وتی، "تۆ منت بیرنایەت؟"

"نا."

"من ئیسماعیلم، من سەر بە هەمان خێڵم وەك باوکت، من هاوڕێیەکی نزیکی ئەوم." پاشان زانیم کێیە و شەرم گرتمی کە نەمناسییەوە، بەڵام لە منداڵییەوە نەمبینیبوو. "لەو باوەڕەدام دەزانم خێزانەکەتان لە کوێیە. لەو باوەڕەدام دەتوانم دایکت بدۆزمەوە، بەڵام پێویستیم بە پارەیە بۆ بەنزین. یەکسەر لەدڵی خۆمدا وتم، *ئۆی، نا. چۆن متمانە بەم کابرایە بکەم؟ ئەم هەموو خەڵکە لە هەوڵدان فێڵمان لێبکەن؟ ئەگەر هەندێك پارە بدەم بەم کابرایە، دەڕوات و ون دەبێ و لەوانەیە هەرگیز نەیبینینەوە.* کابرا لەسەر قسەی خۆی بەردەوام بوو، "ئەم ماشێنە بارهەڵگرەم هەیە، بەڵام شتێکی وەها نییە ..."

ئیسماعیل ئاماژەی بە پیکاپێك کرد - جۆرێك بوو، کە تەنیا لە ئەفریقا یان کەلاوەکانی ئەمریکادا دەتبینییەوە. دەرگای تەنیشتی ڕێبوار پەنجەرەی پێوە نەمابوو، لە لای شۆفێریشەوە هەر دەرگای پێوە نەمابوو. ئەمەش بەواتای ئەوەیە، تەواوی لم و مێشولەی بیابان دەچێت بە دەموچاوی شۆفێرەکەدا کاتێك ماشێنەکەی لێدەخوڕێت. ویلەکانی خواروو و قوپاو بووبوون، بەهۆی ئەوەی بەسەر بەرددا ڕۆیشتبوون. بۆدییەکەی لەوە دەچوو کەسێك چەکوشکاری کردبێت. سەرم بادا و وتم، 'تۆزێك ڕاوەستە، با لەگەڵ کوڕەکان قسە بکەم.'

چووم جێریم دۆزییەوە و پێم وت، 'ئەو کابرایە لەو سەرەوە، لەو باوەڕەدایە دەزانێت خێزانەکەمان لە کوێیە. بەڵام دەڵێت پێویستم بە پارەیە بۆ بەنزین بۆئەوەی بەدوایاندا بگەڕێم.'

'باشە ئێمە چۆن متمانەی پێبکەین؟'

'ڕاست دەڵێیت، بەڵام دەبێت هەر هەوڵێك بدەین. ڕێگایەکی ترمان نییە.' ڕازی بوون و هەندێك پارەمان پێدا. کابرا چووە پشت سوکانەوە و یەکسەر بۆی دەرچوو، دنیایەك تەپوتۆزی لەدوای خۆیەوە جێهێشت. جێریم بینی، بە دەموچاوێکی بێئومێدانەوە، تەماشای دەکرد وەك ئەوەی بڵێت، 'پارەیەکی زیاترمان لە کیسچوو.'

دەستم دا بە پشتیدا و وتم، 'دڵگران مەبە. دایکم دەدۆزینەوە - بەڵێنی سێیەمین ڕۆژت پێ دەدەم.' ئەم پێشبینییەم تۆزێك مێشکی دەستەکەی ئاسودە کرد. هەشت ڕۆژمان مابوو لێرە، پێش ئەوەی فڕۆکەکە بێتەوە بە شوێنماندا هەڵمان گرێت. ئەمان دەتوانی بە فڕۆکەوان بڵێین، 'ئۆی نا. ئێمە بەتەواوی ئامادە نیین، هەفتەیەکی تر وەرەوە بە شوێنماندا.' بلیتی گەڕانەوەمان لە ئادیسئاباباوە بۆ لەندەن بۆ بڕابوو، دەبێت ئێرە جێبهێڵین و ئەمەش دەبوو بە کۆتایی، دایکمم ببینیایە یان نەمبینیایە.

کاتێکی خۆشم لەگەڵ لادێییەکاندا لەناو دەوارەکانیاندا بردەسەر، پێکەوە نانمان دەخوارد، بەڵام کوڕە بەریتانییەکان خۆشییەکی وەهایان نەدەبینی. خانوویەکی بێ پەنجەرەیان دۆزیبۆوە بۆ نووستن و کیسەخەوەکانیان تیادا ڕاخستبوو. هەندێك کتێب و لایتیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، بەڵام شەو بەدەست مێشولەوە شێت بووبوون، نەیان دەتوانی بخەون. ستاڤ بی بی سی فاسۆلیا و پاقلەی قوتویان دەخوارد و گلەیی ئەوەیان دەکرد کە بەهۆی خواردنەکەیانەوە نەخۆش کەوتوون و هیچ شتێکی تریش نییە بیخۆن.

پاش نیوەڕۆیەکیان پیاوێکی سۆماڵی بڕیاری دا میوانداریمان لێبکات و گیسکێکی بچوکی جوانی لەگەڵ خۆیدا هێنا، هەموو کوڕەکان دەستیان پیدا هێنا. پاشان پێستەکەی گوری و هێنایەوە و بەشانازییەوە وتی، 'ئەمە نانی ئێوارەتانە.' کوڕەکان بە پەشۆکاوییەوە تەماشایان کرد، بەڵام هیچیان نەوت. قابلەمەیەکم هێنا و ئاگرێکم بۆ کردەوە، پاشان گۆشتەکەم کوڵاند لەگەڵ تۆزێك برنج. کاتێ پیاوە سۆماڵییەکە ڕۆیشت، کوڕەکان وتیان، 'خۆ لەو باوەڕەدا نیت ئێمە ئەوە بخۆین؟'

'بەڵێ بێگومان، بۆچی نا؟'

'نا واریس، لەبیر خۆتی بەردەوە.'

'چاکە، ئەی بۆچی هیچتان نەوت؟' ڕوونیان کردەوە کە هەستیان کردووە، دەبێت بە جۆرێك لە بێڕێزی، چونکو پیاوەکە هەوڵی داوە ڕێز بنوێنێ، بەڵام پاش ئەوەی دەستیان هێنا بەسەر گیسکەکەدا، نەیان توانی بیخۆن. ئیتر هەرگیز دەستیان بۆ نەبردەوە.

ئەو سێ ڕۆژە ڕۆیشت و هەواڵێك لە دایکم نەبوو. جێری هەر ڕۆژە زیاتر نیگەرانتر دەبوو. دووبارە هەوڵمدا کوڕەکان دڵنیاکەمەوە، کە دایکم هەر دێت، بەڵام ئەوان پێیان وابوو، کە لەخۆمەوە قسەدەکەم. پێم وتن، 'تەماشاکەن. بەڵێنتان

پێدەدەم، سبەینێ ئێوارە، نزیک کاتژمێری شەش دایکم لێرە دەبێت.' نەمدەزانی بۆچی وا بیرم دەکردەوە، بەڵام ئەوە هات بە خەیاڵمدا و منیش پێم وتن.

جێری و کوڕەکان کەوتنە ئازاردانی من لەسەر دوا پێشبینیم. 'چی؟ ئاوا؟ چۆن ئەمەت زانی؟ دەی باشە واریس ئەمە دەزانی! پێشبینی هەموو شتێك دەکات. دەزانێت! هەروەك چۆن پێشبینی باران دەکات!' پێدەکەنین، چونکو بەردەوام پێم دەوتن کەی باران دەبارێت، لەبەرئەوەی دەمتوانی بۆنی بکەم.

'ئەوەتا، باران دەبارێت، وا نییە؟' دەمویست بیزانن.

'دەی دەی واریس. تۆ تەنیا بەخت یاوەرت بوو.'

'هیچ پەیوەندییەکی بە بەختەوە نییە. من گەڕاومەتەوە شوێنی خۆم - شارەزای ئەم شوێنەم. هاوڕێیان، ئێمە بە غەریزەی خۆمان ژیانمان بەدەربردووە.' هەموو بەلایەکی چاو تەماشای یەکتریان دەکرد. 'چاکە، باوەڕم پێمەکەن. دەتان بینم - کاتژمێری شەش.'

بۆ سبەینێ لەگەڵ خانمێکی بەتەمەندا دانیشتبووم، نیزکەی کاتژمێر دەی دەویست بۆ شەش، کە جێری بە هەڵەداوان هات بۆلام. 'لەوە ناچێت باوەڕ بکەیت!'

'چی بووە؟'

'دایکت - وابزانم دایکت گەیشت.' هەستامە سەرپێ و زەردەخەنە گرتمی. 'بەڵام، دڵنیا نیین. کابراکە هاتۆتەوە و ژنێکی لەگەڵ خۆی هێناوە، دەڵێت ئەوە دایکتە. وەرە تەماشاکە.'

هەواڵەکە وەك کەوتبێتە دەم ڕەشەبا، بە ناو دێکەدا بڵاوبۆوە، ئەو شانۆگەرییە بچکۆلەیەی ئێمە هەمان بوو، بێگومان گەورەترین ڕووداوی دێکە بوو. هەموو کەس دەویست بزانێت، ئەوە دایکی منە یان تەڵەکەبازێکی ترە؟ دنیا بەرەو تاریکبوون دەچوو، خەڵکێکی زۆر لێم کۆبوونەوە کە بەئاستەم دەمتوانی ڕێبکەم. جێری منی بردە سەر ڕێگایەکی بچوك. لە پێشمانەوە پیکاپی کابراکەم بینی شەبەقێك لە

پەنجەرەکەیدا هەبوو، ژنێك لە کورسییەکەی هاتەخوارەوە. نەمدەتوانی دەموچاوی ببینم، بەڵام بەشێوەی بەستنی سەرپۆشەکەی سەریدا یەکسەر زانیم دایکمە. ڕامکرد و باوەشم پیادا کرد. 'ئەی دایە!'

دایکم وتی، 'میلاو میل بەم ماشێنە خراپە هاتین - ئاخ. چ سواربوونێکی ترسناك بوو ئەمە! دوو شەو و دوو ڕۆژە بە ڕێگاوەین - هەمووی بۆ ئەمە؟'

ئاوڕم لە جێری دایەوە و پێکەنیم. 'خۆیەتی!'

بە جێریم وت، کە بۆ دوو ڕۆژ تەنیا جێمان بهێڵن، ئەویش دڵسۆزانە قبووڵی کرد. قسەکردن لەگەڵ دایکم بەزم بوو، سەیرم کرد زمانە سۆماڵییەکەم دەلەنگێت. لەوەش خراپتر، من و دایکم بۆ یەکتر بووبووین بە نەناس. لەسەرەتاوە گفتگۆمان لەسەر شتی بچوکی ڕۆژانە بوو. بەڵام خۆشییەك کە لەسەرەتاوە هەستم پێکرد، ساردییەك تەنگی پێهەڵچنی، تەنیا پێم خۆشبوو نزیك دایکم دانیشم. دایکم و شۆفێرەکە دوو شەو و دوو ڕۆژ لەسەریەك بە ڕێگادا هاتبوون و دەمبینی دایکم تەواو هیلاکە. لەماوەی ئەو پانزە ساڵەدا زۆر پیر بووبوو - سەرئەنجامی ژیانی سەختی بێبەزەیی ناو بیابان بوو.

باوکمی لەگەڵدا نەبوو. چووبوو بە دوای ئاودا، کاتێك پیکاپەکە چووبوو. دایکم وتی، باوکیشم پیربووە. هەر بەدوای هەورەوەیە بۆ باران، بەڵام زۆر پەرێشانی چاویلکەیە، چونکو چاوی پەکیکەوتووە. کە دایکم هاتبوو، هەشت ڕۆژ بوو باوکم ڕۆیشتبوو، دایکم ئاواتەخواز بوو وننەبووبێت. هەوڵم دەدا باوکم بهێنمەوە بەرچاوی خۆم و بزانم ئێستا چەند پیربووە. کاتێك ماڵەوەم بەجێهێشت، باوکم دەیتوانی ئێمە بدۆزێتەوە هەتا ئەگەر بارمان بکردایە و هەتا ئەگەر تاریکترین شەوی بێ مانگ بووایە.

عەلی، برا بچوکەکەم هاتبوو لەگەڵ یەکێك لە ئامۆزاکانم، کە لەکاتی گەیشتنی شۆفێرەکەدا، بە ڕێکەوت سەردانی دایکمی کردبوو. عەلی برا بچوکەکەی جاران نەمابوو. نزیکەی مەترێك و نەوەد سانتیمەتر دەبوو، بەسەر مندا دەشکایەوە، داوام لێکرد هەروا بەردەوام بێت. بەردەوام باوەشم بە عەلیدا دەکرد و ئەویش هاواری لێهەڵدەستا، 'بەرم دە! خۆ ئێستا من منداڵ نییم. من وا خەریکە ژن دەهێنم.'

'ژن دەهێنی! بۆچی تەمەنت چەندە؟'

'نازانم. ئەوەندە گەورەم ژن بهێنم.'

'بە من چی. بەلای منەوە تۆ هێشتا منداڵەکەی جارانیت. وەرە ئێرە -' باوەشم پیادا دەکرد و سەریم دەخوراند. ئامۆزاکەم بەمە پێکەنینی دەهات. پێم وت، 'بەردەوام کێشاومە بە قنگی تۆدا!' کاتێك کەماڵی باوکی دەهاتن بۆ سەردانمان و ئەم منداڵ بوو، هەر من چاودێریم دەکرد.

'دەی چاکە، ئێستا خۆت تاقیکەرەوە.' ئامۆزاکەم کەوتە ئانیشك هاویشتن و سەما کردن بە دەورمدا.

'ئۆی، نا، وامەکە!' هاوارم کرد. 'خۆت تاقی مەکەرەوە. لێت دەدەم.' ئامۆزاکەشم خەریکی ژنهێنان بوو. 'کوڕە، ئەگەر دەتەوێت بۆ ڕۆژی زەماوەندەکەت ئامادە بیت، خۆت تووشی شەڕ مەکە لەگەڵ من.'

شەو دایکم لەناو دەواری یەکێك لە خێزانەکانی خێڵی گەلەدیدا نووست، من و عەلی لەدەرەوە - هەروەك ڕۆژانی منداڵیمان. شەو کە لەوێ پاڵکەوتبووین، هەستم بە ئارامی و خۆشییەکی تایبەت دەکرد. تەماشای ئەستێرەکانمان دەکرد و تا نیوەشەو قسەمان کرد: 'بیرت دێت، ژنە بچکۆلەکەی باوکمان هەڵواسی؟' - پاشان هەردووکمان دامانە قاقای پێکەنین.

لەسەرەتاوە عەلی شەرمی دەکرد، بەڵام دوایی شەرمی شکا، 'دەزانی، بەڕاستی بیرم دەکردی. زۆر دەمێکە ڕۆیشتووی. زۆر نامۆیە کە بیردەکەیتەوە ئێستا تۆ ژنی من

پیاو.ˎ هەستم بە خۆشی دەکرد کە دووبارە گەڕاومەتەوە لای خێزانەکەمان و بە زمانی سۆماڵی قسەوباس دەکەین و پێدەکەنین سەبارەت بە شتە ئاشناکان.

هەموو خەڵکی لادێکە بێوێنە دڵفراوان بوون بەرامبەرمان. هەر ڕۆژەی چەند ماڵ دەعوتی دەکردین بۆ نانی نیوەڕ و ئێوارە. هەموو کەسێك دەویست نازمان بکێشێت و خۆی بخاتە خزمەت ئێمەوە و گوێی لە بەسەرهاتی ئێمە بێت. ˎدەی وەرن. منداڵەکەم ببینن، نەنکم ببیننˋ - ئێمەیان دەبرد و دەیان ناساندین. وە هیچ یەك لەمانە لەبەرخاتری ئەوە نەبوو کە ˎسوپەر مانیکانمˎ، چونکو هیچ شتێکیان لەبارەی ئەمەوە نەدەزانی. من یەکێك بووم لەوان - کۆچەرییەك - و گەڕاومەتەوە ماڵەوە.

دایکم، سەلامەت بێت، چەند هەوڵی زۆرم دا بۆی باسبکەم، من کاری چی دەکەم بۆئەوەی بژیم، هەر نەیتوانی تێبگات. ˎئینجا، ئەوەی وتت چی بوو؟ مانیکان چییە؟ دروست ئەوە بە واتای چی دێت؟ˋ جارێکیان کەسێك ڕێی کەوێتبووە بیابان و ڕۆژنامەیەکی زە سەندەی تایمس، کە وێنەی من بەسەر بەرگەکەیەوە بوو، لەگەڵ خۆیدا بردبووی و پیشانی دایکمی دابوو. خەڵکی سۆماڵ زۆر شانازیان پێوە کردبوو، وە زۆریان پێخۆش بووە کە کچێکی سۆماڵی ببینن بەسەر بەرگی ڕۆژنامەیەکی ئینگلیزییەوە. دایکم تەماشای دەکات و دەڵێت، ˎئەوە واریسە! کچەکەمە!ˋ لەگەڵ خۆی هەڵیگرتبوو و پیشانی خەڵکی لادێکەی دابوو.

لەپاش یەکەم شەودوە دایکم شەرمی شکا و خێرا گوڕی دایە خۆی بۆ ئەوەی فەرمانم بەسەردا بدات: ˎچێشت وا لێنانرێت، واریس! ئێستا گوێگرە! با پیشانت بدەم. لەو شوێنەی دەژیت، چێشت لێنانێیت، وا نییە؟

پاشان براکەم کەوتە پرسیارکردن، لەبارەی ئەم و ئەوەوە دەڵێم چی. منیش کەوتمە وەڕسکردنی، ˎئۆی - عەلی، تکات لێدەکەم دەمت داخە. تۆ کەریت، کەسێکی گێلی دەوەن نشینی. تۆ لێرە زۆر ژیاوی و نازانی لەبارەی چییەوە قسە دەکەیت.ˎ

'هەر ئاوا؟ بەناوبانگ بوویت و ئینجا هاتووی و هەڵوێستی خۆبەزل زانی ڕۆژئاواییانەمان پێدەفرۆشی؟ ئێستا لە ڕۆژئاوا دەژی و هەموو شتێك دەزانی، وا نییە؟'

بۆ چەند کاژێرێك قسەوباسمان هێنا و برد. نەمدەویست هەستی بریندار بکەم، بەڵام لە دڵی خۆمدا وتم، ئەگەر من شتێکیان پێنەڵێم، کێ پێیان دەڵێت؟ 'چاکە، من هەموو شتێك نازانم، بەڵام زۆر شتم دیوە و زۆر شت فێربووم، کاتێك کە لەناو دار و دەوەندا دەژیام نەمدەزانی. هەموو دنیا هەر مانگا و حوشتر نییە. دەتوانم لەسەر شتی تریش قسەت بۆ بکەم.'

'وەك چی؟'

'باشە، شتێکی تر کە هەیە، ئێوە ژینگەتان وێران کردووە بە بڕینی درەخت. هەر نەمامێك، پێش ئەوەی نەشونما بکات، دەیبڕن و دەیکەن بە پەچە بۆ ئەو ئاژەڵە گەمژانە.' بزنێك لەو ناوە بوو، ئاماژەم پێکرد. 'ئەوە دروست نییە.'

'مەبەستت چییە؟'

'دەبینی، ئێستا هەموو وڵات بیابانە، چونکو درەختمان تیادا نەهێشتووە.'

'واریس! وڵاتەکە بیابانە، چونکو باران نابارێت. لە باکوور باران دەبارێت و درەختی زۆریان هەیە.'

'هەر لەبەرئەوەیە باران دەبارێت! باران دەبارێت، چونکو لەوێ دارستان هەیە. هەتاکو ئێوە هەموو ڕۆژێك نەمام ببڕن، بە هیچ شێوەیەك ڕێگای گەشەی دارستان نامێنێت.' نەیان دەزانی باوەڕ بەم بیرە نامۆیەی من بکەن یان نا، بەڵام بابەتێك هەبوو، لەلایان زۆر ڕۆشن بوو، کە ناتوانن ڕازیم بکەن.

ئینجا دایکم دەستی پێکرد. 'بۆچی شووت نەکردووە؟' ئەم بابەتە هێشتا برینێك بوو، پاش ئەو هەموو ساڵە سارێژ نەبووبوو. وەك دەیبینم، ئەم بابەتە زۆر کەوت لەسەر خێزانەکەمان. دەزانم باوکم مەبەستی باش بوو، بەڵام لەبەردەم دوو

ڕێیانێکی ترسناکدا دای نابووم: هەرچی وت، بیکەم و ژیانی خۆم وێران بکەم بە شووکردن بە پیاوێکی پیر، یان هەڵبێم و دەستهەلگرم لە هەرچی شتێك کە پێم خۆشە و ئاشنایە. نرخێك کە بۆ ڕزگارکردنی خۆم دام، زۆر کەوت لەسەرم. هیوادارم زۆر بۆ منداڵی خۆم نەهێنم، کە بڕیارێکی وا ئازاراوی بدات.

`دایە، بۆچی دەبێت شووبکەم؟ بۆچی دەبێت هەر ژنی یەکێکی تر بم؟ ناتەوێت ئەوە ببینی کە کەسێکی سەرکەتووی بەهێزی سەربەخۆم؟ دەمەوێت بڵێم، ئەگەر من شووم نەکردووە، تەنیا لەبەرئەوەیە هێشتا کەسێکی باشم نەدۆزیوەتەوە. کاتێك دۆزیمەوە، ئیتر کاتی خۆیەتی.`

`باشە، من کچەزام دەوێت.`

ئینجا هەموو کەوتنە ئەوەی گەلەکۆمەکێم لێبکەن. ئامۆزاکەشم هاتە ناوەوە: `ئێستا زۆر پیر بووی. کێ دەیەوێت تۆ مارە بکات؟ زۆر پیر بووی.` بەداخێکی زۆرەوە سەری بادەدا بۆ ئەو کەسەی کچێکی بیست و هەشت ساڵە دەهێنێت.

دەستم لێبەرزکردنەوە. `کێ دەیەوێت شووبکات ئەگەر ئێوە زۆری لێنەکەن؟ بۆچی ئێوە هەردووکتان ژن دەهێنن؟` ئاماژەم بە عەلی و ئامۆزاکەم کرد. `سوێند دەخۆم زۆریان لێکردوون.`

`نا، نا.`هەر دووکیان وتیان.

`دەی باشە، بەڵام تەنیا لەبەرئەوەی ئێوە کوڕن. بەڵام کچ قسەی تیادا نییە. وا پێویستە، شووبکەم بە یەکێك کە ئێوە بڕیاری لەسەر دەدەن، کاتێك کە ئێوە دەڵێن. ئەم قسە قۆڕە چییە؟ کێ ئەمەی هێناوە؟`

`دەمت داخە واریس،` براکەم بەخەفەتەوە وتی.

`تۆش دەمت داخە!`

کە دوو ڕۆژەکە تێپەڕی، جێری وتی، دەبێت دەستبکەین بە فیلم گرتن. چەند دیمەنی لە من و دایکم گرتبوو. بەڵام دایکم هەرگیز کامێرای نەبینیبوو، ڕقی لێی دەبوۆوە. دایکم وتی، 'ئەو شتە لەبەرچاوم لابەن. من ئەمەم ناوێت.' کامێرەچییەکەی دەرکرد. 'واریس - پێی بڵێ ئەو شتە لەبەرچاوم لابات.' وەڵامم دایەوە، گرفت نییە. 'ئەوە تەماشای من دەکات؟ یان تەماشای تۆ دەکات؟'

'تەماشای هەردووکمان دەکات.'

'دەی باشە، پێی بڵێ من نامەوێت تەماشای بکەم. لەوە دەچێت گوێی لێنەبێت، من دەڵێم چی. وا نییە؟' هەوڵمدا بۆی ڕۆشنکەمەوە کە ئەمە چ باسە، بەڵام دەمزانی بێهودەیە.

'بەڵێ دایە. ئەو گوێی لە هەموو شتێکە تۆ دەیڵێیت.' بە پێکەنینەوە وتم. کامێرەچییەکە بەردەوام پرسیاری دەکرد، لەبارەی چییەوە پێدەکەنین. 'بە هەموو شتێکی پێکەنیناوی...' وەڵامم دایەوە.

ستافەکە ڕۆژێکی تریش خەریکی فیلم گرتنی من بوون، کاتێك بە تەنیا پیاسەم دەکرد بەناو بیاباندا. کوڕێکی بچوکم بینی، لەسەر بیرێك ئاوی دەدا بە حوشترەکەی، داوام لێکرد، کە ئایا من دەتوانم ئاو بدەم بە حوشترەکە. بۆ ستافەکە سەتڵەکەم بەرز کردەوە بۆ دەمی حوشترەکە. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا، سەخت بوو بەر بە فرمێسکی چاوانم بگرم.

ڕۆژێك پێش ئەوەی بگەڕێینەوە، ژنێك لە لادێکەدا نینۆکی پەنجەکانمی لە خەنە گرت. دەستەکانم بۆ کامێرەکە بەرزکردەوە، کە لەوە دەچوو شیاکەی تەڕی مانگا بێت بەسەر پەنجەکانمەوە. بەڵام من هەستم دەکرد لە شاژن دەچم. ئەمە نەریتێکی جوانی کۆنی خەڵکەکەمە - کەرەسەیەکی سروشتییە بۆ بوك ڕازاندنەوە. ئەو شەوە ئاهەنگمان گێڕا، خەڵکی لادێکە هەموو سەمایان کرد، چەپڵەیان لێدا و گۆرانیان وت.

بیرم کەوتەوە، دروست وەك کاتی منداڵیم وابوو، کاتێك باران دەباری ئاهەنگمان دەگێڕا - چ هەستێکی لەبننەهاتووی خۆشی و سەرفەرازی بوو.

بۆ سبەینێ بەیانی پێش ئەوەی فڕۆکەکە بێت بۆ هەلگرتنمان، زوو هەستام و لەگەڵ دایکم نانی بەیانیمان خوارد. پرسیارم لێکرد، کە ئایا پێی خۆشە، بێت لەگەڵمدا و لە وڵاتە یەککگرتووەکان یان لە بەریتانیا پێکەوە بژین.

"بەڵام من چی بکەم لەوێ؟" وتی.

"منیش هەر ئەوەم دەوێت. من نامەوێت هیچ شتێك بکەیت. ئیتر بەسە بەشی خۆتت کردووە. کاتی ئەوەت هاتووە دانیشیت - قاچت بخەیتە ژێر خۆت. ئەمەوێت دەستت بەسەردا بهێنم."

"نا. ئەوە ناتوانم بکەم. لەپێش هەموو شتێکدا، باوکت بەرەو تەمەنی پیری دەڕوات. پێویستی بە من دەبێت. پێویستە لەگەڵی بم. دووەم، دەبێت چاودێری منداڵان بم."

"مەبەستت لە منداڵان چییە؟ هەمووومان گەورە بووین!"

"باشە، منداڵەکانی باوکت. بیرت نایەتەوە ناوی چی بوو، ئەو ژنە بچکۆلەیەی کە هێنای؟"

"بـــا."

"چاکە، پێنج منداڵی بوو. بەڵام نەیتوانی لەوە زیاتر بیکێشێت. لەو باوەڕەدام ژیانی ئێمە زۆر سەخت بوو بۆ ئەو یان باوکی تۆ لە توانای ئەودا نەبوو. هەرچی چۆنێك بوو، هەڵهات - دیارنەما."

"دایکە ... چۆن دەوێری. تۆ لەو تەمەنەدا نییت، کە توانای کارێکی وات هەبێت! نەدەبوو دەست بدەیتە کارێکی وا سەخت - لەو تەمەنەدا ڕاکەڕاکەت بێت بەدوای منداڵاندا."

'باشە، هەروەها باوکت پیر دەبێت و پێویستی بە من دەبێت. سەرەڕای ئەوە، من ناتوانم هەر دانیشم. ئەگەر دانیشم، پیر دەبم. ناتوانم هەروا دانیشم پاش ئەو هەموو ساڵە - ئەوە شێتم دەکات. دەبێت بەردەوام بجولێم. نا. ئەگەر دەتەوێت شتێکم بۆ بکەیت، خانوویەکم لە ئەفریقا، لە سۆماڵ، بۆ پەیدا بکە، بۆ ئەوەی کاتێك پیربووم بچمە ناوی. ئەوەماڵی منە. تەنانەت ئەوەی دەیزانم هەر ئەوەیە.'

باوەشم کرد بە دایکمدا. 'تۆم خۆشدەوێت، دایە، من دەگەڕێمەوە بۆ لات، ئەوەت لە بیر نەچێت. من دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ...'

زەردەخەنە گرتی و دەستی بەرزکردەوە ماڵئاوایی لێکردم.

هەرکە چووینە ناو فڕۆکەکەوە، پەلوپۆم شکا. نەمدەزانی کەی یان هەرگیز دایکم دەبینمەوە. کاتێك بە گریانەوە لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد، چاوم لە لادێکە بڕیبوو، پاشان کە بەسەر بیابانەکەدا تێدەپەڕین، کامێرەچییەکە لە نزیکەوە فیلمی لێدەگرتم.

1.carnival.
2.The Day That Changed My Life.
3.Soul Train.

## بەشی شانزدەمین
## سێوێکی گەورە

لە بەهاری ساڵی 1995دا، لەگەڵ بی بی سیدا فیلمە دیکومێنتیەکەمان تەواو کرد، کە ناونیشانەکەی بوو بە کۆچەرییەك لە نیویورك. وە لە ڕاستیدا لەپاش ئەو هەموو ساڵانە هەر وابوو، چونکو هێشتا ماڵێکی خۆمم نەبوو. لەم شوێنەوە دەچووم بۆ ئەو شوێن بەدوای کاردا: لە نیویورك، لەندەن، پاریس، میلان. لەماڵی هاوڕێکانم یان لە هوتێل دەمامەوە. ئەو شتانەی کە هەمبوو - هەندێك وێنە، چەند کتێب و سی دییەك لای نیگل لە والس لە شوێنێکدا قایمم کردبوو. لەبەرئەوەی زۆربەی کارەکانم لە نیویورك بوو، زۆربەی کات لەوێ بووم تا لە شوێنێکی تر. لەڕاستیدا بۆ ماوەیەك شوقەیەکم بەکرێ گرت ستۆدیۆ لە سۆهۆ. پاشان جێگایەك لە ڤیلیج، دوایی خانوویەك لە بۆردوەیی. بەڵام هیچ یەك لەم شوێنانەم بەدڵ نەبوو. خانووەکەی بۆردوەیی تەواو دەردیسەر بوو، خەریك بوو شێتی دەکردم. هەرکاتێك ئوتومبیلێك بەو ناوەدا تێپەڕبوایە، وا دەهاتە گوێم کە بەناو ماڵەکەدا دەڕوات. بنکەی ئاگرکوژانەوەیەك لە سەری سووچەکەدا بوو، شەو تا بەیانی گوێم لە شاورەکەی بوو. نەمدەتوانی تەواو وچانی تیادا بدەم و پاش دە مانگ کۆڵم دا و بوومەوە بە کۆچەری.

لەو پایزەدا نمایشێکم کرد لە پاریس، پاشان بڕیارمدا دەست لە نمایشکردن هەڵگرم لە لەندەن و یەکسەر گەڕامەوە بۆ نیویورك. هەستم کرد کاتی ئەوە هاتووە جێگایەکی خۆمم هەبێت و بۆ ماوەیەك نیشتەجێ ببم. کەوتمە گەڕان بەدوای خانوودا و هاوکات لەلای هاوڕێی هەرە نزیکەکەم جۆرج لە ڤیلیج مامەوە. کاتێك لەوێ بووم، شەوێکیان هاوڕێیەکی جۆرج بەناوی لوسی، ڕۆژی لەدایکبوونی بوو. دەیویست بچێتە دەرێ بۆ ناو شار بۆ بردنەسەری کاتێکی خۆش، بەڵام جۆرج وتی

كە زۆر هیلاكە و بەیانی زوو دەبێت بچێتە سەركار. من ئامادەیی خۆمم دەربڕی كە لەگەڵیدا بچمە دەرەوە.

لە ماڵ چووینە دەرەوە، بەبێ ئەوەی هیچ شوێنێكمان لە خەیاڵدا بێت بۆی بچین. لە ئەیس ئاڤێنیو وەستام و ئاماژەم بۆ كۆنە ئەپارتمانەكەم كرد، ' لەوسەرەوە ژیاوم، لەسەرو ئەو بارەوە. هەمیشە موسیقایەكی جازی خۆشیان لێدەدا، بەلام هەرگیز نەچوومەتە ژوورەوە.' كاتێك كە لەوێدا وەستاین، گوێم لە دەنگی مۆزیك بوو لێدەدرا. 'دەی وەرە. با بچینە ژوورەوە. تۆش پێتخۆشە؟'

' نا، دەمەوێت بچم بۆ نێل.'

'دەی دەوەرە. با بچینە ژوورەوە، تەنیا تەماشایەك دەكەین. بەڕاستی حەزم لەو مۆزیكەیە كە لێی دەدەن - ئارەزوی سەماكردنم هەیە.'

بە نابەدڵییەوە لوسی ڕازی بوو بێتە ژوورەوە. بە قادرمەكاندا چووینە خوارەوە بۆ ناو بارەكە، كە ژوورێكی بچوك بوو لەگەڵ تیپێكی مۆسیقی لە پشتەوە. چوومە بەردەمی تیپەكە و ڕاوەستام. یەكەم كەس كە بینیم تەپڵژەنەكە بوو، ڕووناكییەكە بەسەر ئەوەوە بوو، هاوكات تەواوی ژوورەكە تاریك بوو. تەپڵی لێدەدا، منیش هەروا ڕاوەستابووم لێی ورد دەبوومەوە. قژێكی لوولی ئەفریقی پڕی هەبوو، كە لە حەفتاكاندا باوبوو. كاتێك لوسی قۆڵی گرتم، ئاوڕم لێدایەوە و وتم: 'نا، نا، نا. دەمێنینەوە. دانیشە، ساردییەك بهێنە. تۆزێك دەمێنینەوە.' بەڕاستی تیپەكە سەرنجڕاكێش بوو، وەك شێت دەستم كرد بە سەماكردن. لوسی هاتەناوەوە و ئینجا هەموو ئەو خەڵكەی، كە هیلاك دانیشتبوون و تەماشایان دەكرد، هەستان و لەگەڵ ئێمە دەستیان كرد بە سەماكردن.

گەرما و تینو بووم، چووم ساردییەكم هێنا و لەناو خەڵكەكەدا، لە تەنیشت ژنێكەوە دانیشتم. پێم وت، 'مۆزیكێكی خۆشە. باشە، ئەمانە كێن؟'

ژنەکە وتی، 'نازانم چونکو هەموو فریلانسن[1]، بەڵام هاوسەرەکەی من ئەوەیە کە ساکسۆفۆن لێدەدات.'

'دەی باشە. ئەی ئەوەی کە تەپڵەکە لێدەدات؟'

بەئاستەم زەردەخەنەیەك گرتی. 'بەداخەوە، نازانم.' لەچەند خولەکێکدا تیپەکە وچانێکی دا و کاتێك تەپڵژەنەکە بەلامانـدا تێپـەڕی، ئـەم خانمـە قـۆڵی گـرت و پێـی وت، 'ببورە، هاوڕێکەم حەزدەکات قسەت لەگەڵدا بکات.'

'باشە، کێیە؟'

'ئـەو' - ئەمـەی وت و پـاڵی پێوەنـام بـۆ پێـشەوە. دەسـتوپێی خـۆمم ونکـرد، نەمدەزانی چی بڵێم.

لەکۆتاییـدا، پـاش چـەند سـاتێك ڕەق وەسـتاندن، 'سـڵاو.' *واریـس لەسـەرخۆ بـە،* 'مۆزیکەکەم پێخۆشە.'

'سوپاس.'

'ناوت چییە؟'

'دانا،' وەڵامیدایەوە، زۆر شەرمن دیار بوو.

'ئۆی.' ڕووی وەرگێڕا و لێیدا ڕۆیشت.

نایی! بەڵام ڕێگام نەدا، هەروا سوك و ئاسان لـە دەسـتم دەربـچێت. دوایکـەوتم بـۆ ئـەو شـوێنەی کـە لەگـەڵ هاوکارەکـانی تیپەکـەی دانیـشتبوو، کورسـییەکەم هێنـا و لەتەنیشتیدا دانیشتم. کە تەپڵژەنەکە لایکردەوە و منی بینی، ویـستی بـڕوات. چووم بـە گژیـدا، 'مـن نـەبووم قـسەم لەگـەڵ تـۆدا کـرد. ئـەوە بێڕێزییـە. هـەروا لێمـان دووردەکەویتەوە، دەزانی؟' دانا بە شڵەژاوییەوە تەماشایەکی کـردم و پاشـان بەسـەر مێزەکەدا دایە قاقای پێکەنین.

'ناوت چییە؟' دانا وتی، کاتێك هاتەوە سەر خۆی.

'من ئەوەم بۆ گرنگ نییە،' بە فیزێکەوە وەڵامم دایەوە، لووتم لە ئاسمان کردبوو. بەڵام پاشان دەستمان کرد بە قسەکردن لە سەر هەموو شتێك تا وتی، کە دەبێت بچێت بەلای کاری خۆیەوە.

'دەڕۆی تۆ؟ لێرە کێت لەگەڵ دایە؟' پرسیاری کرد.

'هاوڕێیەکم. لێرە، لەناو خەڵکەکە دایە لەوسەر.' لە وچانێکی دواتردا وتی، کە تەنیا چەند ئاوازیان ماوە، ئەگەر من بمەوێت، پاش تەواوبوونی مۆزیکەکە، دەتوانین بچین بۆ شوێنێك. کاتێك کە گەڕایەوە، پێکەوە دانیشتین و هەرچی هەبوو نەبووبوو باسمان کرد. لە کۆتاییدا وتم، 'ئێرە زۆر دووکەڵە. ناتوانم هەناسە بدەم. حەزدەکەیت بچینە دەرەوە؟'

'چاکە. دەتوانین بچینە دەرەوە و لەسەر قادرمەکان دانیشین.' کە گەیشتینە دوا پلەی قادرمەکە، دانا وەستا و وتی، 'دەتوانم پرسیاری شتێکت لێبکەم؟ دەتوانم لە ئامێزت بگرم؟'

تەماشایەکم کرد وەك ئەوەی ئاساییترین داوای لێکردبم، وەك ئەوەی لەوەتەی هەیە دەیناسم. لەبەرئەوە توند لە ئامێزم گرت و زانیم ئەمە لە من ڕوویدا. دروست وەك ئەوەی چۆن دەزانم بچم بۆ لەندەن و چی دەزانم لەبارەی مۆدێلەوە. زانیم ئەو تەپڵژەنە قژ ئەفریقیە لوولە هاوسەری منە. شەو زۆر درەنگ بوو، کاتی ئەوە نەمابوو فریای شوێنێکی تر بکەوین. بەڵام پێم وت بۆ سبەینێ تەلەفونم بۆ بکات و ژمارەی تەلەفونی جۆرجم دایە. 'بەیانییەکەی هەندێك دانیشتنم هەیە، بەڵام تۆ دروست کاتژمێری سێ تەلەفونم بۆ بکە. باشە؟' دەمویست بزانم ئەوەی من پێی دەڵێم، دەیکات.

دوایی پێی وتم، کە ئەو شەوە لەسەر ڕێگای گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە، چووە سواری میترۆ بووە بەرەو باکووری شار لە هارلم. کە چۆتە ناو ئیستگاکەوە، وێنەیەکی

گەورەی دەموچاوی منی بینیوە و لێی وردبۆتەوە. هەرگیز لەوەوپێش ئەمە سەرنجی ڕانەکێشا بوو، وە هیچی نەزانیبوو، لەبارەی ئەوەوە کە من مانیکانم.

بۆ ڕۆژی دوایی، کاتژمێر سێ و بیست تەلەفون لێیدا. تەلەفونەکەم هەڵگرت. 'دواکەوتووی.'

'بەداخم. دەتەوێت یەکتری ببینین بۆ نانخواردنی ئێوارە.' لە کافێتێرییایەکی بچوك لە ڤیلیج یەکتریمان بینی و دیسانەوە دەستمان کردەوە بە قسەکردن. ئێستا ئیتر دەمناسی، تێگەیشتم ناحەزییەکەی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە کەسێکی نائاسایی بێدەنگە لەگەڵ هەر کەسێك کە نەیناسێت. لە کۆتاییدا دەستم کرد بە پێکەنین. دانا بەسەرسامییەوە تەماشای کردم.

'بەچی پێدەکەنی؟'

'ئەگەر بزانی، دەکەویتە ئەو باوەڕەوە کە شێتم.'

'برۆ بە ڕێگای خۆتەوە. هەر ئێستا لەو باوەڕەدام شێتی.'

'من لە تۆ منداڵم دەبێت.' لەوە دەچوو پێی ناخۆش بێت، بیهێنێتە بەرچاوی خۆی ببێت بە باوکی منداڵی من. چاوی تێبڕیم و وەك ئەوەی بڵێت، *بەڕاستی ئەم ژنە شێتە، ئەمە تەنیا هەر ئەوە نییە، سڵاو، با بیکەین بە ئاهەنگ.* 'دەزانم لەو باوەڕەدای ئەوە شتێکی نامۆیە، بەڵام تەنیا ویستم پێت بڵێم. هەرچی چۆنێك بێت، گوێ مەدەرێ. لەبیر خۆتی بەرەوە.'

لە شوێنی خۆی بێدەنگ لە من ورد دەبۆوە، دەمبینی شۆك گرتبووی. جێگای پرسیار نەبوو. هەتا من ناوی دووەمی ئەوم نەدەزانی. دوایی بۆی باسکردم، کە لە دڵی خۆیدا وتبووی، ئیتر نامەوێت دووبارە بیبینمەوە. دەبێت خۆم لەدەست ئەم ژنە ڕزگار بکەم. *لە ڕاوکەرە شێتەکەی* فیلمی فەتال ئاتراکشەن[2] *دەچێت.*

پاش نانخواردنی ئێوارە دانا منی گەیاندە ماڵەوە، بەڵام زۆر بێدەنگ بوو. بۆ ڕۆژی دوایی، شەرم دایگرتم. نەمدەتوانی باوەڕ بکەم، کە شتی تەواو نابەجێم وتووە. بەڵام

لەو کاتەدا، لەوەدەچوو زۆر شتێکی ئاسایی بێت بیڵێیت، وەك ئەوەی بڵێی، 'ئۆی، ئیمڕۆ باران دەبارێت.' جێگای سەرسامی نەبوو، تا هەفتەیەك هیچ هەواڵێك لە دانا نەبوو. لە کۆتاییدا کۆڵمدا و تەلەفونم بۆ کرد. 'ئەوە لە کوێی؟' دانا پرسیاری کرد.

'لە ماڵی هاوڕێکەمم. دەتەوێت یەکتری ببینین؟'

'بەڵێ. زۆر چاکە. دەتوانین پێکەوە بچین بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ.'

'تۆم خۆشدەوێ.'

'منیش تۆم خۆشدەوێ.' کاتێك تەلەفونەکەم دانایەوە، ترس دایگرتبووم لەوەی چیم بەو پیاوە وتووە، پاش ئەوەی کە سوێندم خواردبوو ڕێکوپێك بم. ئیتر لەوە زیاتر قسە لەسەر منداڵ ناکەم هیچ یەکێك لەوانە و هەر لەئێستاوە بچم و پێی بڵێم تۆم خۆشدەوێت. *ئۆی واریس، ئەوە چیت لێقەوماوە؟* هەر کاتێك پیاوێك حەزی لێکردبم، ڕام کردووە، خۆم شاردۆتەوە. کەچی ئێستا کەوتومەتە ڕاوکردنی ئەو پیاوە، کە بە ئاستەم دەیناسم. ئەو شەوەی دانام بینی، بلوزێکی سەوزم لەبەرکردبوو، قژیشم بەشێوەیەکی ئەفریقی چاککردبوو. دوایی دانا بۆی گێڕامەوە، کە ئەو شەوە دنیا لەبەرچاوی سەوزی کردۆتەوە، هەموو ئەوەی بینیویەتی بلوزێکی سەوز، قژێکی ئەفریقی بووە. بۆم باسکرد، کە ئەگەر من شتێك بخوازم دەچم بە دوایدا و لەبەر چەند هۆیەك - بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا - زۆر حەزم کردووە پیاوم هەبێت. شتێك کە ناتوانم باسی بکەم، بۆچی وام هەست دەکرد، لەوەتەی چاوم کردۆتەوە دانا دەناسم.

من و دانا دووبارە لەسەر مێزی نانخواردنی نیوەڕۆ یەکتریمان بینییەوە و دەستمان کردەوە بە قسەکردن لەبارەی هەرچی شتێك کە لە جیهاندا هەبوو. دوو هەفتە دواتر چوومە لای لە هارلێم و پێکەوە ژیاین. پاش شەش مانگ بڕیارماندا زەماوەند بکەین.

پاش ئەوەی نزیکی ساڵێك پێکەوە بووین، ڕۆژێك دانا بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو وتی، 'لەو باوەڕەدام دوگیانیت.' هاوارم لێهەڵسا، 'دانا ئەوە دەڵێی چی!'

'وەرە با بچین بۆ دەرمانخانە.' نارازیبووم، بەڵام ئەو کۆڵی نەدا. چووین بۆ دەرمانخانە و شتێکمان کڕی بۆ پشکنینی سکپڕی لە ماڵەوە. پشکنینەکە پۆزەتیف دەرچوو.

'ئینجا تۆ باوەڕ بەم شتە قۆڕە دەکەیت؟' پرسیارم لێکرد و ئاماژەم بە پاکەتەکەی کرد.

پاکەتەکەی هەلگرت و دانەیەکی تری لێدەرهێنا. 'جارێکی تر بیکەرەوە.' ئەمەش هەروا دەرچوو. هەستم دەکرد نەخۆشم، بەڵام هەمیشە کە سوڕی مانگانەم دەستی پێکردووە، ئەم هەستەم هەبووە. بەڵام ئەم جارەیان جیاواز بوو. هەستم دەکرد خراپترم لە جاران، هەتا ئازارم زیاتر بوو. بەڵام هەر لەو باوەڕەدا نەبووم دوگیانم. هەستم کرد ناجۆرییەکم تیادایە - لەو باوەڕەدا بووم دەمرم. چووم بۆ لای دکتۆر و باری تەندروستی خۆمم بۆ باسکرد. ئەزمایشی خوێنیان بۆ کردم و سێ ڕۆژ بە ئازارەوە تلامەوە تا دکتۆرەکە شتێکم پێبڵێت. *ئاخۆ ئەمە چی بێت؟ دەبێت نەخۆشییەکی خراپم گرتبێت و دکتۆر زۆر لە خۆی دەکات تا پێم نەڵێت؟*

لەکۆتاییدا، پاش نیوەڕۆیەکیان هاتمە ماڵەوە و دانا پێی وتم، 'ئا. دکتۆرەکە تەلەفونی کرد.'

دەستم بە قوڕگی خۆمەوە گرت. 'نێ، چی وت؟'

'وتی قسە لەگەڵ واریس دەکەم.'

'ئەی هیچ پرسیارت لێنەکرد؟'

'سەیرکە، دکتۆرەکە وتی، سبەینێ نزیك یانزە یان دوانزە تەلەفونت بۆ دەکات.'

ئەو شەوە درێژترین شەوی ژیانم بوو، لە جێگادا کەوتبووم، هەر لە خەیاڵی ئەوەدا بووم چارەنووسم چی دەبێت. بۆ سبەینێ کە تەلەفونەکە لێی دا، پەلامارم دا. دکتۆرەکە وتی، 'هەواڵێکم پێیە بۆت. تۆ تەنیا نییت.' *دەیبینی - ئەوەتا! هەر خۆت نییت - هەموو لەشت گرێیە!*

'ئۆی، نا. مەبەستت لەوە چییە؟'

'سکت هەیە. سکت دوو مانگە.' هەر کە ئەو وشانەم بیست، بالم لێپەیدا بوو، فڕیم بەسەر مانگدا. داناش زۆری پێخۆش بوو، چونکو هەردەم بە هیوای ئەوە بووە ببێت بە باوك. یەکسەر هەردووکمان بۆی چووین کە منداڵەکە کوڕە.بەڵام یەکەم نیگەرانی من، تەندروستی منداڵەکە بوو. هەرکە زانیم سکم هەیە، خێرا هەردووکمان چووین بۆ لای دکتۆری منداڵان. کە دکتۆرەکە تەماشای سکەکەی کردم، ئاگادارم کردەوە کە پێم نەڵێت سکەکەم کوڕە یان کچە.

'تکات لێدەکەم، بەس پێم بڵێ، منداڵەکەم تەندروستی چۆنە؟'

دکتۆرەکە وتی، 'تەندروستی باشە، زۆر تەواوە.' ئەوە ئەو وشانە بوو، کە دەمویست گوێبیستیان ببم.

بێگومان ڕێگرییەك هەبوو لەبەردەم شووکردنی بەختەوەرانەم لەگەڵ دانادا، ئەویش نیگل بوو. کاتێك سکم چوار مانگ بوو، بڕیارمان دا پێکەوە بچین بۆ والس بۆ دوا گفتوگۆ لەگەڵ نیگل بۆ هەتا هەتایە. کە گەیشتینە لەندەن ئەو لەشبیمارییەی بەیانیانم مابوو لەگەڵ ئەوەشدا تووشی سەرمایەکی خراپ بووبووم. لە ماڵی هاوڕێیەکمان ماینەوە و پاش چەند ڕۆژ کە کەمێك بوژامەوە، هێزم دایە خۆم و تەلەفونێکم بۆ نیگل کرد. بەڵام کە قسەم لەگەڵدا کرد، وتی منیش سەرمام بووە، سەردانەکەمم دواخست.

من و دانا زیاتر لە هەفتەیەك لە لەندەنماینەوە پێش ئەوەی نیگل ئامادەیی سەردانی ئێمەی هەبێت. تەلەفونم بۆ کرد و کاتی هاتنی شەمەندەفەرەکەم دایە تا بێت لە ئیستگا هەڵمان گرێت، وە پێم وت، 'حەزیش دەکەم بزانیت کە دانا لەگەڵمدا دێت. وە نامەوێت هیچ کێشەیەك بنێیتەوە، باشە؟'

'من نامەوێت چارەی ببینم. ئێستا ئەمەت پێدەڵێم. ئەوە شتێکە لە بەینی من و تۆدا.'

'نیگل ـ'

'بۆم گرنگ نییە. بۆم گرنگ نییە. هیچ شتێکم لەگەڵ ئەو نییە.'

'ئێستا زۆر شتت لەگەڵ ئەو هەیە. ئەو دەزگیرانی منە. کەسێکە من شووی پێدەکەم. تێگەیشتی؟ هەرچی شتێك بکەم لێرە، ئەویش لەگەڵمدا دەیکات.'

'نامەوێت بیبینم، هەر ئەوە قسەمە.' ئیتر نیگل لە خەیاڵی خۆیدا وای دانابوو، کە شەمەندەفەر دەگرم و بەتەنیا دەچم بۆ والس. کە دابەزین، نیگل چاوەڕوانی دەکرد، پاڵی دابوو بە کۆڵەکەیەکەوە لە پارکێکدا، هەروەك ئاسایی جگەرەی دەکێشا. چرچاوی خراپتر دیار بوو لە دواجار کە بینیبووم. ئەم جارە قژێکی درێژتری هەبوو، هەروەها ژێر چاوانی ڕەش هەڵگەڕابوون.

سەیری دانام کرد و وتم، 'چاکە، ئەوەتا. لەسەرخۆبە.'

چووین بۆ لای و پێش ئەوەی بتوانم وشەیەك لە دەمم بێتە دەرەوە، نیگل وتی، 'پێم وتی، من نامەوێت بیبینم. ئەوەم پێوتی. زۆر ڕۆشن بوو. زۆر بەڕۆشنی پێم وتی. دەمەوێت بە تەنیا بتبینم.'

دانا لەسەر جادەکە جانتاکانی دانا. 'سەیرکە، بەو شێوەیە نابێت وا قسەی لەگەڵدا بکەیت و نابێت لەگەڵ منیشدا بەو شێوەیە قسە بکەیت. بۆچی دەتەوێت بە تەنیا بیبینیت؟ ئەمە چی تیادایە؟ دەتەوێت بە تەنیا بیبینیت؟ چاکە، من نامەوێت

بە تەنیا ببینیت. وە ئەگەر جارێکی تر بیڵێیتەوە، یەك شەق لە قنگە حیزەکەت هەڵدەدەم!'

نیگل زیاتر ڕەنگی هەڵگەڕا. 'چاکە ... لە ئوتومبیلەکەمدا جێگامان نابێتەوە.'

'من هیچم لەگەڵ ئوتومبیلەکەی تۆ نییە. دەتوانین تەکسییەك بگرین. تەنیا با ئەم شتە کۆتایی پێبێت.'

نیگل خێرا بۆ لای ئوتومبیلەکەی چوو، ئاوڕی دایەوە و وتی، 'نا، نا، نا. من بەو شێوەیە هیچ شتێك ناکەم.' هەڵیکوتایە ناو ئوتومبیلەکەی و مەکینەکەی خستەکار و بە لای من و دانادا کە لە تەنیشت جانتاکانماندا وەستابووین، فڕکەی کرد. پێمان باشبوو بچینە هوتێل. خۆشبەختانە، ژوور - و - نانخواردنی بەیانیمان لە تەنیشت ئیستگاکە دەستکەوت. شوێنێکی دڵتەنگ بوو، بەڵام لەو هەلومەرجەدا، ئەوە دوا شت بوو کە نیگەرانمان بکات. چووینە دەرەوە بۆ ڕێستورانێکی هندی، بەڵام زۆر پەرۆشی خواردنەکە نەبووین، زیاتر دانیشتین و بێزەوقانە لە خواردنەکە ورد دەبووینەوە، تا بڕیارمان دا بگەڕێینەوە ژوورەکەمان.

بۆ سبەینێ بەیانی دووبارە تەلەفونم کردەوە بۆ نیگل. 'تەنیا دەمەوێت شتەکانی خۆم بەرم. باشە؟ ئەگەر ناتەوێت لەسەر ئەمە ڕێکەوین، ئەوا لەبیر خۆتی بەرەوە. تەنیا شتەکانی خۆمم بەرەوە.' بەئەنجام نەگەیشتین. ئیتر دەبوو من و دانا هوتێلەکەمان بگۆڕین، چونکو ئەو ژوور - و - نانخواردنی بەیانییە، کە شەو لێی مابووینەوە، گیرابوو، باشتر بوو بچینە جێگایەکی خۆشتر. چونکو نەمان دەزانی، ئەم بەزمە لەگەڵ نیگل کەی کۆتایی دێت. شوێنێکی ترمان دۆزییەوە و پاش ئەوەی چووینە ناوی، دووبارە تەلەفونم کردەوە. 'سەیرکە، بۆچی ئەوەندە بێمێشکیت؟ بۆچی ئەمە دەکەیت؟ چەند ساڵ ئەمە دەبێت بەردەوام بێت؟ حەوت؟ هەشت؟ دەی ئێستا چی.'

'باشە. دەتەوێت من ببینی، زۆر چاکە. بەڵام تەنیا تۆ. دێم و لە هوتێلەکە هەڵت دەگرم، بەڵام ئەگەر ئەو بێتە دەردوە، ئاگاداربە، کە یەکسەر دەڕۆم. نا. تەنیا تۆ.' هەناسەیەکم هەڵکێشا، بەڵام چونکو ڕێگا چارەیەکی ترم بۆ ئەم کێشەیە نەدەبینییەوە وتم باشە.

تەلەفونەکەم دانایەوە و کێشەکەم بۆ دانا ڕۆشنکردەوە. 'تکات لێدەکەم دانا. ڕێگام بدە با بەتەنیا بچم بۆلای و بزانم دەتوانم قسەی لەگەڵدا بکەم. بەس ڕێگای ئەمەم بدە.'

'زۆر باشە. ئەگەر تۆ لەو باوەڕەدای ئەمە سەردەگرێ. بەڵام ئەگەر دەستت بۆ بەرێت، دەبێت بزانێت. ئێستا من بە تۆ دەڵێم، حەزم لە چارەی پیسێکی وا نییە.' بە دانام وت، هەر لەوناوە لە هوتێا[illegible]بێتەوە و ئەگەر پێویست بوو، تەلەفونی بۆ دەکەم.

نیگل منی هەلگرت و چووین بۆ [illegible]ڕیەکی هاوینە، کە بە کرێی گرتبوو. پێم وت، 'گوێگرە نیگل. من شوو بەو پیاوە دەکەم، لەویش سکم هەیە. لە دنیای خەیاڵاتی بچوکی خۆتەوە، کە من ژنە خۆشەویستەکەی تۆم و پێکەوە ژیاوین، وەرە دەردوە و بەزمی زیاتر مەنێرەوە. ئیتر بەسە. باشە؟ تێدەگەیت؟ دەی با بچینە سەر ئەمە، ئێستا دەمەوێت تەڵاقم بدەیت، هەر ئەم هەفتەیە. وە من ناگەڕێمەوە بۆ نیویورك تا ئەم شتە پوچە کۆتایی نەیەت.'

'چاکە، پێش هەموو شتێك من تۆ تەڵاق نادەم تا هەموو ئەو قەرزانەی لاتە بۆمی نەگەڕێنیتەوە.'

'ئاوا، پارەی تۆ لای منە؟ چەندە؟ کێ کاری کرد و پارەی دا بە تۆ بۆ چەندەها ساڵ تا ئێستاش؟'

'هەمووی ئەوە، دەچوو بۆ خواردنێك کە دە[illegible]د.'

'ئاوا، تێدەگەم. هەتا ئەو کاتەی کە لێرە نەبووم. چاکە، مادام خولیای ئەو پارەیە کەوتۆتە سەرتەوە، چەند دەکات؟'

'بەلایەنی کەمەوە چل هەزار پاوەند.'

'ئۆی!! بچم بۆ کوێ ئەو پارەیە بهێنم؟ من ئەوەندەم نییە.'

'بۆم گرنگ نییە. بۆم گرنگ نییە. بۆم گرنگ نییە. مەبەستم ئەوەیە، هەر ئەوەندەیە. تۆ قەرزاری منی و من هیچ شتێکی ترم ناوێت و من تۆ تەڵاق نادەم یان هەرچی شتێکی تر. تۆ لەدەست من ڕزگارت نابێت تا ئەو پارەیەی کە پێم داوی، بۆم دەگەڕێنیتەوە. بەهۆی تۆوە خانووەکەی خۆمم فرۆشت.'

'تۆ خانووەکەت فرۆشت، چونکە لە پاش من نەتتوانی قیستەکەی بدەیتەوە و من یەکم کەوت ئەوەندەم دایەوە. هەموو ئەوەی دەبوو بیکەیت، کارێك بۆ خۆت بدۆزیتەوە، بەڵام تۆ هەتا ئەوەشت نەکرد.'

'چی؟ کاری چی؟ من بچم چی بکەم - کار لە ماکدۆنالد؟'

'ئەگەر بەو کارە بتوانی قیستەکەی پێبدەیتەوە، بۆچی نا؟'

'ئەو کارە، پیشەی من نییە.'

'باشە تۆ چ کارێك بە باشی دەزانیت؟'

'من ژینگە پارێزم.'

'نا، وایە. کارم بۆ دۆزیتەوە، دەریان کردی و پێیان وتی، نەگەڕێیتەوە بەم ناوەدا. لە خۆت نەبێت گلەیی لە کەس مەکە. ئەم شتە قۆڕە من ڕازی ناکات. فلسێك چییە ناتدەمێ. دەزانی چی؟ دەتوانی پاسپۆرتە هیچەکەت بەریت و بیبڕیتە قنگت. ڕۆشنە ئیتر قسەکردن لەگەڵ تۆ کەڵکی نییە. هاوسەریەتی ئێمە هەرگیز ڕاستەقینە نەبووە، چونکو هەرگیز هاوڕێی گیانی بە گیانی یەك تر نەبووین.'

"ئەوە ڕاست نییە، ئێستاش ڕاست نییە. ئێستاش لە ڕووی یاساییەوە وا نییە. تۆ شووتکردووە بە من و هەرگیز لە دەستی من ڕزگارت نابێت، واریس. منداڵەکەت زۆڵ دەردەچێت بۆ هەموو ژیانی."

لە شوێنی خۆمەوە هەروا لێی ورد دەبوومەوە و بیرم دەکردەوە، هیچ دڵۆڤانییەك هەیە بووبێت بە ڕقێکی وا. ناتەباییەکی ترسناکم لە هەلومەرجەکەدا دەبینی. بڕیارم دا شووی پێبکەم، کاتێك کە ئەو پێی خۆش بوو یارمەتیم بدات "چونکو ویستی خوا بوو." بە هۆی ئەوەی خوشکەکەی هاوڕێیەکی باشی من بوو، هەستم دەکرد هەر کێشەیەکمان بۆ بێتەپێشەوە، ئەو بکەوێتە بەینمانەوە. بەڵام ئەو لەم ناوە نەبوو.

"نیگل، من تەڵاقی خۆم وەردەگرم، تۆ ڕازی بیت یان ناڕازی. ئێمە هیچ شتێکی ترمان نییە قسەی لەسەر بکەین."

بۆ خولەکێك بە سامەوە تەماشای کردم، پاشان بە هێواشی وتی، "چاکە، ئەگەر من تۆم نەبێت، بە واتای ئەوە دێت هیچم نییە. لەپێشدا تۆ دەکوژم، ئینجا خۆم."

لە جێگای خۆم وشکبووم، بەدوای شتێکدا گەڕام بیکەم، پاشان کەوتمە بلۆف لێدان. "دانا بە شوێنمدا دێت بۆ ئێرە، ئەگەر من بم لەجیاتی تۆ هیچ شتێك ناکەم." دەمزانی دەبێت یەکسەر لەم ناوە دەرچم، چونکو خەریك بوو کارلەکار دەترازا. بۆ جانتاکەم دانەویمەوە لە زەوییەکە هەڵیگرم، لەدواوە پاڵێکی پێوە نام. سەرەتا دەموچاوم دای بە دەستگای سترێۆکەدا، پاشان سووڕم خوارد بەسەر پشتدا کەوتمە سەر زەوییە تەختە ڕەقەکە. لەشوێنی خۆمدا پاڵکەوتم، ترسام بجوڵێم. ئەی هاوار منداڵەکەم! ترسی ئەوەی ئازاری منداڵەکەمم دابێت، گۆج بووم. بەهێواشی هەستامە سەرپێ.

"ئاخ، سەلامەتی؟" نیگل هاواری کرد.

'ئا، باشم،' بەئارامی وتم. ئێستا ئیتر زانیم چەند کەرم، کە بەتەنیا هاتووم بۆ ئێرە و دەمەوێت بە ساغی دەربچم. 'باشم، هیچم نییە.' یارمەتی دام هەستم. خۆم وا پیشاندا کە ئاساییم، چاکەتەکمم لەبەرکرد.

'من دەتگەیەنم. سواری ئوتومبیلە حیزەکە بە.' دووبارە تورە بۆوە. کاتێك بە ڕێگاوە بووین، لە دڵی خۆمدا وتم: *زۆر قینی لەم کۆرپەیەیە و هیچ شتێك لەوە زیاتر دڵخۆشتری ناکات لەوەی بە مردویی ببینێت. تۆ بڵێی هەوڵ بدات لە کەندەڵانێکدا وەرمان گەڕێنێ؟* پشتێنی کورسییەکەمم بەست. هاواری دەکرد، جنێوی دەدا و هەرچی ناو ناتۆرەیەك کە دەیزانی، پێیدام، بەڵام من لە شوێنی خۆم بێدەنگ ڕێك تەماشای پێشی خۆمم دەکرد، دەترسام شتێك بڵێم و لێم بدات. ئیتر لەو کاتەدا مت بووبووم، خۆمم بۆ گرنگ نەبوو، تەواو پەرێشانی کۆرپەکەم بووم. من خۆم کەسێکی شەڕانیم، ئەگەر سکم نەدەبوو، دەمکرد بە تۆپ.

کە گەیشتینە هۆتێلەکە، هاواری کرد، 'خۆیەتی؟ دەچی تەنیا دادەنیشیت و هیچ شتێك ناڵێیت - پاش ئەوەی ئەو هەموو شتەم بۆ کردی!' هەرکە ئوتومبیلەکە وەستا، بەسەر مندا دەستی برد دەرگاکەی کردەوە و پاڵێکی پێوەنام بۆ سەر زەوییەکە، قاچێکم لەناو ئوتومبیلەکەدا گیری کرد، هەوڵم دا قاچم دەربهێنم لە ئوتومبیلەکە و ڕاکەم و خۆم بگەیەنمە ژوورەکەمان لەسەرەوە.

هەرکە دانا دەرگاکەی لێکردمەوە، فرمێسك بەچاومدا هاتەخوارەوە، 'چی ڕوویداوە؟ چی لێکردی؟'

هەموو شتێك لای من ڕۆشن بوو: ئەگەر ڕاستیم بە دانا بوتایە، نیگلی دەکوشت و پاشان دەکەوتە بەندیخانەوە و منیش بەتەنیا منداڵەکەم گەورە دەکرد. 'هیچ نەبووە، هەروەك خۆیەتی، کەسێکی هیچە. شتەکانم ناداتەوە.' لەکورتی بڕاندمەوە.

'ئەوەیە؟ دەی واریس ئەو هیچە لەبیر خۆتی بەرەوە. ئەوە ناهێنێت بۆی بگریت.' من و دانا، یەکەم فرۆکەیەك کە دەکرا، گرتمان و گەڕاینەوە بۆ نیویورك.

کاتێك سکم هەشت مانگ بوو، وێنەگرێکی ئەفریقی بیستبووی سکم هەیە، داوای لێکردم وێنەم لێبگرێت. خۆی لە ئیسپانیا کاری دەکرد، داوای کرد بچم بۆ ئەوێ. زۆرم پێخۆش بوو، چونکو ترسی سەفەرکردنم نەبوو. دەشم زانی لەپاش شەش مانگییەوە نابێت سواری فڕۆکە ببم، بەڵام چاکەتێکی پانوپۆڕم لەبەرکرد و چوومە ناو فڕۆکەکەوە. کۆمەڵێك وێنەی جوانی لێگرتم بۆ *ماریە کلایرە*.

بەڵام جاریکی تریش ناچار بووم بە سکەکەوە سەفەربکەم. بیست ڕۆژ پێش ئەوەی منداڵم ببێت، بە فڕۆکە ڕۆیشتم بۆ نیبراسکا بۆ ماڵی باوکی دانا، بۆئەوەی پاش منداڵ بوون یارمەتیم بدەن. لەلای دایك و باوکی دانا مامەوە لە ئماها. دانا کاتی دانابوو کە لەگەڵ تیپەکەدا مۆزیك بژەنێت و هەفتەی داهاتوو بە فڕۆکە بگەڕێتەوە. پاش ماوەیەکی کەم لە گەیشتنم، بەیانییەکیان هەستام و هەستم بە نائاسایی بوونی گەدەم کرد. هەر بیرم دەکردەوە کە شەوی پێشوو چیم خواردووە، بۆتە هۆی ئەم ئازارە. ئەو ڕۆژە هەروا بەردەوام بوو، بەڵام زۆر گوێم پێنەدا. بۆ ڕۆژی دوایی ئازارێکی تەواوم هەبوو. ئینجا کەوتمە کەڵکەڵەی ئەوەی کە لەوانەیە ئازاری گەدە نەبێت. لەوانەیە منداڵم ببێت.

تەلەفونم بۆ دایکی دانا کرد لەسەر کار و پێم وت، 'گوێبگرە، ئەم ئازارە نائاساییەم بۆ هاتووە و ڕۆشتووە. تەواوی دوێنێ و شەوی ڕابوردوو بوومە. بەڵام خراپتر بووە. نازانم چیم خواردووە، بەڵام هەست دەکەم ئازارێکی نامۆیە.'

'واریس بە ڕاستتە. ئەوە ژان دەت گرێت!'

ئۆی! ئیتر بەڕاستی خۆشحاڵ بووم، چونکو تەواو ئامادە بووم منداڵەکەم ببێت. تەلەفونم بۆ دانا کرد لە نیویورك و پێم وت، 'لەو باوەڕەدام منداڵم ببێت!'

'نا، نا، نا! تا دەگەمە ئەوێ بۆت نییە منداڵت ببێت. منداڵەکەت بگرە! وا هاتم! وا سواری فڕۆکە دەبم.'

'خۆت وەرە و بیگرە! باشە من چۆن ئەمە بکەم؟ منداڵەکە بگرم!' ئۆی، پیاوان چەند کەرن! بەڵام دەمویست دانا لەوێ بێت کە منداڵەکەم لێدەبێتەوە و زۆرم پێناخۆش دەبوو ئەگەر ئەو ئەمەی نەبینیایە. پێش ئەوەی من تەلەفون بۆ دایکی بکەم، ئەو خەستەخانەی ئاگادار کردبوۆوە و سستەرێك هات و داوای لێکردم تەماشایەکم بکات. سستەرەکە پێی وتم، ئەگەر دەمەوێت منداڵەکەم لێببێتەوە، دەبێت بکەومە پیاسەکردن. هێنامە بەرچاوی خۆم، ئەگەر نەمەوێت منداڵەکەم لێببێتەوە، ئەوا دەبێت بەپێچەوانەوە کار بکەم، لەبەرئەوە پاڵکەوتم و جوڵەم لە خۆم بڕی.

دانا نەگەیشت تا ئێوارەی داوایی. تا ئەو کاتە سێ ڕۆژ بوو، ژانم هەبوو. کاتێك کە باوکی چوو بۆ فڕۆکەخانە بیهێنێتەوە، من کەوتبوومە هەناسەبڕکێیەکی قووڵ. 'ئۆۆۆۆ، نیبی! ئای! ئای چی بکەم!'

'هەناسە بدە، واریس، هەناسە بدە!' دایکی دانا هاواری دەکرد. بڕیارمان دا، کە کاتی چوونە خەستەخانە هاتووە، بەڵام نەمان دەتوانی بچین چونکو باوکی دانا ئوتومبیلەکەی بردبوو. کاتێك هاتنەوە، هەتا پێشئەوەی بێنەماڵەوە، هاوارمان لێکردن، 'بگەڕێنەوە بۆ ناو ئوتومبیلەکە، دەچین بۆ خەستەخانە!'

کاتژمێری دە گەیشتینە خەستەخانە، بۆ سبەینێ کاتژمێری دە هێشتا منداڵەکە نەبووبوو. 'دەمەوێت بە درەختێکەوە جۆلانە بکەم!' بەردەوام هاوارم دەکرد. دەمزانی ئەمە غەریزەیەکی تەواو ئاژەڵییە، وەك غەریزەی مەیمون. بەو ناوەدا دەجوڵێن، دادەنیشن، بە چیچکانەوە دادەنیشن، ڕادەکەن و جۆلانە دەکەن تا منداڵەکەیان لێدەبێتەوە. تەنیا پاڵناکەون. وە لەو ڕۆژەوە تا ئیمڕۆ دانا بە مەیمون بانگم دەکات. بە دەنگێکی ژنانەوە هاوار دەکات، 'ئاااا، دەمەوێت بە درەختێکەوە جۆلانە بکەم!'

که لـه ژووری منـداڵبوون بـووین، بـاوکی چـاوەڕوانکراو کـەوتبووه وانـەدانی مـن، ‛هەناسه بده، بەبه، هەناسه بده.‛

‛قوندەر! لێم دوورکەوەرەوە. دەتکوژم!‛ ئەی هاوار، دەمویست بیکوژم. حـەزم بـه مردنی خۆم دەکرد و پێش ئەوەی بمرم، دەمویست له کوشتنی ئەو دڵنیا بم.

لەکۆتاییدا، له نیـوەڕۆدا، سـاتی لـەدایکبوونی هـات. مـن زۆر ممنـونی ئـەو دکتـۆره بووم له لەندەن، که نەشتەرگەری بۆ کردم، چونکو لـەو بـاوەڕەدا بـووم، نەمـدەتوانی منداڵەکەم لێبێتەوه، ئەگەر بـه دووراوی بمامایەتـەوه. پـاش نـۆ مـانگ چاوەڕوانی و سێ ڕۆژ ئـازار کێـشان، جادوگەرانـه گەیـشت. ئـۆۆۆ! پـاش ئـەو هـەموو ماوەیـه، زۆر خۆشحاڵ بووم به بینینی - ئەو شته بچوك بچوکه. زۆر جوان بوو، به قژێکی ڕەشـی ئاوریشمی، دەمێکی بچوك و پەنجەی درێژی قـاچ و دەسـتی. پـەنجا سـانتیمەتر درێـژ بـوو بـەڵام قورسـایی دەگەیـشته سـێ کیلـۆ. یەکـسەر کوڕەکـەم وتـی، ‛ئـاه،‛ و بـه کونجکاوییـەوه تەماشـای دەروپـشتی کـرد. ئەمـه ئـەوه بـوو؟ خۆیـەتی؟ ئـا ئەمـه ڕۆشناییه؟ دەبێت هەست به خۆشی بکات پاش ئەوەی نۆ مانگ له تاریکیدا بوو.

به ستافەکەم وتبوو، هەرکه منداڵەکەم لێبۆوه، پێش ئەوەی بـشۆرێت یـان شـتێکی تر، بیخەنه سەر سنگم. کردیان و لەو ساتەدا که گرتمه بـاوەش، ڕاسـتی ئـەو وتەیـەم بۆ دەرکەوت، که هەموو دایکان به منیان وتبوو: لـەو کاتـەدا، هەرکـه منداڵەکـەت لـه ئامێز دەگریت، یەکسەر ئازارت لەبیر دەچێتەوه. لـەو ساتەدا هـیچ ئـازارێکم نـەبوو. هەمووی هەر خۆشی بوو.

ناوم نا ئالیك، که به سۆماڵی به واتای شێری بەهێز دێت. بەڵام ئێستا، بـەو دەمـه بـچوکه خـڕەوه، بـەو ڕوومەتـه قوڵپنانـه و تاجـه قـژه لوولـه ڕەشـەوه، زیـاتر لـه کوپیـدێکی ڕەش بـچوك دەکـات تـا شـێر. ناوچـەوانی سـاف گـەورەی، دروسـت لـه ناوچەوانی من دەچێت. کاتێك قسەی بۆ دەکەم، دەمی دەهێنێتەوه یەك، وەك ئەوەی

باڵندە بێت و خۆی ئامادە بکات بۆ خوێندن. لەو ساتەوەی هاتۆتە دنیاوە، بەردەوام کونجکاو بووە، لە هەموو شتێك وردبۆتەوە و سەیری جیهانی تازەی کردووە.

کاتێك کە کچێکی بچوك بووم، لە ئێوارانداا پاش لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانم، زۆر چاوم لەوەوە بووە بگەڕێمەوە و لە باوەشی دایکمدا پاڵکەوم. دەستی بەسەرمدا دەهێنا، هەستێکی ئارامی و ئاسودەیی پێدەبەخشیم. ئێستا منیش لەگەڵ ئالیك هەر ئەوە دەکەم، زۆری پێیخۆشە هەرکە دەستی بۆ دەبەم. مەساجی سەری بۆ دەکەم و یەکسەر لە باوەشمدا خەوی لێدەکەوێت.

لەو ڕۆژەوەی لەدایك بووە، ژیانم گۆڕاوە. خۆشییەك کە من لەوی دەبینم، بۆ من هەموو شتێکە. هەموو ئەو شتە بچوکە و هیچانەم خستۆتە لاوە، کە جاران مایەی نیگەرانیم بوون و گلەییم لێیان هەبوو. تێگەیشتم کە هیچ یەك لەوانە، ئەوە ناهێنێ. کاتێك کوڕەکەم بە ژیان چاوی پشکوت، ئەوەی بیرخستمەوە، کە ژیان - دیاری ژیان - هەموو شتێکە.

---

1.Freelance.

2.Fatal Attraction : سەرنجڕاکێشێکی کوشندە

## بەشی حەڤدەهەم

## باڵوێز

لە کەلتوری ئێمەدا، کاتێك ژن دەبێت بە دایك، کۆمەڵێك ڕێزی بەنسیب دەبێت. ئینسانێکی تری هێناوەتە ئەم دنیایەوە، پارمەتی ژیانی داوە. کە ئالیك لە دایکبوو، منیش بووم بە دایك، ژنێك کە بە تەمەنێك گەیشت. پاش تێپەڕاندنی خولێك لە ژنیەتیم، کە بە خەتەنەکردن دەستی پێکرد، لەپێش باڵقبوونمدا لە تەمەنی پێنج ساڵیدا و بە لەدایکبوونی منداڵەکەم لە تەمەنی نزیك سی ساڵیدا کۆتایی هات. بەمە ڕێزی دایکم لەلام زیاتر بوو. تێگەیشتم کە ژنانی سۆماڵی دەبێت چ هێزێکی لەبنەهاتوویان هەبێت بۆ هەڵگرتنی ئەم بارە، تەنیا لەبەرئەوەی بە مێینەیی لەدایك بوون. وەك ژنێك کە لە ڕۆژئاوادا دەژیم، هەوڵم داوە ئەوەی پێویست بێت بیکەم و هەندێك جاریش لەو باوەڕەدا نەبووم، لە توانای من دایە: زەوی ماکدۆناڵدم سڕیوە، لە کاتێکدا کە سوڕی مانگانەم ئەوەندە ئازاراویی بووە، وامزانیوە دەبووریمەوە. نەشتەرگەریم کرد بۆ کردنەوەی کۆئەندامی مێینەی تەواو داخراوم، بۆئەوەی بتوانم ئاسایی میزبکەم. نۆ مانگیش بە سکپڕی، سواری شەمەندەفەری ژێر زەوی بووم بۆ هارلێم لە سەرەوەی شار، بەسەر پێپلیکانەدا سەرکەوتم و چووم بۆ بازاڕ بۆ شت کڕین. سێ ڕۆژ ژانم هەبوو، کە دڵنیا بووم لەوەی بە بەرچاوی پزیشکەکانەوە لە ساڵۆنی منداڵبووندا یەکسەر دەمرم.

ڕاستییەکەی من کەسێکی بەختەوەرم. ئەو کچانەی ناو دەوەنەکان چی بکەن، میلا و میل دەڕۆن بۆ ئاودانی بزنەکانیان، هاوکات بە ئازاری سوڕی مانگانەوە دەناڵێنن، تەنانەت ناتوانن پشتیان ڕاستکەنەوە؟ یان ژنێك هەرکە منداڵەکەی لێبۆوە، وەك پارچە پەڕۆ، بە دەرزی و دەزوو دووبارە دەیدورنەوە، بۆئەوەی زێکەی بە تەسکی بمێنێتەوە بۆ مێردەکەی؟ یان ژنێکی سکپڕی نۆ مانگە، کە لە بیاباندا هەوڵی بەدەستهێنانی خۆراکیەتی بۆ تێرکردنی سکی برسی یانزە منداڵەکەی تری؟

یان ئەو ژنە چی بەسەردێت، کە هێشتا بە دوراوەیی ماوەتەوە و کاتی لە دایکبوونی یەکەم منداڵیەتی؟ چی ڕوودەدا، کاتێك ژنێك بەتەنیا، دایکم ئاسا، دەچێتە ناو چۆڵەوانی بیابان و هەوڵدەدا لەسەر دەستی خۆیدا منداڵەکەی ببێت؟ بەداخەوە، وەڵامی ئەو پرسیارە دەزانم. گەلێك خوێنیان لەبەردەڕوا تا گیانیان دەردەچێت و ئەگەر شانسیان هەبێت، ئەوا مێردەکانیان دەیان دۆزنەوە پێش ئەوەی داڵ و چەقەڵ بیان دۆزەنەوە.

کە چوومە تەمەنەوە و زیاتر فێربووم، تێگەیشتم کە من تەنیا نییم. گرفتی تەندروستییەك، کە من دەست و پەنجەی لەگەڵدا نەرم دەکەم، ملوێنەها کچ و ژن لەسەرتاسەری جیهاندا بە دەستیەوە دەناڵێنن. بەهۆی نەریتی نەفامی، زۆربەی ژنانی کیشوەری ئەفریقا تەواوی ژیانیان بە ئازاردوە دەبەنەسەر. کێ بە هانای ژنێکەوە دەچێت لە بیاباندا - وەك دایکم - نە پارەیەکی پێیە نە دەسەڵاتێکی هەیە؟ دەبێت کەسێك قسەیەك بۆ ئەو کچە بچکۆلانانە بکات کە دەنگیان لێوە نایەت. منیش وەك ئەوانە، لە خێزانێکی کۆچەرییەوە هاتووم و هەستم کردووە چارەنووسی من ئەوەیە، کە بەهانای ئەوانەوە بچم.

هەرگیز ناتوانم ڕوونی کەمەوە، کە بۆچی هەندێك لەو شتانەی کە لە من ڕوویداوە، تەواو ڕێکەوت بووە. بەڵام لە ڕاستیدا باوەڕم بە بیرۆکەی تەواو ڕێکەوت نییە، دەبێت شتی زیاترمان هەبێت بۆ ژیان وەك لەوەی ئێستا هەیە. لە بیاباندا خوا منی پاراست لە شێرێك، کاتێك لە ماڵەوە هەڵهاتم، هەر لەو ساتە بەدواوە، هەستم کردووە پلانێکم بۆ دانراوە، هۆیەك هەیە بۆ مانەوەی من بە زیندویی. بەڵام دەبێت ئەو هۆیە چی بێت کە لە ئارادایە؟

ماوەیەك لەمەو پێش، ماریە کلایرە، نووسەری گۆڤاری فاشن، داوای دیمانەیەکی لێکردم. پێش دانیشتنەکە، کۆمەڵێك سەرنجم لەلا دروست بوو، کە دەمویست لەو

دیمانەیەدا ببێت. کە بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ ڕۆژنامەنووس لاورا زیفم بینی، یەکسەر چووە دڵمەوە. پێم وت، "گوێگرە، من نازانم چ جۆرە بەسەرهاتێکت لە من دەوێت. بەڵام ئەگەر بەدوای باسی مۆدێلەوەیت، ئەوا ملوێنێك جار لە سەری نووسراوە. ئەگەر پەیمانی چاپکردنم پێدەدەیت، ئەوا من بەسەرهاتێکی ڕاستەقینەت بۆ دەگێڕمەوە."

لاورا وتی، "چاکە، ئەوپەڕی کۆششی خۆم دەکەم،" و ئامێری تۆمارکردنەکەی داگیرساند. دەستم کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خەتەنەکردنەکەی خۆم لە منداڵیدا. لەپڕ، لە نیوەی دیمانەکەدا، دایە پرمەی گریان و ئامێرەکەی کوژانەوە.

"ئۆی، ئەوە چیتە؟"

"ئەوەی دەیگێڕیتەوە زۆر ترسناکە ... خەریکە دڵم دێتە دەرەوە. هەرگیز ناتوانم بە خەوی شەویش ببینم کە هێشتا ئەو شتانە تا ئیمرۆ ڕوودەدا."

"ئیتر ئەوەیە دەیبینی. مەبەست هەر ئەوەیە کە خەڵکی ڕۆژئا ئاگاداری ئەوە نین. ئینجا لەو باوەڕەدای دەتوانی شتی وا بخەیتە ناو گۆڤارەکەتەوە - گۆڤارێکی جوانی ڕێکوپێك، کە تەنیا ژنان دەیخوێننەوە؟"

"بەڵێنت پێدەدەم، چی بتوانم بە باشترین شێوە دەیکەم. بەڵام بڕیار دەگەڕێتەوە بۆ بەڕێوەبەرەکەم."

بۆ ڕۆژی دوایی پاش دیمانەکە، سەرسامی و شەرمەزاری دایگرتم لەوەی چیم وتووە. هەموو کەسێك لە نهێنییەکی کەسایەتی من ئاگادار دەبێتەوە. هەتا نزیکترین هاوڕێم، ئاگاداری ئەوە نەبووە کە لە منداڵیدا چیم بەسەرهاتووە. وە من لە کەلتورێکەوە هاتووم لە سۆماڵ، کە ئاسایی قسەکردن لەسەر بابەتی وەها بڤەیە. کەچی ئێستا من لەبارەیەوە بۆ ملوێنەها خەڵکی نەناس دەدوێم. بەڵام لە کۆتاییدا بڕیاری خۆمم دا: چۆنە با وا بێت. شکۆمەندی بخەرە لاوە ئەگەر وا پێویست بکات. هەر وام کرد. شکۆیی خۆمم خستەلاوە، وەك ئەوەی جلوبەرگ بە خۆمەوە نەهێڵم.

خستمە کەنارەوە و بە ڕووتی چوومە دەرەوە. بەڵام نیگەرانی کاردانەوەی سۆماڵییەکانی تر بووم، دەمهێنایە بەرچاوی خۆم، چی دەڵێن، 'چۆن دەوێریت ڕەخنە لە نەریتی باوباپیرانمان بگریت!' دەتوانم پێشبینی ئەوە بکەم، کە خێزانەکەمان هەمان قسە دەڵێنەوە، کە لە سەردانەکەمدا بۆ ئسیوپیا پێیان وتم، 'لەو باوەڕەدای چونکو لە ڕۆژئاواوە هاتوویتەوە، هەموو شتێك دەزانی؟'

پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر، تێگەیشتم کە لەبەر دوو هۆ دەبێت ئەم باسە بکەمەوە. یەکەم لەبەرئەوەی شتێکە لە ناخی دڵمەوە ئازارم دەدات. سەرەڕای گرفتی تەندروستی، کە هێشتا ڕووبەڕووم لەگەڵی، هەرگیز لە خۆشی سێکس چێژ نابینم، لێی بێبەشکراوم. هەست دەکەم ناتەواوم، هیچم لەدەست نایەت و دەشزانم هیچ ڕێگا چارەیەکم نییە بۆ گۆڕانی، ئەمەش ئەوپەڕی بێهیواییە. کە دانام بینی، سەرئەنجام کەوتمە ئەوینەوە لەگەڵیدا و ویستم خۆشی سێکس تاقیکەمەوە لەگەڵ پیاوێکدا. بەڵام ئەگەر پرسیارم لێبکرێت، 'ئایا چێژ لە سێکس دەبینم؟' دەڵێم نا بەو شێوەیەی کە هەیە. تەنیا پێم خۆشە نزیکی دانا بم، چونکو خۆشم دەوێت.

لە تەواوی ژیانمدا هەوڵم داوە هۆیەك بدۆزمەوە، کە بۆچی خەتەنەکراوم. لەوانەبوو ئەگەر هۆیەکی باشم بدۆزیایەوە، قبووڵی ئەوەم بکردایە کە بەسەریان هێناوم. بەڵام بە هیچ شتێك نەگەیشتم. چەند هەوڵدانی بێهودەم بۆ دۆزینەوەی هۆیەك درێژەی کێشاوە، ئەوەندە زیاتر تووڕەتر بووم. پێویستە لەبارەی ئەم نهێنییەوە بدوێم، چونکو لە تەواوی ژیانمدا لە ناخی خۆمدا هەڵم گرتووە. لەبەرئەوەی لە خێزانەکەمەوە دوورم، نە دایك هەیە، نە خوشك، نە هیچ کەسێك، تا دڵی خۆمی بۆ بکەمەوە. ڕقم لە وشەی 'قوربانی' دەبێتەوە، چونکو هێمایەکە بۆ بێدەسەڵاتی. بەڵام کە ژنە قەرەجەکە قەسابی کردم، دروست من ئەوە بووم. ئێستا کە ژنێکی تەواوم، ئیتر قوربانی نییم، دەتوانم کارێك بکەم. بە نووسینی وتارێك بۆ ماریە کلایرە، ویستم ئەو کەسانەی کە ئەو ئەشکەنجەیە دەدەن، بەلایەنی کەمەوە

گوێیان لە هەستی ژنێك بێت، چونكو هەموو ژنانی وڵاتەكەی من دەنگیان لێوە نایەت.

پاش ئەوەی نهێنییەكەمم دركاند، تووشی خەڵكانێك بووم كە بە نامۆییەوە لەسەر جادە تەماشایان دەكردم. بڕیارمدا پشتگوێیان بخەم. چونكو هۆی دووەمم بۆ بڵاوكردنەوەی ئەو نووسراوەیە، ئەوە بوو كە خەڵك ئاگادار بێتەوە، ئەم كارە هێشتا، تا ئیمڕۆ ئەنجام دەدرێت. هەوڵی من تەنیا بەخاتری خۆم نەبوو، بەڵكو بۆ هەموو ئەو كچۆڵانەیە لە جیهاندا كە ئەم كارەیان بەسەر دەهێنن. سەدان نیین، هەزاران نیین، بەڵكو ملوێنەهان، كە لەگەڵیدا دەژین و بەهۆیەوە دەمرن. تازە بۆ من زۆر درەنگە گۆڕانێك لە هەلومەرجەكەی خۆمدا بكەم، هەر ئێستا سەقەت كراوم، بەڵام لەوانەیە هەندێك كەس ڕزگار بكەم.

كاتێك دیمانەكەم بە ناونیشانی 'تراژیدیای خەتەنەی كچێك'[1]، بڵاوبووەوە، كاردانەوەكان جێگای سەرنج بوون. لاورا كارێكی باشی كرد و چاپكردنەكەی ئازایەتی ماریە كلایرە بوو. گۆڤارەكان و ڕێكخراوی 'یەكسانی هەر ئێستا'[2]، كە خەبات دەكات بۆ ماڤ ژنان، نامەیەكی زۆری هاوپشتیان بەسەردا ڕژا. خوێنەران، هەر وەك لاورا كە ئەو ڕۆژەی پێم وت، تەواو تووشی شۆك بووبوون:

*بۆ مانگێك دەچێت، توشی ترسێكی زۆر بووم لە خوێندنەوەی بەسەرهاتێك دەربارەی 'خەتەنەی' كچان، لەلایەن ماریە كلایرە، لە ژمارەی مارتدا و نەمتوانیوە تا ئێستا ئەو ترسە لە دڵی خۆم دەركەم. زۆر سەختە باوەڕ بكەیت كەسێك، ژن یان پیاو، بتوانێت لە بیر خۆی بەرێتەوە یان خۆی وا پیشان بدات، كە ئاوا خوێنساردانە و نامرۆڤانە هەڵسوكەوت بكات لەگەڵ هاوڕەگەزە ئینسانییەكەی خۆی، كە خوا دروستی كردووە وەك هاوڕێی پیاو و یاوەری، 'یارمەتیدەری' . ئنجیل دەڵێت پیاوان*

*ژنـەکانی خۆیانیـان خۆشـدەوێت.' هـەتا ئەگـەر ئـەوان لـە کلتورێکـدا دەژیـن کـە جێگایەك بۆ خوا قایل نەبن، ئەوا خەڵکەکەی نابێت چاو بنوقێنێت لەوەی کە ئازار، دەستوەشاندن و هەتا کوشتارێك وەك سەرئەنجامدانی ئەم کارە، چەند هەڵەیە! چۆن دەتـوانن رێگـا بـدەن ئەمـە بەسـەر ژنـەکانیان، کـچەکانیان و خوشـکەکانیان بێـت؟ بێگومان دەبێت بزانن کە لە زۆر ڕوەوە ژنەکانیان دەڕوخێنن!*

*خوا بە هانامانەوە بێت، دەبێت شتێك بکەین. لەخەو هەڵدەستم بـیری لێدەکەمـەوە، دەچمە ناو جێگاوە بیری لێدەکەمەوە و چەندەها ڕۆژ فرمێسکم ڕشتووە! بێگومـان (بۆچوونی جیهانی)[3] و ڕێکخراوی تر لەم جۆرە، دەتوانن ئەو خەڵکە ئاگادارکەنـەوە و فێریان بکەن، کە چۆن هاوسەرایەتی و پێکەوە ژیـان زۆر باشـتر هەڵـدەکات، چ بـۆ پیاوان و چ بۆ ژنان، وەك ئەوەی کە مەبەست بووە، هەروەها ژنان کە بە ئەنـدامێکی تایبەتی لەشەوە لەدایکبوون، بۆ مەبەستێکی باشە، هەروەك ئەوەی پیاوان!*

نامەیەکی تر:

*هەر ئێستا لە خوێندنەوەی وتارێك لەسەر واریس دیریـە بوومـەوە، بـاری دەروونـیم تێکچووە لەوەی کە ئەو جۆرە لە ئەشکەنجە و سەقەتکردنە هێشتا بەسـەر کـچانێکی بچوکدا دەهێنرێت. بە ئاستەم باوەڕ دەکەم، کـە شـتێکی وا سـادی تـائیمرۆ دەکرێت. گرفتێك، کە جێگای باوەڕ نییە، ئەوەیە کە ئەم ژنانە لە تەواوی ژیانیاندا باجی ئـەم کـارە دەدەنـەوە. ئەمـە نەریتـە یـان نـا، ئـەم دەستدرێژیانە بـۆ سـەر کـچان دەبێت لەسەرتاسەری جیهاندا کۆتایی پێبهێنرێت. ڕێگا بدەن با کێری کوڕێك بـبڕم و دوایـی بیدورومـەوە، بەڵێنتان پێدەدەم ئـەم نەریتـە کۆتـایی پێدەهێنرێت. چۆن دەتـوانی لەگەڵ ژنێکدا بچیتە جێگاوە کـە ئـازاری زۆر و بێکۆتـایی هـەبێت؟ ئـەم بەسـەرهاتە*

*چاوانمی پڕکرد لە فرمێسك. ئەم نامەیەشم بۆ ڕێکخراوی "یەکسانی هەر ئێستا"یە، بۆ زانیاری لەسەرئەوەی کە چۆن یارمەتیان بدەم.*

نامەیەکی تر کە بۆ من هاتبوو:

*زۆر بەسەرهاتی تراژیدی وتراوە و زۆری تریش لە داهاتوودا دەوترێت. بەڵام واریس، زۆر نەوتراوە لەسەر کەلتورێکی وەها ترسناك کە ئەو خەڵکەی کارێکی وەها بەسەر منداڵەکانیان دەهێنن. کە ئەوەم خوێندەوە دەستم کرد بە گریان و لە ناخی دەروونیدا هەستم بە ئازار کرد. دەمەوێت هەوڵێك بدەم بۆ گۆڕانی ئەم شتانە، بەڵام نازانم کەسێك دەتوانێت چی بکات.*

ئاسودەبووم بەم نامە هاوپشتییانە، بەڵام تەنیا دوو نامەی سەرزەنشتکەرانم بەدەست گەیشت، کە ئەویش جێگای سەرسامی نەبوون، لە سۆماڵەوە هاتبوون.

دەستم دایە دیمانەی زیاتر و قسەکردن بۆ قوتابخانەکان، ڕێکخراوە مەدەنییەکان و بە شێوەیەکی سەرەکی لەو شوێنانەی کە دەمتوانی ئەم بابەتە جەماوەری بکەمەوە.

چارەنووسم شتێکی تریشی بە خۆیەوە بینی. هونەرمەندێکی مکیاج بەڕێگاوە دەبێت بە فڕۆکە لە ئەوروپاوە بۆ نیویورك، دەست دەداتە گۆڤارەکەی ماریە کلایرە و دیمانەکەی من دەخوێنێتەوە. هەرلە فڕۆکەکەدا پیشانی خاوەنکارەکەی دەدات و پێی دەڵێت، "ئەمە پێویستە بیخوێنیتەوە." ڕێکدەکەوێت خاوەنکارەکەی باربارا والتیر دەبێت. باربارا دوایی بۆی گێرامەوە، کە نەیتوانییوە دیمانەکە بە تەواوەتی بخوێنێتەوە چونکە پێی تێکچووە. هەرچی چۆنێك بووە، هەستی کردووە کە ئەم گرفتە دەبێت بکرێتە جێگای گفتوگۆ. بڕیار دەدا بەسەرهاتەکەی من بکات

زنجیرەیەکی 20/20 بەشی قسەوباس، تا بینەران ئاگاداربنەوە لە خەتەنەی کچان. ئیسێل باس وینتراوب بەخشیشێکی دانا بۆ براوەی زنجیرەکە، بە ناوی 'سەفەری تیمارکردن.'

کاتێك باربارا دیمانەی لەگەڵدا دەکردم، دەمویست بگریم، وام هەست دەکرد رووتم. گێڕانەوەی بەسەرهاتێك لە نووسراوەیەکدا، هەرچی چۆنێك بێت دوورییەکی دروست دەکرد لە نێوان من و خوێنەراندا. بەڵام کە فیلمیان دەگرتم بۆ 20/20، دەمزانی لەو کاتەدا کامێرەکە لەسەر دەموچاوی منە، کە نهێنییەك تەواوی تەمەنم پاراستوومە، ئاشکرای دەکەم، وەك ئەوە وابوو کەسێك بە چەقۆ شەقم کات و رۆحم بخاتە روو.

'سەفەری تیمارکردن' لە هاوینی 1997دا پەخشکرایەوە. هەر لەپاش ئەوە، ئاژانسەکەم تەلەفونی بۆکردم و وتی کە نەتەوە یەکگرتووەکان پەیوەندییان پێوە کردووە. یو ئێن ئەو زنجیرە 20/20 یان بینیوە و دەیانەوێت پەیوەندیم پێوە بکەن.

رووداوەکان رێگەیەکی تری سەرنجراکێشیان گرتەبەر. بەشی دەرمانی دانیشتوانی نەتەوە یەکگرتووەکان داوایان لێکردم پەیوەست بم بە کەمپینی کۆتایی هێنان بە خەتەنەکردنی کچان. رێکخراوی تەندروستی جیهانی هەندێك ئاماری ترسناکی راستەقینەی بڵاوکردەوە، کە نیشاندەری بەرفراوانی ئەم گرفتە بوو. پاش بینینی ئەم ئامارە، بۆم روون بووەوە کە ئەمە تەنیا گرفتی من نییە. خەتەنەی کچان یان ئەوەی کە ئیمڕۆ بەشێوەیەکی دروستتر ناوی لێدەبەن، سەقەتکردنی ئەندامی مێینە (FGM) نەریتێکی باوە لە بیست و هەشت وڵاتی ئەفریقادا. یو ئێن دەیخەمڵێنێت، کە ئەم کارە بەسەر سەد و سی ملوێن کچ و ژندا هێنراوە. هەر ساڵە وا پێشبینی دەکرێت، بەلایەنی کەمەوە دوو ملوێن کچ ببنە قوربانی - کە دەکاتە رۆژی شەش هەزار. ئاسایی ئەم کارە لە هەلومەرجێکی سەرەتاییدا، لەلایەن داپیرەوە

یان ژنی لادێوە ئەنجام دەدرێت. هیچ کەرەسەیەکی بێهۆشکردن بەکار ناهێنن. بۆ بڕینی کچەکە، دەستیان بە هەرچی شتێك بگات بەکاری دەهێنن، وەك: گوێزانی ڕیشتاشین، چەقۆ، مەقەست، شوشەی شکاو، بەردی تیژ - و لە هەندێك ناوچەدا - بە دان. ژمارەی ئەم قەسابییە چەندە، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و جۆری کەلتوورەکان، دەیگۆڕێت. بچوکترین زیان بڕینی پۆپەی میتکەیە ، کە دەبێتە هۆی ئەوەی، ئەو کچە تا کۆتایی ژیانی لەزەت لە سێکس نەبینێت. گەورەترینیشیان خەتەنەی فیرعەونییە ، کە لە سەدا هەشتای ژنانی سۆماڵی دەکرێن. ئەمە ئەو جۆرەیانە کە بەسەر من هاتووە. سەرئەنجامی دەستبەجێی خەتەنەی فیرعەونی ئاوێتەیەکە لە شۆك، هەوکردن، برینداربوونی بۆری میز و کونی کۆم، چۆنییەتی بەیەکەوە لکاندنی نەشتەرگەرییەکە، گەزاز، هەوکردنی میزەڵدان، ژەهراوی بوونی خوێن، HIV و هەوکردنی جگەر. سەرئەنجامی درێژماوەی ئەم کارە، ئاوێتەیەکە لە نەخۆشی درێژخایەن و چەند جار دووبارە بوونەوەی هەوکردنی میزەڵدان و حەوز، کە لەوانەیە ببێتە هۆی نەزۆکی، تلۆق و دومەڵ بە دەوری زێدا، ئازاری دەمار، ڕۆژ بە ڕۆژ سەختتر بوونەوەی دانەدەرەوەی میز و خوێنی سوڕی مانگانە، کۆبوونەوەی خوێنی سوڕی مانگانە لە منداڵداندا، کەمبوونەوەی هەوەسی سێکسی، خەمۆکی و مردن.

کە دەیهێنمە بەرچاوی خۆم، ئیمساڵ دوو ملوێن کچۆڵە، ئەو کارەیان بەسەر دەهێنن کە بەسەر منیان هێناوە، دڵم دادەخورپێت. هەروەها پیشانم دەدات، کە ئەم ئەشکەنجەیە هەموو ڕۆژێك بەردەوامە، ژنانی تورەی وەك من بەرهەم دەهێنن، ژنانێك کە ئەوەی لێیان سەندراوە، هەرگیز ناتوانن بە دەستی بهێننەوە.

ژمارەی ئەو کچانەی کە خەتەنە دەکرێن، ڕوو لە زیادییە، لە جیاتی ئەوەی ڕوو لە کەمی بێت. ژمارەیەکی زۆری ئەو ئەفریقیانەی کە کۆچیان کردووە بۆ ئەوروپا و وڵاتە یەکگرتووەکان، هەڵگری ئەم نەریتەن. سێنتەری فیدراڵی بۆ دەستبەسەرا

گرتنی نەخۆشی و بەرگرتن دەیخەملێنێ، کە بیست و حەوت هەزار ژن، لە ویلایەتی نیویورك، ئەم خەتەنەیان کردووە یان دەیکەن. هەر لەبەر ئەم هۆیە، هەندێك ویلایەت لە هەوڵدان یاسایەك بهێننە کایەوە کە بڕینی ئەندامی مێینە نایاسایی بکەن. یاسادانەرەکان وای دەبینن کە پێویستە یاسای تایبەتی دانێن بۆ پاراستنی منداڵان لەو مەترسییە، چونکو خێزانەکان دەڵێن، خەتەنە کردنی کچەکانیان، 'ئەرکێکی ئاینییە'. گەلێك جار کۆمەڵگەی ئەفریقی هەندێك پارە کۆدەکەنەوە بۆ هێنانی خەتەنەکەرێك، وەك ژنێکی قەرەج، لە ئەفریقاوە بۆ ئەمریکا. پاشان بە یەك جار کۆمەڵێك لە کچانی بچوك خەتەنە دەکات. کاتێك کە ئەم هەلە نەبێت، خێزانەکان خۆیان دەست بەکار دەبن. جارێکیان پیاوێك لە شاری نیویورك دەنگی ستیرۆکەی بەرز کردبۆوە تا دراوسێکان گوێیان لە قیژە قیژ نەبێت. پاشان پیاوەکە ئەندامی مێینەی کچەکەی بە چەقۆی چێشتخانە بڕیبوو.

بە شانازییەکی زۆرەوە، پێشنیارەکەی یو ئێنم قبووڵ کرد، کە ببم بە باڵوێزی تایبەت و پەیوەست بم بە کەمپینەکەیانەوە. کارکردن لەگەڵ ژنێکی وەك دکتۆر نەفیس سەدیق، بەرپرسی بەڕێوەبەری بەشی دەرمالی دانیشتوانی نەتەوە یەکگرتووەکان، یەکێکە لەو ئەزمونە گەورانەی کە بەهۆی کارەکەمەوە بینیم. دکتۆر نەفیس یەکێکە لەو ژنانەی کە یەکەمین جار دەستی دایە خەبات لە دژی بڕینی ئەندامی مێینە و ئەم بابەتەی لە کۆنفرانسی نێونەتەوەیی لەسەر دانیشتوان و پێشکەوتن، لە قاهیرە لە ساڵی 1994دا، بەرزکردەوە. لە ماوەیەکی کورتدا دەچمەوە بۆ ئەفریقا بۆ پشتیوانی لە کەمپینی یو ئێن بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی خۆم.

بۆ چوار هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە کە کەلتوری ئەفریقایی ژنەکانی خەتەنە دەکات. لەبەرئەوەی ئەم نەریتە گشتییەتی هەیە لە زۆربەی زۆری وڵاتە ئیسلامییەکاندا، زۆر کەس لەو باوەڕەدایە، کە ئەمە داوایەکی قورئانە. هەرچی چۆنێك بێت ئەمە

بەو شێوەیە نییە: نە قورئان نە ئنجیل هیچ هێمایەکیان بۆئەوە نەکردووە، کە خەتەنەی ژنان بۆ ڕازیکردنی خوایە. ئەم نەریتە ساف و سادە لەلایەن پیاوانەوە هاندەدرێت و داوا دەکرێت - پیاوانی نەفام و خۆپەرست - کە دەیانەوێت دڵنیا بن لە خاوەندارییەتی هەوەسی سێکسی ژنەکانیان. داوا دەکەن ژنەکانیان خەتەنە کرێن. دایکان ملکەچی دەکەن و ڕێگا دەدەن کچەکانیان خەتەنە کرێن، لەترسی ئەوەی خوازبێنیکەریان نەبێت. ژنێکی خەتەنەنەکراو وەك کەسێکی پیس، حەشەری چاویلێدەکرێت و کەس نایهێنێت. لە کەلتوری کۆچەریدا، ئەو کەلتورەی کە منی لێوە هاتووم، کچی شوونەکردوو جێگای نابێتەوە، لەبەرئەوە دایکەکان بە ئەرکی سەرشانی خۆیانی دەزانن کە دڵنیا بن بۆ کچەکانیان باشترین هەلیان ڕەخساندووە - هەروەکو خێزانە ڕۆژئاواییەکان، چۆن بە ئەرکی سەرشانی خۆیانی دەزانن کە کچەکانیان بنێرنە بەر خوێندنێکی باش. بێجگە لە نەفامی و ئەفسانەپەرستی، هیچ هۆیەك نییە بۆ سەقەت کردنی هەر ساڵەی ملوێنەها کچ. دەرد، ئازارکێشان و مردن وەك میراتگری ئەم نەریتە، زۆر زیاترە لە هەر هۆیەك کە ئەمە کۆتایی پێبێت.

کارکردن وەك باڵوێزی یو ئێن، خەوێك بوو هاتەدی، خەوێك کە هەرگیز نەمدەوێرا بەلایدا بچم. لەگەڵ ئەوەی لەکاتی گەورە بوونمدا، هەردەم هەستم کردووە جیاوازم لە خێزانەکەم و لەو خەڵکە کۆچەرییە، بەڵام هەرگیز پێشبینی داهاتووی خۆمم نەکردوە، کە وەك باڵوێز کار بکەم بۆ ڕێکخراوێك کە چارەسەری گرفتی جیهانی لە ئەستۆگرتووە. لە ئاستی نێونەتەوەییدا یو ئێن چی دەکات، دایکانیش لە ئاستی خۆیاندا هەمان شت دەکەن: مایەی خۆشی و پەناگایە. تەنیا شتێك، کە لە ژیانی ڕابوردوومدا هەبوو بێت، وەك هێمایەك بۆ دەورەی داهاتووم لە یو ئێندا، ئەوە بووە هەر لە زووەوە هاوڕێکانم بەردەوام بە دایە بانگیان کردووم. گاڵتەیان پێکردوم، چونکو ویستومە دایك بم بۆیان و چاودێری هەر یەکەیان بکەم.

هەندێك لەو هاوڕێیانە نیگەرانی خۆیان دەربڕیوە، کە کاتێك دەچم بۆ ئەفریقا، لەوانەیە دینییەکی توندڕەو هەوڵی کوشتنم بدات. سەرەڕای ئەوە، من لە قسەی خۆم ناکەوم لەدژی ئەم تاوانە، چەند توندڕەوەکان ئەمە بە نەریتێکی پیرۆز بزانن. دڵنیام کارەکەم پڕ مەترسییە و دانیشی پیادا دەنێم کە ترسم هەیە، وە بەتایبەتی ئێستا نیگەرانی ئەوەم کە کوڕێکی بچوکم هەیە، دەبێت چاودێری بکەم. بەڵام باوەڕم داوام لێدەکات بەهێز بم و خوا بێهۆ منی ئاڕاستەی ئەم ڕێگایە نەکردووە. ئەو ئەم ئەرکەی بە من سپاردووە. ئەمە ئەرکی منە. لەو باوەڕەدام، زۆر پێش ئەوەی لەدایك ببم، خوا ڕۆژی مردنەکەمی دیاری کردووە، لەبەرئەوە گۆڕینی لە دەستی مندا نییە. لەو ماوەیەدا دەبێت کەڵك لە هەر هەلێك وەرگرم، چونکە ئەوە شتێکە هەمیشە لە ژیانمدا کردوومە.

---

1. The Tragedy of Female Circumcision.
2. Equality Now.
3. World Vision.
4.United Nations.
5.United Nations Population Fund
6.female genital mutilation.
7. hood of clitoris و بڕینی میتەکە، خەتەنەی کچان. واژەی خەتەنە بۆ کوڕیش بەکار دێت.
خەتەنەی فیرعەونی یانی قەیسەری واژەیەکە، کە لە نوسراوەکانی نەوال
8.infibulation و سعداوییەوە وەرم گرتووە.
9.The federal centers for Disease Contro and Prevention.

## بەشی هەژدەیەم

## خولیایماڵەوە

لەبەرئەوەی ڕەخنە لە نەریتی شێواندنی ئەندامی مێینە دەگرم، هەندێك خەڵك وا بیردەکەنەوە، کە من ڕێز لە کەلتورەکەی خۆمان ناگرم. بەڵام ئەوانە زۆر بە هەڵەدا چوون. هەر هەموو ڕۆژێك خۆشحاڵی خۆم دەردەبڕم، کە لە ئەفریقاوە هاتووم. جێگای شانازیمە سۆماڵیم، هەروەها شانازی بە وڵاتەکەمەوە دەکەم. پێشبینی دەکەم، لەوانەیە هەندێك لە کەلتورەکانی تر وا تێبگەن کە شێوەی بیرکرنەوەی ئەفریقی هیچ شتێکی وەهای نییە شانازی پێوە بکەیت. لەو باوەڕەدام، تۆ ئەمە بە لووتبەرزی دەزانی.

کێشەی خەتەنەی لێدەرچێت، شێوەی پەروەردەبوونی خۆم ناگۆڕمەوە لەگەڵ هیچ کەسێکدا. هەرچەند هەموو کەس لە نیویورکدا قسە لەسەر بەهاکانی خێزان دەکات ، بەڵام بۆخۆم شتێکی وەهام نەبینیوە. کۆبوونەوەی خێزانیم نەبینیوە وەك ئەوەی ئێمە، گۆرانی بڵێن، چەپڵە لێبدەن، پێبکەنن. خەڵك لێرە تەنیایە، ئەو هەستەیان نییە شتێك هەیە کۆیان دەکاتەوە.

باشییەکی تری گەورەبوون لە ئەفریقادا ئەوەیە، کە خۆم بە بەشێك دادەنێم لە سروشت، لە ژیان. ژیانم ناسیوە - لە دەستی هەڵنەهاتووم. بە هەموو واتایەك ژیان بوو نەك ژیانێکی دەستکرد، بە تەلەفیزیۆن سەیری خەڵکی تر بکەیت چۆن ژیان دەبەنەسەر. هەر لەسەرەتاوە، غەریزەی ژیان بەدەربردنم تیادا بووە، هاوکات فێری خۆشی و ناخۆشی بووم. فێری ئەوە بووم، خۆشی ئەوە نییە کە چیت هەیە، چونکو هەرگیز هیچم نەبووە و دڵیشم زۆر خۆشبووە. خۆشترین کاتی ژیانم ئەو کاتانە

بوو، كە من و خێزانەكەم كۆدەبوینەوە. بیر لەو ئێوارانە دەكەمەوە، پاش ئەوەی نانمان دەخوارد، بە دەوری ئاگرەكەدا دادەنیشتین و بە بچوكترین شت پێكەنینمان دەهات. هەروەها كاتێك باران دەباری و ژیان لەدایك دەبۆوە، ئاهەنگمان دەگێڕا.

كاتێك لە سۆماڵ دەژیام، چێژمان لە بچوكترین شتی ژیان وەردەگرت. ئاهەنگی بارانبارینمان دەگێڕا، چونكو بە واتای ئەوە دەهات، ئاومان هەیە. كێ لە نیویورك نیگەرانی ئاوە؟ با لە بەلوعەوە هەر ئاو بڕوات، تۆ خەریكی كاری خۆتی لە چێشتخانەدا. هەر كاتێك بتەوێت، ئاو هەیە. زرم، بەلوعە دەكەیتەوە و ئاو خوڕە دەكات. ژیان ئاوایە، كاتێك شتێكت نەبێت ئینجا چێژی لێدەبینیت، چونكو ئێمە هیچمان نەبوو چێژمان لە هەموو شتێك دەبینی.

هەر ڕۆژە لە كێشەدا بووین بۆ سكێكی تێر. كڕینی كیسەیەك برنج، بۆمان بۆنەیەكی گەورە بوو. لەم وڵاتەدا، زۆری خواردن و هەمە جۆری، جێگای سەرسامییە بۆ هەركەسێك كە لە وڵاتانی جیهانی سێیەمەوە بێت. لەگەڵ ئەوەشدا، بەداخەوە هەندێكی زۆر لە ئەمریكاییەكان سەرقاڵی ئەوەن نەخۆن. بەشێك لە خەڵكی جیهان گیاندەكێشن بۆئەوەی نەمرن لە برسا. بەشێكی تر، پارە دەدن بۆئەوەی لەڕ بن. ڕێكلامی كەمكردنەوەی قەڵەویم لە تەلەفیزیۆندا بینیوە و هاوارم لێهەڵساوە، 'دەتەوێت لەڕ بیت - بچۆ بۆ ئەفریقا! پێت چۆنە؟ بیرت لەوە كردۆتەوە؟ پێت چۆنە، ئەگەر دەتەوێت قورساییت بێتە خوارەوە، یارمەتی خەڵكانی تر بدە؟ هەرگیز بیرت لەوە كردۆتەوە؟ هەم خۆشت هەست بە باشی و جیاوازی بكەیت. دوو شتی گەورە بە یەكجار بەدەست بهێنیت. بەڵێنت پێدەدەم، كە گەڕایتەوە، فێری زۆر شت بوویت.

ئێمڕۆ ڕێز لە هەموو شتێكی سادە و ساكار دەگرم. ڕۆژانە خەڵك دەبینم كە خانووی جوانیان هەیە، هەندێك جار چەند خانوو، ماشێن، بەلەم، ئاڵتون، بەڵام هەر لە هەوڵی ئەوە دان شتی تر بكڕن، وەك ئەوەی شتی داهاتوو بۆیان دەبێتە

مایەی خۆش و ئاسوودەیی. هەرچی چۆنێك بێت، پێویستم بە ئەڵقەی ئاڵماس نییە دڵم خۆش بکات. خەڵك پێم دەڵێن، ئا، ئێستا بۆ تۆ ئاسانە، هەر چی شتێکت بوێ بیکڕیت. بەڵام من هیچ شتێکم ناوێت. بەنرخترین گەنجینە لە ژیاندا - بێجگە لە ژیان خۆی - تەندروستییە. بەڵام خەڵك ئەو تەندروستییە بەهادارە لەناو دەبەن بە نیگەران بوون لە شتی پڕ کێشەی پوچ 'نۆی، ئوتومبیلەکە بۆ ئێرە دێت، ئەوە دانەیکی ترە، ئوتومبیل لە هەموو لایەکەوە دێت، و ... نۆی، ئەو هەموو پارەیە لەکوێ بهێنم، بیدەم بەوە؟' وڵاتە یەکگرتووکان دەوڵەمەندترین وڵاتە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کەس هەست بە هەژاری دەکات.

کەس کاتی نییە، زیاتر لەوانەی کە پارەیان نییە قەرزەکانیان بدەنەوە. هەموو کەسێك بێکاتە. کات بۆ کەس نییە. 'ئەرێ دە ڕێگاکە بەردە، پەلەمە!' جادەکان تەنراوە بە خەڵك، لەم لاو ئەو لاوە هوروژم دەهێنن و ڕاکە ڕاکەیانە، هیچ کەس نازانێت بۆچی.

مەمنونم بەوەی کە هەردوو ژیانەکەم بینیوە ژیانی ئارام و سادە و ژیانی ڕاکەڕاکە. بەڵام ئەگەر لە ئەفریقادا گەورە نەبوومایە، دڵنیا نەدەبووم لەوەی لەزەتم دەبینی لە ژیانێکی ئارام و سادە. منداڵیم لە سۆماڵدا کەسایەتی منی بۆ هەتا هەتایە لە قاڵب داوە و ڕێگای لێگرتم شتێکی سوکی وەك سەرکەوتن و ناوبانگ بە هەند بگرم، کە مێشکی زۆر خەڵکی بەخۆیەوە سەرگەرم کردووە. ناوبەناو پرسیارم لێدەکرێت، 'ئەگەر کەسێك بەناوبانگ بێت، هەست بە چی دەکات؟' - تەنیا پێدەکەنم. ناوبانگ، بە واتای چی دێت؟ هەتا خۆشم نازانم. هەموو ئەوەی دەیزانم ئەوەیە، شێوەی بیرکردنەوەم ئەفریقاییانەیە و ئەمە هەرگیز ناگۆڕێت.

گەورەترین خۆشی ژیان لە ڕۆژئاوادا، بوونی ئاشتییە و بۆ خۆم دڵنیا نییم چەند خەڵك ئاگاداری ئەمەیە، کە چ دەستکەوتێکە. ڕاستە تاوان هەیە، بەڵام ئەمە وەك ئەوە نییە دەور و پشتت مەیدانی جەنگ بێت. زۆر مەمنونی پەناگایەك بووم لێرە

و هەلێك کە بتوانم منداڵەکەم لە ئاسایشدا گەورە بکەم، چونکو سۆماڵ کەوتە جەنگەوە لەپاش ڕووخاندنی سیادبری لە لایەن یاخیبووەکانەوە لە ساڵی 1991وە. لەو ساڵەوە خێڵە ڕەقیبەکان لە شەڕدان بۆ دەستبەسەرا گرتنی وڵات و تاکو ئێستا نازانرێت چەند خەڵك کوژراوە. خانووەکانی شارە جوانەکەی مەقادیشۆ، کە کۆنیالیستەکانی ئیتالیا دروستیان کردووە، ڕووخێندراوە. نزیکەی هەموو دامەزراوەکان، ئاسەواری حەوت ساڵ شەڕی بێوچانیان پێوە دیارە، خانووەکانیش بۆمباران کراون یان بە فیشەك کون کونکراون. هیچ تروسکاییەك لە شێوازی ڕێکخستنی تیادا نەماوە - نە حکومەتێك، نە پۆلیسێك، نە قوتابخانەیەك.

مایەی غەمێکی زۆر بوو، کە خێزانەکەمان لەم جەنگەدا بێزەرەر دەرنەچوون. خاڵە ولدابم، برای دایکم کە زۆر سەرنجڕاکێش بوو، زۆر لە دایکم دەچوو، لە مەقادیشۆدا بەر گوللە کەوت. لە لای پەنجەرەیەکەوە ڕاوەستابوو، کاتێك ماڵەکەی بەر دەسترێژی گوللە دەکەوێت. گوللە بەر تەواوی ماڵەکەی کەوتبوو و فیشەکێکیش لە پەنجەرەکەوە چووبووە ژوورەوە و خاڵمی کوشتبوو.

هەتا خەڵکی کۆچەری بێعارەق دەرنەچوون. کە عەلی برا بچوکەکەمم بینی، زانیم ئەویش بەر گوللە کەوتووە و لە مردن گەڕاوەتەوە. بەتەنیا لەگەڵ حوشترەکانیدا بووبوو، کاتێك جەردە پەلاماری دەدا و فیشەکێك بەر قۆڵی دەکەوێت. عەلی دەکەوێت و خۆی وا پیشان دەدا مردووە، پاشان جەردەکان حوشترەکان دەبەن بۆ خۆیان.

کاتێك لە ئسیوپیادا دایکمم بینی، بۆی گێڕامەوە، کە کەوتۆتە مەیدانی شەڕەوە و گوللەیەك بەر سنگی کەوتووە و هێشتا تیایدا ماوەتەوە. خوشکەکەم دەیبات بۆ خەستەخانە لە عەرەبستانی سعودییە، بەڵام پێیان وتبوو کە تەمەنی زۆرە و لە توانای نەشتەرگەریدا نەماوە. بێگومان نەشتەرگەرییەکە مەترسیداربووە و ئەگەری ئەوە هەبووە کە گیانی لەدەستبدات. کە بینیم، لەوەدەچوو هێشتا وەك حوشتر

بەهێز بێت. دایکم خۆی بوو، وەك جاران بەگوڕ و لە نوکتە وتنی خۆی نەکەوتبوو. لەسەر ئەو فیشەکەی کە بەریکەوتبوو، لێم پرسی، کە هێشتا گوللەکەی تیادا ماوە، دایکم وتی، 'ئا، ئا، لێرەدایە. هیچ گوێی پێنادەم. لەوانەیە ئێستا لە ناو خۆمدا تواندبێتمەوە.'

جەنگی خێڵەکی، وەك كاری خەتەنەکردن وایە، هەردووکیان دیاری دەستی پیاوانی سەرکوتگەر، خۆویست و خۆپەرستن. حەزناکەم وا بڵێم، بەڵام ئیتر ئەوە ڕاستییەکە. هەر دووکیان لە پیاوانێکەوە سەرچاوە دەگرن، کە سەرقاڵی ناوچەی دەسەڵاتی خۆیانن سەروەت و سامانی خۆیانن - ژنانیش لە ڕووی یاسایی و کەلتوورییەوە دەکەونە ئەو خانەیەوە. لەوانەیە ئەگەر ئەندامی نێرینەیان لە بندا دەربهێنین، وڵاتەکەمان ببێت بە بەهشت. ئیتر پیاوان هێور دەبنەوە و گوێیان زیاتر سووك دەبێت بەرامبەر بە جیهان. بە نەمانی هەتا هەتایی ئەم هۆرمۆنە نێرینەیە، نە هەواڵێك لە جەنگ دەبیسترێت، نە کوشتارێك دەکرێت، نە دزییەك ڕوودەدا، نە ژنێك لاقە دەکرێت. وە ئەگەر ئەندامی نێرینەیان ببڕین و بەرەڵایان بکەین بچن بە پێی کاری خۆیانەوە، ئیتر ئەوەی خوێنیان لێدەڕوات تا دەمرن یان گیان بەدەردەبن گرفتی خۆیانە، ئینجا لەوانەیە بۆ یەکەم جار تێبگەن، کە چی بەسەر ژنەکانیان دەهێنن.

ئامانجم یارمەتی دانی ژنانی ئەفریقایە. دەمەوێت بیان بینم، بەهێز دەبن، نەك بێهێز دەبن. بڕینی ئەندامی مێینە، ئاسایی ژنان لە ڕووی فیزیکی و سۆزەوە بێهێز دەکات. لەبەرئەوەی ژنان بڕبڕەی پشتی ئەفریقایە و زۆربەی زۆری کار بەسەر شانی ئەوانەوەیە، حەزدەکەم بیان هێنمە بەرچاوی خۆم، کە ئەگەر قەسابی نەکرێن لە منداڵییەوە و پەکیان نەخەن بۆ باقی ژیانیان، چ توانایەك لە خۆیان نیشان دەدەن.

سەرەڕای تووڕەییم لەسەرئەوەی چیان بەسەرهێناوم، بەڵام گلەیی لە دایك و باوکم ناکەم. دایك و باوکم خۆشدەوێت. دایکم قسەیەکی نەبوو لەسەر خەتەنەکەم،

چونکو وەك ژنێك هیچ دەسەڵاتێکی نییە تا بڕیار بدات. ئاسایی ئەوەی بە منیان کردووە، بەویش و بە دایکی ئەویش و بە دایکی دایکی ئەویشیان کردووە. باوکم تەواو بێئاگایە، کە چ ئازاریك دەچێژم، لەوەی ئەو بەسەری هێناوم. ئەوەی ئەو دەیزانێت ئەوەیە، کە لە کۆمەڵگای سۆماڵدا، ئەگەر بییەوێت کچەکەی شوو بکات، دەبێت خەتەنە بکرێت یان هیچ پیاوێك نایەوێت. دایك و باوکم هەردووکیان قوربانی پەروەردەیەکن، کەلتورێکن کە لە هەزاران ساڵەوە بێگۆڕان ماوەتەوە. بەڵام هەروەك چۆن ئیمڕۆ دەزانین، کە دەتوانین لە نەخۆشی و مردن دوورکەوینەوە بە کوتاندن، ئاوا دەزانین کە ژنان ئاژەڵ نیین، وەفادارییان لە ڕێگای متمانە و خۆشەویستیەوە زۆر زیاتر بەدەست دێت تا لە ڕیگای نەریتی وەحشیگەرییانەوە. کاتی ئەوە هاتووە ئەو جۆرە کۆنە لە ئازارکێشان بخەینە لاوە.

دەزانم خاوەنی لەشێکی تەواو بووم، بەو شێوەیەی کە لە دایکبووم. پاشان پیاو دای بەسەرمدا، هێزی پێنەهێشتم و کفت و کەلەلا جێی هێشتم. ژنێتییان لێدزیم. ئەگەر سروشت بیویستایە ئەو بەشانە بە لەشمەوە نەبووایە، بۆچی بەوانەوە لەدایك دەبووم؟

هیوادارم ڕۆژێك بێت، هیچ ژنێك ئەو ئازارە نەچێژێت و ببێت بە شتێك لە ڕابوردوو. خەڵك بڵێت، 'بیستت، بڕینی ئەندامی مێینە لە سۆماڵ قەدەغەکرا؟' ئینجا وڵاتێکی تر و یەکێکی تر تا جیهان بێمەترسی دەبێت بۆ ژنان. ئەی کە ڕۆژێکی خۆش دەبێت، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خەباتی بۆ دەکەم. ئەگەر ئارەزومان لێبێت، هەر بەدیدێت.